کامیار سابیر



# لینگوا فرانکای کوردیی



## زمانی ستانده‌ردو فه‌رمی

* ناوی کتێب: لینگوا فرانکای کوردی:
زمانی ستاندەرد و فەرمیی

* نووسەر: کامیار سابیر

* ساڵی چاپ: ٢٠٠٩

* چاپ‌و بڵاوکردنەوە: چاپخانەی ڕەنج

* نەخشەساز: فەرەیدون عەزیز بابا

* بەرگ: ئارام عەلی

* تیراژ: ١٠٠٠ دانە

* چاپی: چاپی یەکەم

* نرخ: ٢٠٠٠ دینار

* ژمارەی سپاردن: ژمارە ١٩٠٨ ی ساڵی ٢٠٠٩ ی پێدراوە

## پەیامی ئەم کتێبە

ئـەم کتێبـە، کۆمـەڵـێ وتـار و توێژینــەوەو چاوپێکـەوتنــە لــە ســەر زمــانی ستاندەردی کوردیی و گرفت و کێشە سیاسیی و کولتوورییـەکانی پرۆسێسی بەستاندەردکردنی زمانی کوردیی لەهەرێمی کوردستاندا. ساڵی ٢٠٠٨ساڵێکی پڕ لەهەوڵ و تەقەلای گرنگ بوو لـە بایەخدان بە ستاندەردایزی زمانی کوردیی لەناو جڤاکی کوردییدا، بەشێکی زۆریش لـە رووناکبیران و زمانناسانی کورد، بەشێوازی جۆراوجۆر بەشدارییان لەو هەوڵانەدا کرد. دەیان وتارو توێژینەوەو چاوپێکەوتن لەسـەر پرۆسێسی ستاندەردایزی زمانی کوردیی لەکوردستانی عێراقدا، نووسران و ئەنجامدران.

هاوکـات دەیـان ئـارگیومێنتی جۆراوجـۆر وروووژێنـران. لــە گــەرمــەی ئــەو هەوڵانەدا، کەمپەینی " ستاندەردایزی زمانی کوردیی" بە واژۆی ٥٣ کەس لە رووناکبیران و نووسەرانی کورد هاتە پاڵ هـەوڵـەکانی پێشتر و تـەکانێکی زۆر گرنگیی بە باسەکان و بۆچوونە جیاوازەکان دا. پەیامی کەمپەینەکە راستەوخۆ رووی لـەدەسـەڵاتـی سیاسـیی هــەرێمـی کوردسـتان بـوو، چونکـە زۆرینــەی واژۆکـەرانـی ئـەو کـەمپـەینـە لـەو بڕوایـەدا بـوون کـە سـاغکردنەوەی زمـانی

ستانده‌ردی کوردیی، مه‌سه‌له‌یه‌کی سیاسییه‌و پێویسته له رووی سیاسیی و یاساییه‌وه بڕیار بدرێ که زمانی ستانده‌ردی هه‌رێمی کوردستانی عێراق چییه؟ و چۆن له‌باری سیاسیی و ئیداریی و یاساییه‌وه به‌فه‌رمیی بناسێنرێ؟

کۆکردنه‌وه‌ی ئه‌م نووسین و توێژینه‌وانه، بۆ ئه‌وه‌یه که به‌شێوه‌یه‌کی چاپکراو بکه‌وێته به‌رده‌ستی خوێنه‌ران ، چونکه زۆربه‌ی ئه‌م باسانه له سه‌ره‌تای ساڵی ٢٠٠٨ ەوه له رۆژنامه‌کانی کوردستاندا نووسراون، بۆیه زۆر گرنگه به‌شێوه‌ی ژۆرنالیک، یان کتێبێکی قه‌باره مامناوه‌ندیی بکه‌وێته کتێبخانه‌ی کوردییه‌وه‌و وه‌ک دۆکیومێنتێک بمێنێته‌وه. له دووتوێی ئه‌م کتێبه‌دا، په‌یامی ٥٣ که‌س له‌نووسه‌رانی کوردیش بۆ به‌ستانده‌ردکردنی زمانی کوردیی له‌هه‌رێمی کوردستاندا له‌خۆ ده‌گرێ، که پێشتر به‌شێوه‌یه‌کی به‌ربڵاو بڵاوبووه‌ته‌وه.

**کامیار سابیر**

**سێپتێمبه‌ری ٢٠٠٩**

## سوپاس و پێزانینە

وەک نووسەری ئەم وتارو توێژینەوانەی ناو ئەم کتێبە، سوپاسێکی زۆری چاپخانەی رەنج دەکەم کە ئامادەییان نیشاندا بۆ بەچاپگەیاندنی ئەم نووسینانە. سوپاسی زۆری کاک تاریق فاتیح دەکەم، لەکاتێکدا من لەکوردستانەوە دوورم، ئەو کارئاسانیی بۆ بەچاپگەیاندنی ئەم کتێبە کرد.. هاوکات جێگەی پێزانینە کە شێرزاد حەسەن وەک خەمخۆری بەچاپگەیاندنی ئەم باسانە لە خەمێکی بەردەوامدا بوو. بەهەمان شێوەش زۆر سوپاسی کاک روشدی ئەنوەر (گرافیک دیزاینەر) دەکەم کە بەرگی کتێبەکەی دیزاین کرد.

**کامیار سابیر**

**سێپتێمبەری ٢٠٠٩**

## ئەم کتێبە پێشکەشە

* بەنەتەوەی کورد بەگشتیی وەک گەورەترین نەتەوەی بێ نیشتمان و بێ ولات و بێ زمانێکی ستاندەردی نووسین ( لەڕووی سیاسیی و یاساییەوە).

* بە باوکم و دایکم، وەک قەدەری کوردبوونی من لەڕێی ئەوانەوە، کەوایلێکردم بەشێکی زۆری ژیانم، بۆ ستاندەردایزی زمانی کوردیی تەرخان بکەم.

* بە تەنها جگەرگۆشەکانم " ئارا و کارا" ی دووانە، کەبەداخەوە، بەهۆی دووربوونیان لەکوردستانەوە، لەهەنووکەدا نازانن کوردیی بنووسن و بخوێننەوە. بەهیوای ئەوەی لە داهاتوودا فێری نووسین و خوێندنەوە بە زمانی زگماکیی خۆیان ببن.

* بە مەسعود محەمەد، وەک ناسراوترین ئایکۆنی زمانەوانیی لەناو کورددا.

## بابەتەکانی ئەم کتێبە

١. پەیامی کۆمەڵێک نووسەر و ئەدیب و ئەکادیمیستی کورد بابەت/ ستاندەردایزی زمانی کوردیی

٢. لینگوا فرانکای کوردیی: زمانی ستاندەرد و فەرمیی

٣. گفتوگۆیەکی بەرکوڵ، لەگەڵ بەڕێز د.ئەمیری حەسەنپوووردا لەسەر "ستاندەردایزی زمانی کوردیی

٤. نەتەودو زمانی کوردیی: دایگلۆسیا یان جووتستاندەرد!

٥. بەڕوخسەتی مەزنترین زمانناسی کورد، مەسعود محەمەد: بۆ پڕۆ- دووستاندەردەکانی زمانی کوردیی لە هەر کوێیەک بن

٦. فاشیزمی نیۆ-عەشیرەتچییەتیی، بۆ کوێ کورد دەرەتێنی؟

٧. دایەلێکتە ناوچەییەکان: شێرپەنجەی زمانی ستاندەردی کوردیین

٨. کوردستانی باشوور یان باشووری کوردستان: هەڵەیەکی سیاسیی کوێرانە

٩. ئێستێتیکی زمانی کوردیی: فیاسکۆی بەکارهێنانەکانی

( ١ )

## (( پەیامی کۆمەڵێك نووسەرو ئەدیب و ئەکادیمیستی کورد بابەت/ ستاندەرایزی زمانی کوردیی ))

**بەڕێز سەرۆکی هەرێمی کوردستان**
**بەڕێزان سەرۆک و ئەندامانی پارلەمانی کوردستان**
**بەڕێزان سەرۆک و ئەندامانی ئەنجوومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان**
**بەڕێزان وەزیرانی پەروەردە، خوێندنی باڵاو ڕۆشنبیریی**
**بەڕێزان ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی ی. ن. ک، پ. د. ک، یەکگرتووی ئیسلامیی و حیزبە کوردستانییەکان**

## پەیامی کۆمەڵێك نووسەرو ئەدیب و ئەکادیمیستی کورد
## بابەت/ ستاندەرایزی زمانی کوردی

هەنووکە، بەهەموو پێودرە دیرۆکیی و ڕۆشنبیریی و دیمۆگرافییەکان، شێوەزاری کرمانجیی ناوەڕاست بووەتە زمانی ڕۆشنبیریی و پەروەردەیی لە هەرسێ پارێزگا گەورەکەی هەرێمی کوردستان (هەولێر، کەرکوک و سلێمانی)، جگە لەوەی بووەتە زمانی هەڤپەیڤینی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی لەنێوان پایتەخت و هەموو هەرێمدا، بە دەڤەری بادینان و پارێزگای دهۆکیشەوە. شێوەزاری کرمانجیی ناوەڕاست چیتر لەهجەیەکی لۆکاڵ و میللیی نییە، بەڵکوو زمانی هەزاران کتێب و سەدان ڕۆژنامەیەو بازاڕێکی گەورەی کتێب و خوێندنەوەی لە کوردستاندا دروستکردووەو خەریکە دەبێتە زمانی فیکرو بیرکردنەوە لە بواری فەلسەفەو زانستە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکاندا و هەزاران زاراوەی زانستیی و مرۆیی تێرژاوە. هەروەها، بەحوکمی واقیعی دیرۆکیی، جیۆگرافیی، سیاسیی و ڕۆشنبیریی، کرمانجیی ناوەڕاست بووەتە ئەلقەی پەیوەندیی نێوان کرمانجیی ژووروو و کرمانجیی خواروو بەهەموو شێوەزارە جیاوازەکانیانەوە.

سەربارى کۆششی ڕژێمی پێشووی بەغداد بۆ پەرتکردنی کورد لەڕێگەی لەتکردنی زمانەکەیەوە، هەروەها سەرباری کارکردن لەسەر هەمان گوتاری شۆڤێنیی لەلایەن هەندێ لە ڕەگەزپەرستە عەرەب و تورکەکانەوە، کە پێیانوایە کورد توانای یەکخستنی ئیرادەی سیاسیی و ستانداردکردنی زمانی خۆی نییە،

بەلام تا ئیستا ئیرادەی کورد، پابەندبوونی خۆی بەو شیوەزارەی زمانەکەیەوە پاراستووەو سەلماندووە.

ئەلبەتە لەم بارەیەوە هەمووان، بە رۆشنبیرو سیاسیی و پەروەردەکارانەوە، بەرپرسیارییەتی گەورەمان لەسەر شانە، بەلام بەرپرسیارییەتی میژوویی لەسەر شانی سیاسییەکان و دەزگا سەروەرییە بالاکانی هەریمە (وەک سەرۆکایەتی هەریم، پارلەمان و ئەنجوومەنی وەزیران) کە پیویستە لەئاست هەستیاریی قۆناغەکەدا بن و ئەو حوکمی دیفاکتۆیە بۆ بریاری سیاسیی، تەرجەمە بکەن. چونکە میژوو پیماندەلی بریارە چارەنووسسازەکان پیویستی بە سیاسەتمەداری دووربین و خاوەن هەستی دیرۆکیی و نیشتمانییە.

بەفەرمیی ناسینی شیوەزاری کارپیکراوی هەنووکەیی لە هەریمی کورستاندا مانای ئەوە ناگەیەنی کە شیوەزارەکانی تر، بەتایبەتیی کرمانجیی ژووروو، هەورامانیی و لوریی و....تاد، بایەخیان پینەدری، بەلکوو بەپیچەوانەوە پیویستە هاوکات بەشی زانکۆیی و پەیمانگای نیشتمانیی تایبەت بە لیکۆلینەوەی چروپری هەموو شیوەزارەکانی زمانی کوردیی دابمەزریندری، بەمەبەستی دەولەمەندکردن و موتوربەکردنی ئەو شیوەزارەی کە ئومید دەکەین لەم قۆناغەدا بە فەرمیی بناسری. چونکە وەنەبی زمانی کارپیکراوی ئیستا زمانیکی ئایدیال و بی کیماسیی بیت و پیویستیی بەدەولەمەندکردن و گەشەپیدان نەبیت، بەلکوو مەبەستمانە تەنها لەرووی گرامەرو رینووس و بەکارهینانی گشتییەوە بەفەرمیی بناسری، دەنا لەرووی وشەسازیی و زارەوەسازییەوە پیویستە زمانیکی کراوە بی بەسەر هەموو شیوەزارەکاندا. زانستی زمانناسییش پیماندەلی زمان بوونەوەریکی میژوویییەو رۆژ بەرۆژو سال لەدوای سال گەشە دەکات، تا ژمارەی هاوواتاکانیش (مرادفات- synonyms ) لە زماندا زۆرتربن مانای دەولەمەندیی ئەو زمانە دەگەیەنی، نەک پەرتبوون و لیکدابران. زمانی کوردییش پیویستیی بەهەموو شیوەزارەکانی خۆی هەیەو هیچیانی لی زیاد نییە.

ئەو زمانەی کە مەبەستمانە بەفەرمیی بناسری هەمان ئەو زمانەیە کە زانای خوالیخۆشبوو (توفیق وەهبی بەگ) رینووسی بۆ داناوە، زمانی یەکەمین حکومەتی کوردیی، حکومەتەکەی شیخ مەحمود و کۆماری مەهاباد بوو، پاشان سالی ١٩٥٩ لە کۆنفرانسی گشتیی مامۆستایان لە شەقلاوە جەخت لەسەر بەفەرمیی ناسینی کراوەتەوە، دواتر سەرکردەی خوالیخۆشبوو بارزانیی یەکەم و پارتیی دیموکراتی کوردستان لەدوای ریکەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠وە پشتگیریی ئەو هەنگاوەیان کردووە، بەتایبەتیی لەبواری پەروەردەدا. هەربۆیە

هەنگاویکی نیشتمانیی و دۆزیکی چارەنووسسازە کە دەسەلاتی کوردیی ئەو پیشینە میژوویی و کولتووریی و سیاسییە بە فەرمیی زیندوو بکاتەودو بیکاتە بریاری سیاسیی.

هیچ دەسەلاتیکی سیاسیی، هەرچەند خاوەن هیزو زەبر بێ ، ناتوانی بەزۆر زمانیک دابتاشێ یان بەزۆر زمانیک لەناوبەریت، بەلکوو دەتوانێ ئەو زمانەی، کە حوکمی واقیع دروستی کردووە، بە فەرمیی بناسینێ و گەشەی پیبدا. پاشان زمان خۆبەخۆ، بەشیوازیکی سروشتیی، بە وشەو فریزی شیودزارەکانی تر، دەولەمەندتر دەبێ . بۆ ئەو مەبەستە هەندیجار دەسەلاتی سیاسیی پەنا دەبا بۆ ژیدەرە پیرۆزەکان و کتیبە ئایینییەکان، وەک لە ستاندەردایزی هەردوو زمانی عەرەبیی و عیبرییدا، بەپشتبەستن بە زمانی قورئان و زمانی تەورات، پەنای بۆ برا. هەندیجاریش دەسەلاتی سیاسیی پەنادەبا بۆ ژیدەرە کولتوورییەکان، وەک لە ستاندەردایزی هەردوو زمانی فارسیی و تورکییدا پەنای بۆ برا، کاتێ زمانی باوی ئەدەبیی لە شارە گەورەکانی وەک شیرازو تاران و ئیستەنبولدا بە فەرمیی بریاریان لەسەر درا. یاخود لە ولاتی فرانسە زمانی ئەدەبیی پاریس، لە ئیتالیا زمانی کولتووریی فلۆرینس و لە زمانی چاپنییدا شیوەزاری بەیجین کران بە بناغەی زمانی ستاندەردو لەرووی سیاسییەوە بەفەرمیی ناسران .

سە بارەت بە ستاندەرایزی زمانی کوردیی، ئیمە وەک کۆمەلیک نووسەرو ئەدیب و ئەکادیمیست و رۆژنامەنووسی کورد، پیمانوایە و باشتر وایە دەسەلاتی سیاسیی لە هەریمی کوردستان، سوود لە ئەزموونی دووەم وەربگرێ، واتە بەلەبەرچاوگرتنی ژیدەری کولتووریی لە هەرسێ پاریزگا گەورەکەی هەریمی کوردستان لە کۆی چوار پاریزگاداو بە لەبەرچاوگرتنی ئەو کتیبخانە گەورەیەی کە لە سەردەمی میرنشینی بابانەوە شاکاری ئەدەبیی و کولتووریی و رۆژنامەوانیی و وەرگیرانی جۆراوجۆری تیدەرژێ. تا هەنووکەش، لە سەردەمی بەپایتەختبوونی هەولیردا، لە دەولەمەندبوون و گەورەبوون و گەشەکردنی بەردەوامدایە .

ئاشکرایە لە دۆخی نەتەوەیی ئیمەدا یەکیک لە هۆکارەکانی پارچەپارچەبوونی نەتەوەیی، یەکیک لەلاوازییەکانی گوتارو بونیادی ناسیۆنالیستی کوردیی، نەبوونی زمانیکی ستاندەردە کە ببیتە زمانحالی رەمزیی قەوارەی کوردیی، چونکە قەوارەی نەتەوەیی تەنها بەدامودەزگاو بالەخانەو لەشکر دروست نابێ و نایەتە پاراستن، بەلکوو بەقوتابخانەو چاپخانەو زمانی هاوبەشیش دیتە بوون.

ئەوەی مرۆڤ لە بوونەوەریکی سادەوە دەکاتە ئەندامیکی پابەندی نەتەوەکەی، ئەو خەیاڵ و پەیوەستبوونە سیمبۆلییەیە کە لەناو زماندا دروست دەبێ.

**بۆیە پێشنیار دەکەین:**

یەکەم: بەیاسایەک بڕیاربدرێ لەسەر بەفەرمیی ناسینی شیوەزاری کرمانجیی ناوەڕاست، وەک بەردی بناغەی زمانی ستاندەردی خویندن و مامەڵەی نیوان دەزگا حکومییەکان. هاوکات، بەگوێرەی هەمان بڕیار، دەکرێ قوتابیی و خوێندکار پابەندبکرێن کە لە پرۆگرامی (زمانی کوردیی)دا ئاشنایەتیی تەواو لەگەڵ هەموو شیوەزارەکانی تری زمانەکەیاندا پەیدا بکەن، لەپێناو زەمینەخۆشکردن بۆ ئەوەی شیوەزارە جیاوازەکان لەیەکتریی نزیکتر بکرێنەوە.

دووەم: بەیاسایەکی هاوپێچ (مرفق) بڕیاربدرێ لەسەر دامەزراندنی پەیمانگایەکی نەتەوەیی ( یاخود زانکۆ و دامەزراوە زانستییەکان راسپێردرێن ) بۆ لێکۆڵینەوەو ساغکردنەوەو ئارشیفکردنی هەموو شیوەزارەکانی زمانی کوردیی و پێشکەشکردنی پێشنیاری بەردەوام، بۆ موتوربەکردنی زمانی فەرمیی بە وشەو فرێزو زاراوەی هەموو شیوەزارەکانی تر.

لە کۆتاییدا هیواداریین لە دڵسۆزییمان بگەن و ئەم خەمە بە هێند وەربگرن...
لەگەڵ ڕێزماندا...

٢٠٠٨/٤/١٥

**١-ئارام کاکەی فەلاح**
**٢-ئارام رەفعەت**
**٣-ئارێز سمکۆ حوسێن**
**٤-ئازاد بەرزنجی**
**٥-ئازاد سوبحی**
**٦-ئاسۆس هەردی**
**٧-ئەحمەد میرە**

٨-د. ئەلبێرت عیسا
٩-د. ئەنوەر قادر جاف
١٠-ئەنوەری رەشی عەولا
١١-بەختیار عەلی
١٢-بەختیار کەریم
١٣-تابان کەمال عەلی
١٤-تاریق فاتیح
١٥-جەمال عەبدول
١٦-چۆمان هەردی
١٧-حوسێن عارف
١٨-دارای مەحامی
١٩-دانا رەووف
٢٠-دڵشاد حەمە
٢١-رابەر فایەق
٢٢-د. رەفیق سابیر
٢٣-رەووف بێگەرد
٢٤-رێبوار سیوەیلی
٢٥-رێبین ئەحمەد هەردی
٢٦-د. رێنوار رێبین(د. پشتیوان عەبدولا)
٢٧-سەربەست رەسووڵ
٢٨-سەلاح ئەحمەد
٢٩-د. شاهۆ سەعید
٣٠-شوان ئەحمەد
٣١-شێرزاد حەسەن
٣٢-شێرکۆ بێکەس
٣٣-شێرکۆ کرمانج

٣٤-عەبد عارف

٣٥-عەتا محەمەد

٣٦-عەدنان عوسمان

٣٧-د. فەرەیدون عەبدول بەرزنجی

٣٨-فەتاح زاخۆیی

٣٩-د. فوئاد حەمە خورشید

٤٠-کاروان کاکە سوور

٤١-کامیار سابیر ( خەتاب سابیر)

٤٢-د. کەمال میراودەلی

٤٣-گۆران عەبدوڵا

٤٤-محەمەد حەمە باقی

٤٥-محەمەد قادر یونس

٤٦-د. محەمەد کەمال

٤٧-د.محەمەد رەووف سەعید

٤٨-مەریوان وریا قانیع

٤٩-نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

٥٠-هەندرێن

٥١-هەڵکەوت عەبدوڵا

٥٢-د. هۆگر مەحمود فەرەج

٥٣-هیوا قادر

## ڕوونکردنەوەی چەند خاڵێک لەسەر ئەم کەمپەینە

١- ئەم کەمپەینی ستاندەردایزی زمانی کوردییە، دەیان نووسەرو ئەکادیمیست و پسپۆری زمانەوانیی کاریان تێدا کردووەو شێوازی داڕشتنەکەی و ڕێنووسەکەیشی، کاریگەری هەرەوەزییە. یەکێک لەو ڕەخنانەی لەلایەن هەندێ لەوانەی لایەنگریی چەند ستاندەردیی و جووتستاندەردیی دەکەن، دەیانگوت پرۆسێسی ستاندەردایزەیشن standardization پێویستە وەک خۆی بنووسرێتەوە. مەبەستیان ئەوەبوو کە ستاندەرایز دروست نییە، بەڵکو ستاندەردایز دروستە. لەڕاستییدا ئەمە ڕەخنەیەکی زۆر ڕەشۆکییە. چونکە لە زمانی کوردییدا زۆرجار دەنگێ یان تیپێک "پیتێک" دەکەوێتە بنەوە یان باش دەرناکەوێ تا بنووسرێ . بۆ نموونە لە کوردستان ڕۆژنامەی "ستاندەر" هەیە، واتا بەبێ " د" ەکە دەینووسن. کرمانجیی ژووروو وشەی ستاندەرد بە 'ستاندەر" دەنووسن. دەیان ئەکادیمیست و نووسەری بەتواناش لەبری ئەوەی ستاندەرد" ستاندارد" بنووسن، بەبێ "د" ەکە ستاندەر"ستاندار" دەنووسن. سەردێڕی ئەم کەمپەینەش " ستاندەرایزی زمانی کوردیی" ، بەهەمان شێواز لە ڕێنووس و خوێندنەوەشدا لە ستاندەردایز خۆشتر و گونجاوترە. هاوکات دەتوانرێ بگوترێ ئەم جۆرە کورتکردنەوە تێرمۆنۆلۆجییانە لەزۆربەی زمانەکاندا بوونیان هەیە. تەنانەت لەزمانی فارسییدا وشەی Standard بە استاندارد دەنووسرێ، نووسەرو ئەکادیمیستێکی فارس نایات بڵێ استاندارد هەڵەیەو ئەلفێکی زیاد لەسەرەتای وشەکەدا دانراوە.

٢- لە ڕەخنەیەکی تردا، ئەو زمانناسە کوردانەی ڕەخنەکانیان بۆ دژایەتییکردنی کەمپەینی ستاندەردایزی زمانی کوردیی چڕکردبووەوە، دەیانگوت ستاندەرایزکردن بەواتای " ستاندەردکردن کردن" دێت. ئەمە ئەو مێنتاڵە خۆدزەرەوەیە، کە دەڵێ پرسی زمانی ستاندەرد پرسی تەنها

زماناسەکان و رستەسازەکانە! بەلام لە تەواوی مۆبەلایزە سیاسیی و کولتوورییەکان دایدەمالن و دووری دەخەنەوە. لەکاتێکدا لەزمانی کوردییدا دوور جۆر جەختکردنەوە هەیە ، لەسەرەتاو کۆتاییی وشەکە یان دەربڕینەکەدا ئەم جەختکردنەوانە بوونیان هەیە. بۆ نموونە ستاندەرایزکردن کە دوو تێرمی ئینگلیزیی و کوردییە بەواتای پرۆسێسی " بەستاندەردکردن" دێت، "نەک ستاندەردکردن کردن". بۆیە ستاندەرایزکردن رێکورەوان بەواتای "بەستاندەردکردن" دێت.

٣- ژمارەی ئەو کەسانەی کەواژۆیان کرد، ٥٣ کەس بوون، ئەوەندەی من ئاگام لێ بێت، دەیان کەسی تر دواتر حەزیان دەکرد ناویان بخرێتە لیستەکەوە، بەلام دوای ئەوەی بلاو بووەوە ئیتر ناوی کەسیتر بۆ سەر لیستەکە زیاد نەکرا. هاوکات، دەیان و سەدان ئەکادیمست و نووسەری تریش هەبوون، نەتوانرا لەکاتی خۆیدا بیانگاتێ. کەواتە مەسەلە ژمارەی کەسەکان نییە، بەلکو مەبەست ناوەڕۆکی بابەتەکە بوو کە گرنگی هەبوو. هاوکات کەسێک بەناوی سەلاح ئەحمەد کە ریزبەندیی ناوەکەی ژمارە ٢٨ ە ، لە واژۆکەی خۆی پەشیمانبووەوە، ئەوەش بۆ باکگراوندی سیاسیی و ئایدیۆلۆژیی ئەو دەگەڕێتەوە، دیارە بە درێژیی باسی ئەو راگۆڕینەی ئەو برادەرەم لە وتاری "فاشیزمی نیۆ-عەشیرەتچییەتیی، بۆ کوێ کورد دەڕەتێنێ " کە لە دووتوێی ئەم کتێبەدایە باسم کردووە.

( ٢ )

## ((لینگوا فرانکای کوردیی: زمانی ستاندەرد و تەوریی))


**ئەبستراکت:**

ئەم توێژینەوەیە زۆر بەوردیی دەچێتە سەر کۆمەڵێ بۆچوونی کوشندە، کەدەرگیری جێکەوتکردنی زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردیی، یان دروستتر و کەمئاریشەتر زمانی ستاندەردی کوردیی بوون. هەروەها لەو لایەن و داتا جیاوازانەش دەکۆڵێتەوە کە سیمانتیک (واتاسازیی –semantic) و سینتاکتیکی(رستەسازیی-syntactic) ئەم زمانە لەمەڕ بەکارهێنانە جۆراوجۆرەکانیدا دووچاری کۆمەڵی گرێ و گۆڵ بووەتەوە. لە جەرگەی باسەکەدا هەوڵ دەدرێ قامک بخرێتە سەر پێشگیرییە سیاسیی و کولتووریی و زمانەوانییەکانی ئەم رەهەندە، هەروەها ئاماژە بە چوارچێوەی ئەو پلان وکینەو قاچکێشانەوانە دەدرێ کە لەناو هەندێ نووسەرو رۆشنبیرانی سەبدایەلێکتەکانی تردا دەرهەق بە زمانی ستاندەردی کوردیی(کرمانجیی ناوەڕاست) هەیە، سەرجەم ئەم باسانە بە ئارگیومێنتەوە پاڵپشتیی دەکرێن. لەکۆتاییشدا توێژینەوەکە بە پێشنیارو پێداویستیی سیاسیی و کولتووریی و رۆشنبیرییەوە بۆ دەسەڵاتی سیاسیی کورد و خەمخۆرانی زمانی کوردیی، ئەم دۆسییەیە بەکراوەیی دەهێڵێتەوە.

## پێشەکیی(Introduction):

لینگوا- فرانکا( Lingua-Franca) وەک زمانێکی کۆمۆن ، زمانێکی باو و بالادەست ، زمانێکی ستاندەرد کە کۆمەڵی گەل، نەتەوە یان دایەلێکت و ناوچە بەکاری دەهێنن تەوەرەی سەرەکیی ئەم باسەیە. هەڵبژاردنی تێرمی لینگوا فرانکا بۆ ئەم توێژینەوەیە، پێوەندیی راستەوخۆی بە گرنگیی ستاندەردبوون و ستاندەردایزی standardize زمانی کوردییەوە هەیە. لینگوا فرانکا ' Frankish Language'، تێکەڵەیەکە لە زمانێکی چێکراو، بۆ پێوەندیی ئەو نەتەوەو جڤاکانە بەکار دەهێنرێ کە زمانێکی کۆمۆنیان نییە، یان کۆمەڵی دایەلێکتی ئەوەندە دووریان هەیە، پێویستیان بە زمانێکی ستاندەردە کە کۆیان بکاتەوە.

زۆر بەمەبەستەوە لێرەدا لینگوا فرانکا، بۆ زمانی ستاندەردی کوردیی بەکارهاتووە. ئێستا ئینگلیزیی خۆبەخۆ بە زمانی لینگوا فرانکای هەموو ئەورووپا و بگرە تەواوی جیهان بووە. سەردەمانێک، بەتایبەت لە بواری دیپلۆماسییدا، زمانی فرانسیی ئەم رۆڵەی دەبینی. لینگوا فرانکا وەک فۆرماتێک لە زمان، بوونی خۆی بە سروشتیی دەسەپێنێ و دەبێتە زمانی دامودەسگاو پرۆژەکانی کۆمەڵگە. لە هەلومەرجی ئێستای کوردستاندا، فۆرماتی کرمانجیی ناوەراست، تاکە لینگوا فرانکای زمانی کوردیی خۆی دەنوێنێ و ئەم توێژینەوەیە بە وردیی لێی دەکۆڵێتەوە. توێژینەوەک بە شێوازی گەیاندنی conductive بۆچوونە جیاوازەکان بەیەکترو پێکەوە بەراوردکردنیان دەبێ. هاوکات شێوازی هاندانی لۆژیکییانە inductive بۆ پڕکردنەوەی کەلێنی ئارگیۆمێنتەکان پێڕۆ دەکات.

## باسەکە بەسەر دوو بەشی سەرەکییدا دابەش دەکرێ.

١- تێگەیشتن لە بەکارهێنانی زمان بەگشتیی و زمانی ستاندەردی کوردیی بەتایبەتیی وەک بڕبڕەی پشتی ئەم باسە، هەروەها شێواندنی زمان و خۆلادان و خۆدزینەوە لە وردەکارییەکان و ڕێساکانی زمان و ستراکتۆری پتەوی زمان، لەئەنجامی بەدتێگەیشتن و خۆماندوونەکردندا، بەبیانووی ئەوەی ئەمجۆرە باسانە ڕەخنەی بێ بەهرە و بێکەڵکن.

٢- لەمپەردانان و بیانوو هێنانەوە بۆ بنکۆڵکردنی زمانی ستاندەردی نووسین لەلایەن هەندێ کەس و ناوچەو دایەلێکتەوە کە جگە لە ڕەگەزپەرستیی و ناوچەگەرییەتیی و خۆخۆریی، هیچ ناوێکی تر پێناسەی ئەدگار( feature ) و ئاکاری ئەو بۆچوونانەیان ناکات. ئەم خاڵە کرۆکی ئەم توێژیەوەیە دەبێت و زۆربەی ئارگیومێنتەکان جەخت لەسەر پێداویستیی زمانی ستاندەرد دەکەنەوە و لایەنە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی ئەم ستاندەردایزە شرۆڤە دەکات.

ئـــەو تێرمۆنۆلۆجییانـــەی لـــەم توێژینـــەوەیـــەدا بـــەکـــارهێنراون، لـــە فەنۆلەجی(phonology )ی ئینگلیزییەوە وەرگیراون، واتە کەمتر کورداندنی زاراوە زانستییەکانی تێدایەو پتر زاراوە و تێرمەکان بە فەنۆڵەجی ئینگلیزیی دانراونـــەتـــەوە. نـــاوەڕۆک و پـــەیـــامی ئـــەم نووســـینەش ئـــەوەیـــە، کـــە نـــاکرێ لەسەردەمی گلۆباڵیزەیشندا لەسەر کێشەیەکی وەک زمانی ستاندەردی کوردیی شرۆڤەو شیکاریی بکەین، بەڵام بە بیستنی چوار تێرمی بیانیی ( پتر مەبەست لە ئینگلیزییە) تەقەی سەرمان بێت. ناکرێ لەم سەردەمەدا،خۆت بەزمانەوان و زمانزان و پسپۆری زمانەوانیی بزانیت و باس لە لینگوا فرانکای کوردیی بکەیت ، کەچیی لەکوردییش بترازێ زمانێکی تر نەزانیت.

ئەم پاشاگەردانییەی زمانی کوردیی و ستاندەردی نووسین لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا دەرگیری بووە ، بیرمان بەلای ئەوەدا دەبات، ئەو تەکنیککەلەی ئەم دەسەڵاتە لەمەڕ زماندا بەکاری دەهێنێ و هەر شارەو لە ئاوازێک دەخوێنێ، هەر دەڤەرەو سیستمێکی خوێندنی تێدایەو هەر ناوچەیەو

لەخەمی دەستپێوەگرتنی دایەلێکتە لۆکالییەکەی خۆیدایە، بە پێچەوانەی ئەرکەکانی ئەو تێرمە بچوێنین کە "بایۆ-دەسەڵات bio-power"ەکەی فوکۆ لەخۆی دەگرت. دیارە فوکۆ مەبەستی لە تەکنەلۆژیای دەسەڵات بوو لە کۆمەڵگە رۆژئاواییەکاندا کە سەرئەنجام لە کۆمەڵی تەکنیکی هەمەچەشنەوە دەکرایە یەک تەکنەلۆژیای پێڕۆکراو( Foccault,1980 ). ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، بە یەک ستایل و یەک تەکنیک و یەک ئامانجی دوورو ئەجێندایەکی هاوبەش و نیشتمانییەوە، هەموو تاکێکی کورد لە زمانی ستاندەردی کوردیی وردبێتەوە.

زۆر کەس هەن لە کوردستان و لەهەندەران، هیچ گرنگییەک بە ستایلی نووسین و ستراکتۆری زمانەوانیی نادەن. بەشێک لە پۆستمۆدێرنەکانی کوردستان، بە ئەندێشەو بیری دێریداوە، لەنووسین دەڕوانن و گوێ بەهیچ ئەجێندایەکی زمانەوانیی نادەن لەنووسینەکانیاندا، چۆن دێریدا پێی وابوو" لەناو قەفی زنجیری پاشکۆیی و( هەڵەژ) دا، سەخت بوو نووسین و دەستپەڕ onanism لێک جیابکرێتەوە"( Derrida 1976,p.65)، لێرەدا دەستپەڕ بەواتای پراکتیککردن و راهاتن لەسەر شتێک، بۆیە دواتر، دێریدا بیرۆکەی ئەوەی داهێنا که هیچ شتێک لەودیو دەقەوە خۆی نابینێتەوە. بەهەمان میتۆدی بیرکردنەوەی دێریداوە، زۆرێک لە پۆستمۆدێرنەکانی کوردستان کەمترین بایەخ بە تەکنیکی زمان و داتاکانی زمان دەدەن.

ئەوانەی گرنگیی بەزمان نادەن لەناو کورددا، بەسەر کاتەگۆریی جیاواز جیاوازدا دابەش دەکرێن، گرنگترینیان لە پۆستمۆدێرنەکان و سکۆلارە تەوەزەلەکان و گرووپە ئایدیۆلۆژییەکاندا دەبینرێنەوە. ئەوە لەوە بگەڕێین چەندین لەشکری نووسەرو شاعیر و ژۆرناڵیستمان هەیە، کە هەرکەسەو لە ئاوازێک دەخوێنێ و بەئارەزووی خۆیان دەنووسن. ئەوانەی لە هەنووکەدا قورساییان لە ئەدەبی کوردییدا هەیە ، دەکرێ بە پۆستمۆدێرنەکان و نووسەرانی بواری تیۆریی و کولتووریی و زانستە مرۆییەکان ، دەستنیشان بکرێن. بەشێکی زۆر لەمانە، وەک بۆچوونەکەی شاعیری سکۆتلەندیی Robert L Stevenson پێیانوایە" سەختیی ئەدەب لە نووسینیدا نییە، بەڵکو لەوەدایە مەبەست چۆن دەپێکی".

ئەمانە ئەگەر بێتە سەر دۆزینەوەی بڕوبیانوو، بۆ ئەو پاشاگەردانیی و بێدەربەستییەی لە تێکستەکانیاندا هەیە، بەسەدان کۆوتەیشنی زانایانی بوارە

جیاوازەکان دەهێننەوە بۆ سەلماندنی بۆچوونەکانیان، لەگەڵ شەکسپیردا هاوڕان، کاتێ لە هاملێتدا دەڵێ: وشەکانم بۆ سەرەوە دەفڕن، بیرەکانم لەژێرەوە دەمێننەوە، وشە بەبێ بیر، هەرگیز بەهەشتی نابێ (SHAKASPEARE in Hamlet, Act3,Scene 3). واتە ئەم جۆرە نووسەرانە، دەیانەوێ گرنگیی بە هزر بدەن و دایەلۆگی تیۆریی بکەن، بەڵام زانستی زمان لەپێ دەکەن و ئەتکی دەکەن. بۆ یەک ساتیش ئەو راستییە ناپەژرێنن، کە میکانیزمی دەربڕینی هەموو زانستەکان، هەر زمانە. ئەوە بەدەر لەوەی زانستی زمان، لای کورد، بەشێوەیەکی سووک و خاکسار سەیر دەکرێ، ئەگینا زانستێکە بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتیی ئارگیومێنتی زۆر گرنگی لەسەر کراوە.

ئەریستۆفانیسAristophanes، پتر لە دوو هەزارو چوارسەد ساڵ لەمەوبەر دەڵێ: بیری کەڵەگەت، پێویستە زمانی کەڵەگەتی هەبێت: کوا ئەو زمانە کەڵەگەتەی بیری (کورد)ی پێ نووسراوەتەوە یان دەنووسرێتەوە. ناکرێ بڵێی کورد شاکارنووسی نییە، بەڵام تەنانەت ئەگەر زۆرێک لەم شاکارانە، بۆ زمانێکی وەک ئینگلیزیی وەربگێڕدرێن، ئەگەر وەرگێڕ زمانی نووسین و ستراکتۆری نووسینەکان دانەڕێژێتەوەو رۆڵی زمانناسێکی باش نەگێڕێ، دەبێ لەهەر پارەگرافێکدا لای کەم چوار جار the ی ناپێویست لاببرێ و لە چوار شوێنی تر دابنرێتەوە. چوار جار was و were یان بۆ چاکبکەیتەوە، ( ing و ed) یان لەرستەکاندا بۆ جێگۆڕکێ بکەی، ئەوە لەستراکتۆری داڕشتنەکەی بگەڕێ کە بڕیارە گیانی نووسینەکە بێت.

کەواتە ئەم نووسەرو شاکارنووسانە، چاوەڕوانی هیچیان لێناکرێ لەڕووی زانستی زمانەوە خزمەتێک بکەن. چونکە بەداخەوە خۆیان کوڵەوارن لەزماندا و کۆرسی فێربوونی زمانی زگماکیان دەوێت. کاتێکیش دەیانەوێ لەڕووی تیۆرییەوە لەزمان رامێنن، کێماسیی ئەوەیان هەیە زمان نازانن، بەڵام بۆ پڕکردنەوەی ئەم کەلێنەیان، دەیانەوێ لەدیدی زانستە مرۆییەکانەوە خۆیان بە زمانناس بناسێنن. ئەگەر نووسەرێک بەزمانی زگماکی خۆی نەتوانێ ستراکتۆری تێکستەکانی بەهێز بکات، ئەستەمە بەهیچ زمانێکی تر بتوانێ. ئەمەش باشترین پێوانەیە، ئەگەر نووسەرێک بەزمانی زگماکی خۆی، توانای

نووسینی نەبوو، کاتی خۆی بەفیڕۆ دەدات، ئەگەر بیەوێ بەهەمان ستایلی پووت بەزمانێکی بیانیی بنووسێ.

بەشێکی دیار لەو کتێب و شاکارە دەگمەنانەی کورد هەیەتی، بەتایبەت لەدوای راپەڕینەوە، ئەگەر چۆن بەکوردییەکی کەچ نووسراون، بەهەمان شێوەش بکرێن بەزمانێکی گرنگی بیانیی و ببرێن یان بنێردرێن بۆ چاپخانە و لەگەڵ ستافی دەسگای پەخشکردنەکەدا بۆ بڵاوبوونەوە، گفتوگۆ لەسەریان بکرێ. پێش هەموو شتێ ستافی بەڕێوەبەرانی نووسین editors ی دەسگاکە، پێت رادەگەیەنن و دەڵێن لالۆ گیان ئەم شەرەپشیلەیە چاک بکە، ئەوە هەرچییەک بێت نووسین نییە، ئەوە گیان و ستایلی نووسینی تێدا نییە. لەباشترین دۆخیشدا پێت دەڵێن ئەگەر ئەم زمانە زمانی زگماکت نییە، زۆر گرنگ نییە، بەلام برۆ لای (editor) یەکی پرۆفێشناڵی زمانزگماک ئێدیتی بکەو ئەوسا قسەیەکی لێ دەکەین.

هەر ئەم دەردی زمان نەزانینەشە کە کورد وەک نەتەوە، لەچاو قەوارەی خۆیدا، کەمترین تێکستی بەزمانە گرنگەکانی جیهان هەیە. چونکە نووسەرەکانی ناوێرن بە زمانە رۆژئاواییەکان بنووسن، لەکاتێکدا زۆریشیان دەیزانن، چونکە دەزانن دەبن بە چ گاڵتەجارییەک، ئەگەر ئێدیتی نەکەن. بەلام ئەم جۆرە نووسەرانە و هەموو ئەو خۆڕادانەی بەسەر خوێنەری کورددا دەیکەن و رۆشنبیریی دەستی سێ و چواریان بەسەردا ساغدەکەنەوە، ئەگەر بەو زمانە گۆجەوە بەسەر خوێنەری ئەوروپایی و رۆژئاواییدا بیکەن، چاویان دەردەهێنن. ئەوە کە ئەستەمە هەر بۆیشیان بڵاوبکرێتەوە لەهیچ دەسگایەکی پەخشی خاوەن کرێدتدا.

## گرنگیی زمان لەڕووی ئەنسرۆپۆلۆجییەوە

لە کتیبی "زگماکیی زمان- The Language Instinct" دا پینکەر Pinker ، لەڕووی ئەنسرۆپۆلۆجییەوە پێیوایە، لەکاتێکدا زمان وەک ستراکتۆرێکی بایۆلۆجی لەناخی مرۆڤدایە، بەلام سەرئەنجام ئەو نێوەندەیە کە سەرجەم زمانەکانی بۆ بیرو تێرامان، تێدا وەردەگیرێدرێ (Pinker,1994). ئەمرۆ هیچ گومانی تێدا نییە، کرمانجیی ناوەڕاست( سۆرانیی) وەک زمانی سەرەکیی کورد ، بووەتە ئەو نێوەندەی کە زۆربەی رەهای بیری کوردیی لە کوردستانی باشوورو کوردستانی رۆژهەلات و تاراوگەدا، پێدا دەگوزەرێ.

زمان، ئایدێنتیتیی identity ی کۆمەلایەتییە لە نێوان پێکەوەگرێدانی تاک و کۆڕوکۆمەلە مرۆییەکاندا. پێوەندیی نێوان زمان و ئایدێنتیتی، پێوەندییەکی زۆر بەهێزەو "کاریکتەرەکانی هەر زمانێک، ئاماژە بۆ ئاسانکاریی ئایدێنتیتی ئەو جڤاکە دەکات"( Tabouret-Keller,1997,p.317 ). چونکە زمان تەنها ئایدێنتیتی بۆ ئاخافتکەرانی دروست ناکات، بەلکو "ئەندامبوونی ئەوانیش لەڕووی گرووپە کۆمەلایەتییەکانەوە دەستنیشان دەکات" (Gumperz, 1982,p. 239).

کۆمەلناسەکان و ئەنسرۆپۆلۆجیستەکان بەزۆرینەیەکی رەهاوە لەو بڕوایەدان" گرووپە ئێسنیکەکان هەندێکیان نەتەوەن و هەندێکیان نا، بەهەمان شێوەیەش، هەندێ لە گرووپە ئێسنیکەکان و هەندێ لە نەتەوەکان، مەرج نییە ولاتیان هەبێ یان بیانەوێ، بەلام هەندێکیان هەیانە، یان دەیانەوێ" (Eller, 1999, p. 16) . کورد وەک نەتەوەیەک هەمیشە بەشوێن ئەوەوە بووە کە خاوەنی ولات و خاک و ئاوی خۆی بێ، یان بەواتایەکی بەرینتر بەشوێن ئایدێنتیتیی خۆیەوە بووە. زمانیش یەکێکە لە هەرە میکانیزمە بالاکانی جولاندنی ئەم مۆتیڤە. لەکوردستانی باشووردا، زمانی کوردیی(دایەلێکتی سۆرانیی) نەک هەر بەشی شێری لەم میکانیزمەدا بەرکەوتووە، بەلکو هەموو ماشێنی راگەیاندن و زمانی ویژەیی و بەرخۆدان بەم زمانە بووە. لەکاتێکدا کوردستانی باشوور، دەڤەری

بادینانیشی هەبووە، بەلام کەمتر جیدەستی کرمانجی ژووروو بە رووداوە سیاسیی و کولتووریی و رۆشنبیرییەکانەوە دیاربووە.

## لینگوافرانکا... زمانی ستاندەرد

زمانی ستاندەرد، چ وەک دیبەیت و چ وەک پرۆسێس خزمەتێکی گەورە بە هۆمەجینییەسی( چوونیەکیی-homogeneous) رەوشە سیاسیی و کۆمەلایەتیی و کولتوورییەکانی ئەو گەل و نەتەوانە دەکات کە بەکاری دەهێنن ( Kristiansen,2001). ئێستا لەکوردستان و لەهەندەران ، لەنێو کۆمەلی خەلکی دایەلێکتچیی و ناوچەگەردا، زۆر بەسەرسەختییەوە دژایەتیی ئەو کۆششانە دەکەن کە خەریکی ستاندەردایزی زمانی کوردیین. ئەم بۆچوون و تێزە سیاسیی و رۆشنبیرییانەی ئەم جۆرە کەسانە چینەی لەسەر دەکەن ئەوەندە دواکەوتووانەو لادێییانەboorish و بازاڕییانەیە vulgar ، دەکرێ وەک ( Milroy ) هکان ناوی لێدەنێن "ئایدیۆلۆژیی ستاندەرد" standard ideology ی بەسەردا دابڕین ( Milroy and Milroy 2001). ئایدیۆلۆژییەک لەیەک کاتدا، ناسیۆنالیستێکی نەزان، وشک، بێئاگا لە ئەدەب و زانست و سەردەمی نوێ، لەگۆڕانگارییەکانی دنیای سیاسیی و کولتووریی و رۆشنبیریی.... ویڕای ئەمانەش، زماندرێژیی، ئاژاوەچییەتیی و زۆربلێیی لە کەسایەتیی و کارێکتەرەکانیدا کۆبوونەتەوە، ئەمانە ئەوەندە ناکۆکن لەنێوان خۆیشیاندا، لەگەل خودی خۆیشیاندا بەشەڕ دێن.

ئایدیۆلۆژیی ستاندەرد، لە زۆر ولاتدا، بەتایبەت لە ئەورووپای باکووردا، سەردەمانێک ئەو مۆتیڤانەی دەجولاند کە زمانی نەتەوەیی، سیمبولی یەکێتیی( یەکیەتیی) نەتەوەیی و شکۆمەندیی نەتەوەییە( Milroy, 2002). بەپێچەوانەوە ئەم ئایدیۆلۆژییبوونە لەسەر زمانی ستاندەردی کوردیی، نەک هەر خزمەت بە ئەفسانەی یەکێتیی نەتەوەیی کورد ناکات، بەلکو لەم نێوەندی سەرگەردانییەدا تا دێت زۆرتر دوادەکەوێ و خۆل بەسەری خۆیدا دەکات.

خۆشیی گولمەزەکە لەوەدایە، ئەمانە ئامادە نین چوار وتار، چوار لێکۆلینەوە لەسەر گەشەکردن و پەرەسەندنی زمانە بیانییەکان، داتاکانی ئەنسرۆپۆلۆجی و سۆسیۆلۆجی ئەو ئالوگۆڕانەی بە تێپەڕبوونی کات بەسەر زماندا هاتووە،

بخوێننەوە، تەنانەت ئامادەنین، میسۆدۆلەجی methodology گەشەکردنی زمانەکانی میللەتانی دەوروبەری کوردیش بخوێننەوە، کەچیی بە کەچە تاپڕێکی ناسیۆنالیستیی عاشق بەزمانی کوردیی ( کرمانجیی) ەوە دێن، ئەو هەموو داهێنان و مێژووە دوورو درێژەی زمانی کوردیی ستاندەرد( کرمانجیی ناوەڕاست) دەشێوێنن و بە شێوازێکی زۆر دیماگۆجییانە کەڕەتی سفری دەکەن و دەیانەوێ پێش بەرەوتی مێژوویی و گەشەسەندنی سروشتیی زمانی کوردیی بگرن.

بۆ ڕاکێشانی سۆزی خەڵکیش، هەندێ کوردی نەتەوەپەرستی تا ڕادەی نەژادپەرست کە ئەندێشەی کوردستانی گەورەیان لەمێشکی پڕجەنجاڵی خۆیاندا چێکردووە، دەیانەوێ لە شوێنە باریک و تەنکەکانەوە دەست پێبکەن، کە ڕێنووس و سکریپتی زمانی کوردیی( کرمانجیی ناوەڕاست) لە عەرەبیی و فارسییەوە وەرگیراوە، ئەگەر بیکەین بە لاتینیی ئەوا زۆر دەردو بەلامان لە کۆڵ دەبێتەوە. ئەم پڕۆلاتینییانە خۆیان ئامادەن زمانی عەرەبیی بپەژرێنن و بۆ زارۆکەکانی بادینان عەرەبییان لە کرمانجیی ناوەڕاست پێ باشترە، بەلام ئەگەر بیانەوێ جێگەی خۆیان بکەنەوە، بە ڕێنووسی لاتینییەوە خۆیان خۆشەویست دەکەن و لەپەنای کەمپەینی لاتینییدا، دایەلێکتچییەتیی دەکەن.

ئەم نووسینە لەو بڕوایەدایە لە داهاتوودا، دەکرێ سکریپتی ئێستای زمانی کوردیی، بەبڕیارێکی ئەکادیمیی، لینگویستیکیی وجەماوەریی و لە ریفەرێندەمێکی ئاشکرادا، بگۆڕدرێ بە لاتینیی... بەلام ئەم هەنگاوە لە خەونێکی میتافیزیکیی بەولاوە تێپەڕ ناکات، ئەگەر بەفەرمیی دەسەلاتی سیاسیی بڕیاری یەکلاییکردنەوەی زمانی ستاندەردی نووسین نەدات و ئەم کێشەیە کۆتایی پێنەهێنێت. بەواتایەکی تر، هەنگاوی یەکەم و هەنووکەیی، بەفەرمیی ناسینی زمانی کوردیی ستاندەردە، کە هیچ بێنەوبەردەیەک هەڵناگرێ، کرمانجیی ناوەڕاست( بە تێکەڵبوونی لەگەڵ کرمانجیی خوارووودا) بووەو هەر کرمانجیی ناوەڕاستیش دەبێت. هەنگاوی دووەم و لەداهاتوویەکی دوورتردا بەپرۆسێسیەکی شێنەیی و هەڵسەنگێنراوەوە، دەکرێ سکریپتەکە بگۆڕدرێ بۆ لاتینیی. ئەوە جگە لەوەی سکریپتی لاتینیی ئەگەر کێشەی دەنگەکان پڕ ئاریشەتر نەکات، ساکارتری ناکات. چونکە ئەگەر لایەنی پۆزەتیڤی هەبێ، لایەنە نێگەتیڤەکانی زۆرترن، کەمتر نین.

بەلام بەپشتبەستن بە تێڕوانینەکانی Coupland ، ئەگەر ئەم خەوە خۆشەی لاتینچییەکان سەری گرت، گوایە ئەگەر پێشتر سکریپتی لاتینیی دابنێین ، دواتریش زمانی کوردیی ستاندەرد بپەژرێنرێ، کە لای ئەوان کرمانجی ژووروووە، ئەوە ئێمە ئایدیۆلۆژیامان ستاندەرد کردووە، نەک زمان، چونکە ئەو پێیوایە، ستاندەردی ئایدیۆلۆژیی، ئەو ترادیسیۆنە پڕبەرهەم و پڕلەبەهرانەی رابردووی ئەو زمانە بەبادا دەدەن و ستایلێکی سۆسیۆزمانەوانیی تر دێتە ئاراوە، کە دۆو دۆشاو تێکەڵ دەبن و بەمشێوەیەش نموونەیەکی ناجۆر لە ستاندەردیی دەبینین کە ئێلیتێکی نوێی نەدان لە پرۆلاتینییەکان و هەندێ لە یارانی کەیخوسرەو! ستاندەردبوونی زمان داخدەکەن stigmatization( Coupland,2002 ).

ئێستا هەندێ ناوچەپەرست و زاراوەپەرست پەیدابوونە، کە رق و کینەو بوغزێکی زۆریان لەهەمبەر کرمانجیی ناوەڕاست هەیە، لەکاتێکدا دڵنیان کە هیچ دایەلێکتێکی تر جگە لەکرمانجیی ناوەڕاست، شایەنی ئەوەی نییە بکرێ بەبناغەی زمانی ستاندەرد، دێن پێشنیاری ئەوە دەکەن، کە زمانی ئینگلیزیی بکرێ بە زمانی ستاندەردی کوردیی نەک زمانی کوردیی، گەلی کورد چوار زمانەوانی کاریزمای تێدا پەیدانەبووە، نۆرەی ئەوەیە زمانی ئینگلیزیی بەو مەودا پانوپۆڕەیەوە کەپتر لە سەدان هەزار وشەیەو ساڵانەش سەدانی تری دەچێتە سەر، بیکەین بە زمانی ستاندەردی نووسین! کوردی دایەلێکتپەرست خۆی بەکونەوە ناچێ، هەڵەژێش لەخۆی دەبەستێ. ئەمانە نموونەی هیندستان دەهێننەوە، لەکاتێکدا "بەپێی ئاماری ساڵی ١٩٦١، هیندستان خاوەنی ١٦٥٢ زمانی جیاجیا بووە، ئەوە جگە لە سەدان زمان و زاراوەی لۆکاڵیی تر کە لە وێژە و نووسیندا بەکارنەهاتوون" ( Mac Giolla Chriost,2003,p210 ).

کاچرو(Kachru ) لە کتێبی ( بەهیندییکردنی ئینگلیزیی: زمانی ئینگلیزیی هیندستان) دا قسە لەسەر ئەوە دەکات، کە ئینگلیزیی بووە بەزمانی رەسەنی هیندستان لەئەنجامی پرۆسێسێکی دووروودرێژی بەریەککەوتن لەگەڵ زاراوە جیاوازەکانی هیندستاندا، بەمجۆرەش زمانی ئینگلیزیی ئەدگاری نوێی لەخۆ گرتووە، لەچەشنی لێکسیکۆگرافی(وشەسازیی-lexicography)، فەنۆلەجی، سینتاکتیک و سیمانتیک و تاد(Kachru, 1983 ). ئەم جۆرە کەسانە هەورامان و بادینان و گەرمیانیان لێ بووە بە وڵاتی هیندستان، مەسەلەکەش

هەمووی لەوێوە سەرچاوە دەگرێ، کینەیەکی زۆر خەستوخۆڵ، لەدژی کرمانجیی ناوەڕاست لەناخیاندا قوڵپ دەدات، کوردایەتییەکی شرۆشێت نەبێ، برستی بیرکردنەوەیەکی مرۆییانەشیان تێدا نەماوە.

کورد کە فێری هەندێ تێرم و نۆرمی رۆژئاوایی دەبێ، خۆی زۆر تەسک دەکاتەوە و بەنازونووزەوە باس لە ئازادیی و دیموکراسیی و مافی مرۆڤ دەکات. بەشێک لەمانە لە ئاست ئەو هەموو پێشێلکارییەی دەسەلاتی سیاسیی و رەشەکوژییەی ژنان و گەندەڵییەی کوردستاندا، زار هەڵناهێننەوە، کەچیی ئەگەر بێتە سەر ئەوەی بگوترێ کرمانجیی ناوەڕاست زمانی ستاندەردی کوردییە، هەزارو یەک بیانوو دادەتاشن، لەچەشنی ئەمە بەسەپاندن نابێ و ئەمە پرۆسێسێکی سروشتییەو دەبێ کاتی بدرێتێ و ئەمە پێشێلکردنی مافی مرۆڤە و دژی ئازادییەو ....تاد . ( ١٨) ساڵیان پێ کەمە، هیچ بۆ زمانی فەرمیی و ستاندەردی کوردیی نەکراوە، کە هیچی ناوێ جگە لە بڕیارێکی سیاسیی دەسەلاتداران، لەکاتێکدا لەو ١٨ ساڵەدا، لەکوردستان، کورد خەریکی شەڕی نێوخۆ و گەندەڵیی و داڕزان بووەو بە هەزاران ژن کوژران و هەزاران جاش و ئەنفالچییش خەلاتکراون، لەکاتێکدا بەشێکی زۆر لەم زماننناس و زمانەوانانەی کورد، ئەگەر باوەشێنی شەڕو نۆشی گەندەڵییشیان نەکردبێ، سەری خۆیان کزکز کردبوو.

ئەم نووسینە بەتەواویی لەو بڕوایەدا، لە کوردستانی باشووردا، دەبێ زمانی ستاندەرد بسەپێنرێ، چۆن لەرووی سروشتییەوە کرمانجیی ناوەڕاست خۆی سەپاندووە، ئاواش لەرووی ئیدارییەوە دەبێ زمانی ستاندەرد بەسەر ئەم تیرەو ئەو شارو ئەم دەڤەرو ئەو دایەلێکتی تردا بسەپێنرێ. فیشمان پێیوایە، زمان و دایەلێکتی بەهێزو خاوەن ستراکتۆری توندوتۆڵ، لەگەڵ زمان و دایەلێکتی لاوازو ستراکتۆر شلوشاودا، لە جەنگەڵێکی داروینییدان و بەهێزەکان بێهێزەکان دەخەنە ژێرەوە( Fishman,2004). بۆ ئەوەی هەندێ زمانزان و زمانەوانی نەوەی شێر( نەوەی کورد) و نەوەی کەیخوسرەو ملیان رەپ نەبێ، مەبەستەکە بەمشێوەیەیە: لە کوردستانی باشووردا، زمانی کوردیی (کرمانجیی ناوەڕاست) بەزۆربەی پێوانە زمانەوانییەکان تەنگی بە زاراوەکانی تر هەڵچنیوە و لە دەڤەرێکی تەسک و دیسکۆرسێکی تەنگدا قەتیسی کردوون. ئەمەش بەرهەمی هیچ حیزب و لایەنێکی سیاسیی نییە، بەڵکو خەرمانەی ئەو تێکستە

زۆرانەیە کە بە کرمانجیی ناوەڕاست نووسراون، باشترین گەواهییدەری ئەم ڕاستییەن.

مەگەر بەشی زۆری بەدبەختیی کورد لە نەزانیی و سەرگەردانییبوونییەوە سەرچاوە ناگریْ! فەرموو کەسێکی وەک M_ller لەساڵی ١٨٦١ دا بە وردبوونەوەیەکی زۆر بێئەندازەوە لەسەر ئانەلۆگی analogue زمان بۆ سروشت و زانست دەڵێت"دایەلێکتەکان هەرگیز هیچ ئەدەبێکیان بەرهەم نەهێناوە"( M_ller,1861,p23 ). کەچیی کوردی پارچەپارچەو باوەکوشتەی یەکگرتوویی و یەکزمانیی، هێشتا لەخەمی ئەوەدایە، کە دایەلێکتی هەورامیی و زازایی و لوڕیی و بادینانیی نەفەوتێنیْ و وەک میراتێکی پڕ لەشکۆ دەستیان پێوەبگریْ. ئەگەر هەرکاتێکیش زانیتیان ئەوە هێجەمۆنیی کرمانجێی ناوەڕاستە و خەریکە بەتەواوەتیی خۆی وەک زمانێکی ستاندەردی خاوەن پێشینەو مێژوویەکی دووردودرێژ، بەسروشتیی جێکەوت دەکات، ئەوە دەڵێن یاخیی دەبین و بۆی هەیە لەکوردبوونی خۆیشیان بکەونە گومانەوە بۆ ئەوەی وەک کارتێکی گوشار ، لەبەرامبەر دەسەڵاتی سیاسیی کورددا( ئەگەر ئەم تێرمە دروستیی تێدابێت) بەکاری بهێنن، کە کاریزمایی ئەوەندەی تێدا نییە، زمانی کوردیی ستاندەرد، لەرووی سیاسییەوە ساغبکاتەوە.

زمانی ستاندەرد، بەهەموو وردەکاریی و پەلوپۆکانییەوە، پتر مەبەست لەزمانی نووسینە، ستاندەردبوون کۆمەڵیْ مۆتێڤی سیاسیی و کۆمەلایەتیی و بازرگانیی دەیجوڵێنیْ بەلام لە کۆنتێکستێکدا کە بە زمانی ستاندەردی نووسین دەناسرێتەوە زیاتر دەردەکەویْ( Milroy & Milroy,1985,p.22 ). چونکە ئەستەمە زمانی ئاخافتن لە هیچ جێگەیەکی دنیادا بتوانیْ بۆ چەند ڕۆژێکیش خۆی لەهەمبەر زمانی نووسینی ستاندەردا بگریْ، ئەمە سروشتی زمان و گەشەکردنیەتی. بەلام بۆ ئێستای کورد و باردۆخی سیاسیی و جیۆگرافیی کورد، زمانی ستاندەرد وەک هەر زمانێکی تری جیهان کە بە نووسین، دەق دەگریْ، ئەم دەقگرتن و ئامادەگییەش بەس لە کرمانجیی ناوەڕاستدا هەیە بۆ ئەوەی بە لینگوا فرانکای کوردیی دابنریْ .

فیرعەونە زمانزان و زماننا‌سەکانی دایەلێکتەکانی کورد نەک هەریەکەو بە ئاوازێک لەسەر زمانی فەرمیی دەخوێنن، بەڵکو ئامادەش نین دەستبەرداری ناوچەگەرییەتیی و عەشیرەتگەرییەتیی و دایەلێکتچییەتیی ببن و بیر لە داڕشتنی

زمانێکی ستاندەردی کوردیی بکەنەوە. بۆ ئەم جۆرە کەسانە ئەگەر سەبدایەلێکتی بادینانیی بێت مێشێک میوانیان نییە، بەڵام چاویان بەرایی نادات، ئەو هەموو گەشەیەی کرمانجیی ناوەڕاست ببینن و خۆیان لەگێلیی دەدەن. زمانی کوردیی ، هەر ئێستا بەهۆی مێژووی نووسین و دەوڵەمەندبوونییەوە، کاریکتەرگەلێکی زۆری لەزمانی فارسیی و ئەوروپاییەکانەوە وەرگرتووە و پێ بەپێش لەژێر هیجەمۆنیی زمانی عەرەبیی دوور دەکەوێتەوە. ئەمە پێوەندییەکی سروشتیی و مێژوویی نێوان زمانەکانە. ئەو زمانە ئینگلیزییەی کە ئێستا پێی دەگوترێ زمانی فەرمیی( Official Language)،کاریکتەرگەلێکی زۆری لە زمانی لاتین و گریگەوە Latin& Greek وەرگرتووە( Milroy & Milroy,1985,p.46 ). ئەوە جگە لەوەی زمانی فڕانسیی زۆرترین قورسایی کولتووریی بەسەر زمانی ئینگلیزییەوە هەیە. بۆیە ئەو زمانەی لە کوردستانی باشوور هەیە، دەکرێ ببێ بەبناغەی زمانی نیشتمانیی بۆ سەرجەم هەرێمی کوردستان.

کەسێکی وەک Feyerabend ، جوان بۆی چووە کاتێ ئاماژە بەوە دەدات کە میسۆدی "میتۆدی" زانستیی لەزماندا، بەشێوەیەکی ڕەها نییە. بەڵکو زانست، دەسگاو دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتییە، بەمشێوەیە گۆڕانە زانستییەکان، دەبێ ڕوونبکرێنەوە نەک لە ڕووی ڕاشنالیستبوون و پێشکەوتووخوازییەوە، بەڵکو لەڕووی کاریگەرییەتی پاڵەپەستۆی گرووپەکان لە چەشنی ئیلیتە ئەدەبیی و سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکان، بەسەر سەرجەم بوارەکانی ژیاندا (Feyerabend, 1978). ئێستا ڕۆڵی ئەم ئیلیتانەیە، ئەم ئەرکە لە ئەستۆ بگرن و کۆتایی بەم کێشەی نەبوونی زمانی ستاندەردە( بەشێوە فەرمییەکەی) بهێنن. بە پێچەوانەوە بەشێک لەمجۆرە ئیلیتانە، تاک تاک و گرووپ گرووپیش، زۆربەیان شەقشەقەی حیزبیی و ئایدیۆلۆژیی و ناوچەگەرییەتییان لەخۆبەستوەو ئەوەی بیری لێ ناکەنەوە، لینگوا فرانکای نووسینە، ئەگەریش بیری لێ بکەنەوە، ئەوە بەشێکیان بیانووی زۆروبۆریی کرمانجیی دەهێننەوەو کرمانجیی ناوەڕاستی پێ لەکەدار دەکەن.

ئەگەر لەڕووی تیۆری ڕاشنالیزمیشەوە بێت، ئەمڕۆ کرمانجیی ناوەڕاست سنوورێکی زۆری بڕیوەو بەبادانی ئەو هەموو ئارکایڤە(ئەرشیف) لە ماندووبوون و ئەو هەموو مێژووە ئەدەبیی و سیاسیی و کولتوورییەی

بەزمانی کوردیی نووسبراوەتەوە، خۆکوژییەکە لە کێڵگەی زمانەوە بۆ زۆر کێڵگەی تریش تەشەنە دەکات. هەروەها ئەگەر لەڕووی ئیمپیریسیزمیشەوە( ئەزموونگەرایی- empiricism) بیقەبڵێنین، بەدەر لەبەرچاوگرتنی ئەوەی میتۆدێکی زانستیی و ئەکادیمیی و ئینستیتیوتیی لەپشتەوە نەبووە، بەڵام زمانی کوردیی( کرمانجیی ناوەڕاست) بەپشتئەستووریی کۆمەڵێ ئەزموونی سەخت و دژوارەوە، هەر لەسەردەمی WWI و دروستکردنی عێراقەوە و دواتریش لەسەروبەندی دەسەڵاتی شێخ مەحمود و قازی محەمەدو بارزانیی یەکەم و شۆڕشە چەکدارییەکانی کوردستانی باشوور و ڕۆژهەڵات و بەتایبەتیی شۆڕشی کورد دوای ئاشبەتاڵی ١٩٧٥ و ئەزموونی خوێندن لەسەردەمی بەعس و هەلومەرجی هەنووکەی کوردستانیش، ئەم ئیمپیریسیزمەی بەتەواویی بالادەست بووە. دەکرێ بگوترێ فەندەمێنتالیزمی کوردیی کرمانجیی ناوەڕاست لەستاندەردبوون و کرایتێریاو فیگەرەکانی ژیانی کولتووریی و سیاسیی و ڕۆشنبیریی کورددا چووەتە ئاستێک گەڕانەوەی بۆ نییە( Bartley,1982 ).

"زمان دەستمایەی corpus فێربوونی شتەکانە" ( Ryle,1961, p.5 ). کورد دەستمایەیەکی زۆری بەدەستەوەیە لە زمانی کوردییدا، بەستاندەردکردنی کرمانجیی ناوەڕاست بەشێوەیەکی فەرمیی و سیاسیی بۆ ئەم بەشەی هەرێمی کوردستان، لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان و نێوەندە سیاسییە بالادەستەکان و قسەڕۆیشتووەکانی کوردستانەوە، شەپۆلی ئەم فێربوون و پاشخانی ئەم ڕۆشنبیرییە مکومتر دەکات. بەسپاردنی ئەم ئەرکە هەنووکەییە بەئاییندەیەکی لێڵ، بەتەنها کەمتەرخەمیی نییە ، بەڵکو دەکرێ هەزارو یەک هاوکێشەی ناوچەگەرییەتیی و خێڵەکیی و بەرەبابیی و حیزب حیزبێنەی لەپشتەوە بخوێنرێتەوە.

نیڵ سمیس ( Neil Smith ) لە پاسۆلۆجی زماندا بڕوای بەوە هەیە کە هەلومەرجی جینەکان و پێکداداان و کارەساتەکان و ترۆماکان ( داخوڕپان- trauma )، کار دەکاتە سەر زمان و وێرانی دەکات( Smith,1999). ئەم پاسۆلۆجییە بۆ زمانی کوردیی ڕاستییەکی زەقی تێدایەو دەبێ ددانی پێدا بنێین. زمانی کوردیی، بۆ سەردەمێکی دوورو درێژ تووشی ترۆما بووەو زمانی کارەسات و ڕاکەڕاک بووە، لەم مێژووە پڕ لەدابڕان و پێکدادانانەدا لەگەڵ هێزە بالادەستەکانی ناوچەکە بەدرێژایی مێژوو، ڕاستییەک زەق دەبێتەوە ،

ئەویش ئەوەیە ئایا کورد زمانێکی هاوبەشی هەیە، یان کۆمەڵێ دایەلێکتی سەروگوێلاک شکاو و پەرتوبڵاوی هەیەو ئیلێتی( ئەگەر ئەم تیرمە بۆ ئێرە دروست بێت) هەر ناوچەیەکیش لە هەوڵی ئەوەدان بڵێن دایەلێکتەکەی خۆیان رەسەنەو ئەوانی تر بیژێین. بەلام شانوشەوکەتی کرمانجیی ناوەڕاست سەرەڕای ئەوەی هەزاران هەورازو نشێوی کردووە ، کەچیی توانست و دەستمایەو ئیمپیریسیزمی خۆی نەک لەدەست نەداوە، بەپێچەوانەی دایەلێکتەکانی ترەوە، رۆژ بەرۆژ لە هەڵکشاندایەو کەڵەگەتتر دەبێ.

"زمانی گشتیی هەر ناوچەو نەتەوەو وڵاتێک، ئەو زمانەیە کە خەڵکەکەی بە جوانیی و رێکوپێکیی و سانایی لەژیانی رۆژانەو ئەدەبی فەرمییدا بەکاری دەبەن" ( Smith,1999,p.149). راستە زمانی کوردیی وەک زمانی گریکیی مۆرفۆڵەجی ئاڵۆزی نییەو وەک ئینگلیزییش خاوەن فەرهەنگۆکێکی دەوڵەمەندو پڕ لەتەکنیک نییە( ibid)، بەلام لەگەڵ ئەمانەشدا، توانیویەتی ستراکتۆری زمانی گشتیی سەرجەم جیۆگرافیای دوو پارچەی سەرەکیی لە کوردستان ( باشوور و رۆژهەلات ) چێبکات و بالادەستیی خۆیشی بەتەواویی بەسەر زاراوەکانی تردا بسەپێنێ.

سمیس وەک زمانەوانێک، نەک وەک سیاسەتمەدارو شارەزایەک لە تیۆری سیاسییدا، بە جەختکردنەوە لە بۆچوونەکانی چۆمسکی لەسەر دەسەلات و زمان، ئاماژە بە گرنگیی دەسەلاتی سیاسیی دەدات لە یەکلاییکردنەوەی خولیا تایبەتییەکانی خۆیدا. ئەو پێی وایە" دەسەلاتی سیاسیی، سەرئەنجام لە سەر هێزی ئابووریی پشتی خۆی قایم دەکات، بۆیە حکومەت لە کاردانەوەیدا هەمیشە بەرژەوەندییە ئابوورییەکان دەخاتە پێش هەموو شتێکەوە"( Smith,1999,pp.195-196). لە راستییدا ئێستا دەسەلاتی سیاسیی و خوا پێداوەکانی ناو دەسەلات و حکومەتی هەرێم، ئەوەندەی بیر لە بەرژەوەندییە ئابوورییەکانیان و گیرفانی تایبەتیی خۆیان دەکەنەوە، یەک لەسەدی ئەوەش بیر لەچارەسەرکردنی زمانی فەرمیی و لینگوا فرانکای کوردیی ناکەنەوە.

فەرموو ئەو هەموو پیاوە مەزنانەی ناوی خۆیان ناوە زمانزان و زمانەوان و شارەزا لە زمان و ئەکادیمیست لە بواری زماندا،لەوەش گاڵتەجارپیتر، خۆیان کردووە بە ئەیلییەنAlien ی هەسارەکانی بۆشایی ئاسمان و هاتوونەتە سەر زەویی بۆ دەستگرتنی عەوامی خەڵک و خانۆچکەی زمانی کوردیی چێدەکەن.

ئەم هەموو خاتوون و پیاوەی ناو پارلەمانی کوردستان، کە ئیشیان لە پارانەوەو لالانەوە زیاتر شتێکی تر نییە و یەک پرۆژەی نوێ و یەک هەنگاوی بوێرانەو یەک نووزەی نوێخوازیی چییە بۆ زمانی کوردیی پێیان نییە، کەچیی بەخۆیشیان دەڵێن زمانەوان. مەگەر زۆربەی ئەمانە ئەوەندەی بیر لە خۆشگوزەرانی خۆیان و ماڵ و منداڵیان دەکەنەوە، ئەوەندەی بیر لە پیرۆزراگرتنی سیمبوڵیزم و ئەفسانەتاشین بۆ سەرکردەکان دەکەنەوە، بە مووش دەچن بەلای چارەسەرکردنی کێشەی زمانی ستاندەردا، لای کەم زمانی ئۆفیشەڵی کوردییدا. ئیتر چۆن دەکرێ ئومێد لەسەر ئەم وشکە کەڵەکانە هەڵبچنرێت، چۆن دەکرێ چاو ببڕدرێتە ئەم ئەکادیمیستە بەناوبانگ و زمانزانە لێهاتووانەی کورد! ئەوکاتەی ئەگەر وەنەوز بەریدان خەمێک لە زمانی ستاندەردی کوردیی بخۆن.

کەس ناڵێ ئەوان وەک چۆمسکی بکەن، چونکە بۆ تێگەیشتن لەچەمکەکانی چۆمسکی لەسەر زمان، بەشێکی زۆر لەم ژن و پیاوە زمانزان و سیاسییانەی کورد کاتێکی زۆریان دەوێ تا لەنووسینەکانی چۆمسکی بگەن، ئەوە ئەگەر تێیشی بگەن، بۆیە بەراوردەکە هەر لەسەرەتاوە پەڕەمووچە. بەلام هەر هیچ نەبێ تۆزێ بەسەر دەسەلاتدا بهاتنایەتەوەو ئەوەندە لالەپەتەیان نەکردایەو زمانی پارانەوەیان فرێ بدایە و وازیان لە نوشتەکردن بۆدڵنەرمکردنی سەرکردەکان بهێنایە ، بۆ ئەوەی زمانی ستاندەرد بپەژرێنن. ئەگەر تۆزقاڵێک ئازادانەو ئازایانە رەخنەیان بگرتایە و داوایان هەبووایە، تا ئێستا زمانی کوردیی ستاندەردیان ساغدەکردەوە. هەنووکەش کورد خاوەنی لینگوا فرانکایەکی تۆکمە دەبوو.

چاوەڕێی ئەوەیان لێ ناکرێ وەک چۆمسکی ئانارشیستانە رەخنە بگرن، چۆمسکی وەک گەورەترین و دیارترین ئایکۆنی سیاسیی و زمانەوانیی، ئەوەندەی رەخنە لە سیاسەتەکانی ئەمێریکا گرتووە، خۆی بە خۆی دەڵێ "کەمێک ئانارشیتسم" (Chomsky,1988c,p744 ). بەلام خۆ دەکرێ لای کەم ئانارشیستانە لەهەمبەر زمانی یەکگرتووی نووسیندا، رەخنە لەو بێسەرەوبەرەییەی دەسەلاتی سیاسیی بگرن. کە خۆیان هیچیان پێ نییەو، هیچ ناخوێننەوەو بە هزری حەفتاکانی سەدەی رابردووەوە بیر دەکەنەوە، بۆچیی ئەم پۆستانە لەخۆیان ناسەننەوەو چیتر بەخۆیان نەڵێن زمانزانان و زمانەوانان

و ئەکادیمستانی زمانەوانیی .... سەیرە پرۆفیسەرێکی زانکۆ، دۆکتەرێکی زانکۆ، پیاوانی کەنەفتەو تەمەڵ، لە شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی پێشوودا، وتار یان کتێبێکیان نووسیبێت، ئێستایشی لەگەڵدا بێت، هەر لەسەر قەوانە کۆنەکە دەڕۆن وکەسانی وەک نیل سمیس و (میلرۆی)ەکان Milroy و John Lyons وباختین و گرامشی و ئێرنست گێلنەرErnest Gellner و تەنانەت (چۆمسکی)یش هەر بەسەپانیش راناگرن.

ئەم" جەنابی عالییانە" نازانن یان نایانەوێ لەوە بگەن، ئەگەر کەسێک بەخۆی بڵێ رۆشنبیر، لە سەردەمی گڵۆبالیزەیشندا، دەبێ بەردەوام ئاگای لە داهێنانەکان بێت لەبوارەکەی خۆیدا. دەبێ وەک سۆفتوێرد بەردەوام خۆی ئەپدەیت بکاتەوە، ئەگەر لای زۆر ٤-٦ مانگ، لە رۆژگاری ئێستادا لەخوێندنەوە دابڕێ ، ئێتر دەکەوێتە دواوە. باشە بێوێژدانییە ئەگەر بگوترێ بەشێکی زۆر لەم جەنابی عالییانە، لەم زمانزانانە ئەوە بۆ چەندین دەیەیە، مێشکیان ئەپدەیت نەکراوەتەوە. ئەگەر پێنووسێک و لاپەڕەیەکی A4 یان بدەیتێ و بڵێی، تەنها ناوی چوار زمانەوان ( مەبەست لە لینگویستیکە ) و چوار کتێبێ دانسقە لەسەر زمان بنووسن ، لە هەشت سالی یەکەمی هەزارەی سێیەمدا بووبن بەئایکۆن و بڵاوکرابێتنەوە ئایا ٩٩% یان لەم پرسیارە سادەیەدا دەردەچن؟ جا هەش بەسەرت کورد ئەمانە زمانزانەکانت بن وئەمانەش بیر لە چێکردن و جێگیرکردنی لینگوا فرانکای کوردیی بکەنەوە.

پرۆفێسەر جۆن هەنی John Honey لەسەر گرنگیی زمانی ستاندەردی ئینگلیزیی و ئەو ناحەزانەی کە دژی ستاندەردبوونی زمانی فەرمیین و دایەلێکتە نێوخۆییەکان بەگرنگ دەزانن، کتێبێکی بەناوبانگی نووسیوە بەناوی " زمان هێزە" کە چیرۆکی ستاندەردبوونی ئینگلیزیی و نەیارانی ئەو پرۆسێسە شرۆڤە دەکات. هەر چەندە هەنی پێیوایە، کە زمانی ستاندەرد لە رووی مێژووییەوە پێویستیی چینە باڵاکان بووە، جۆرێک سەپاندنی تێدابووەو رەخنەی زۆریشی لەمبارەیەوە هەیە،. بەڵام ئەو راستییە ناشارێتەوە کە گرنگیی ستاندەردبوون و ئینتەرناسیۆنالیستبوونی زمانەکان بایەخی زۆریان هەیە. ئەو پێیوایە ، ئەگەر بە ئەنقەست و بەشێوەیەکی دەستکرد زمان بەرەو پرۆسێسی ستاندەردەردبوون ببرێ، کاریکتەرەکانی خۆی لەدەست دەدات و دیسکۆرسی زمانەوانیی و گەشەی سروشتیی زمان سەرەوژێر دەبێتەوە( Honey 1997 ).

ئەم دەردە ڕێک لە عاشقانی سکریپتی لاتینیی و دایەلێکتی کرمانجیی سەری هەلداوە، نایانەوێ کرمانجیی ناوەڕاست بکرێ بە بناغەی زمانی ستاندەرد، بەلام دەیانەوێ بووەستین تا کوردستانی گەورەیان وەک هێلکەی پاککراو بۆ دێتە بەردەم، ئەوسا زمانی ستاندەرد چێبکرێ. بەلام هەنی بەتەواویی لە گەڵ ئەوەدایە کە زمانی فەرمیی و ستاندەرد دەبێ بسەپێنرێ ( ibid). چونکە بەبێ میکانیزمێک بۆ جێگیرکردنی لینگوا فرانکا، گەڕەلاوژەی دایەلێکتەکان هەرگیز کۆتایی نایەت.

بەگوێرەی بۆچوونەکانی سوسیۆزمانزانی ئەمێریکایی Robert St Clair بێت ، زمانی ستاندەردی ئینگلیزیی لە ئەمێریکای باکووردا کەسەپێنراوە، بەدەست ئیلێتی دەسەلاتەوە، بووە بەهۆی نکۆڵیکردن لەمافە کولتوورییەکانی کەمایەتییەکانی تر( St. Clair, 1982). لەکاتێکدا رۆبێرت، روانگەیەکی هیومانیستیی هەبووەو داکۆکییکەر بووە لە مافی کولتوورە جیاوازەکانی نێو ئەمێریکاو لەگەڵ سەپاندنی زمانی فەرمیی و ئیداریی ولاتیشدایە وەک پێویستییەکی سەردەم، بەلام لە کوردستان و تاراوگەدا ئێستا هەندێ کەس و دەسگای سیاسیی و رۆشنبیریی هەمان تێڕوانینی ئەم سۆسیۆزمانزانە بەدیوێکی عەشایەریی و ناوچەگەرییەتیی و دایەلێکچییەتییدا دووپات دەکەنەوە. گوایە ئەگەر زمانی کوردیی ( کە ئەوان تەنها و تەنها بە سۆرانیی ناشیرینی دەکەن ) بکرێ بەزمانی ستاندەردو فەرمیی، بکرێ بە لینگوا فرانکا و بسەپێنرێ ، ئەوە ستەمێکی زۆر لە کرمانجیی ژووروو ، هەورامیی،زازایی ...تاد دەکرێ مافە کولتووریی و ئازادییەکانیان پێشێل دەکرێ؟

لە هەموویشی سەیرتر ئەوەیە، ئەم رقوکینەیە بۆ لە کرمانجیی ناوەڕاست و بۆ بەم رادە زۆرە بوونی هەیە؟ ئێستا لە تاراوگەدا، بەهۆی ئازادییە سیاسیی و کولتوورییەکان لە ولاتانی دیمۆکراسییدا، چەندین زازایی و ئێزیدیی و لوڕیی ....تاد پەیدابوونەو خەریکی ئەوەن نکۆڵیی لە کوردبوونی خۆیان دەکەن. بەداخەوە ئەم دەردە خەریکە هەندێ کوردی هەورامیی فەندەمێنتالیستیش دەگرێتەوەو لە گەشەی زمانی کوردیی ( کرمانجیی ناوەڕاست) پڕبوونەو هەر رۆژەی بیانوویەک بۆ بنکۆڵکردنی کرمانجیی ناوەڕاست و هەڵکشان و گەشەکردنەکانی دەدۆزنەوە.

ئەوانەی خاوەنی ئەو بۆچوونانەن، دەمارگیریی ناوچەیی و لۆکالیزم دایڕزاندوون و نایانەویت لەو راستییە بگەن کە زمانی ستاندەرد، زمانی دایکی ( مەبەست لەزگماکە) هیچ ناوچەو گرووپ و لایەن و دایەلیکتێک نییە، بەواتایەکی تر "زمانی ستاندەرد، زمانی زگماکی هیچ کەسێ نییە" ( Romaine,1984, p.233). ئەم بۆچوونەی پرۆفیسەری زمانەوانیی سۆزان رۆماین، ئەگەرچی لەسەر زمانی ستاندەردی ئینگلیزیی توێژینەوەی کردووە، بەڵام بەشێوەیەکی رەهاش بۆ هەموو زمانەکانی تر راستییەکی مێژوویی و ئەنسرۆپۆلۆجی و سۆسیۆزمانەوانیی تێدایە.

زمانی کوردیی لەسەربناغەی کرمانجیی ناوەڕاست لە بنەچەدا لە ناوچەیەکی بەرتەسکی رەواندزەوە سەری هەڵداوە، لە حەفتاکانی سەدەی نۆزدەیەمەوە، لەقەڵەمڕەویی میرنشینەکەی محەمەد بەگەوە پەلوپۆی هاویشتووە( زەکی،٢٠٠٤) . بەڵام ئیستا هەولێرییەک و سلێمانییەک و کەرکوکییەک و گەرمیانییەک پێی دەئاخفن و پێی دەنووسن، تەنانەت بەشێکی زۆری ناوچەکانی بادینانی کوردستانی باشوور ، لەگەڵ کرمانجیی ناوەڕاستدا گرفتێکی ئەوتویان نییە. هاوکات بارزانییەکان، چونکە زۆر تێکەڵهێکیشیان هەیە لەگەڵ کرمانجیی ناوەڕاستدا، دەکرێ بڵێی زۆرینەی بارزانییەکان زمانی کوردیی ( کرمانجیی ناوەڕاست) بەباشیی دەزانن. ئەوە جگە لە کوردستانی رۆژهەڵات، سابلاغ ، سنە، بۆکان ، سەقز و تاد، بگرە زۆربەی هەرە زۆری ئەم پارچەیەی کوردستانیش پێی دەنووسن و پێی دەئاخفن.

راستە ئەم شارو ئەو ناوچە زمانی ئاخافتنیان کەم تا زۆر جیاوازیی پێوە دیارە، بەڵام لەنووسیندا ئەم جیاوازییانە زۆر دەرناکەون. ئەوە جگە لەوەی ئەگەر هەڵە بێت یان راست، کرمانجیی ناوەڕاست بووەتە بریکاری هەموو کرمانجی خواروو، یان هەندێ کەس هەر بە کرمانجیی ناوەڕاستی دەزانن. هەروەها لە دوای راپەرینی ١٩٩١ ەوە کرمانجیی ناوەڕاست هێجەمۆنیی خۆی پانوپۆڕتر کردووەتەوە بەسەر کوردستانییاندا ( زارەوەی ناسیۆنالیستە توندڕۆکانە، مەبەست لە کوردستانییەکانە). بەکورتیی، دایەلێکتەکەی محەمەد بەگی جاران، هەنووکە بەشێوەیەکی سروشتیی بووە بە کاراترین و خاراوترین و چاپووکترین زمانی نووسینی کوردیی و رۆژ لەدوای رۆژیش باڵای کەڵەگەتتر دەبێ، بەدەر لەوەی جۆری ئاخافتن تاهەنووکەش لە ناو رەواندزدا،

پێچەوانەی ڕێزمانی ستاندەردی نووسینە( زمانی کوردیی)، کەواتە ئەم زمانە ستاندەردەی ئێستا بوونی هەیە، مەرج نییە لە وێلاشی ئاخافتنی ناوچەی ڕەواندزەوە خۆراکی وەرگرتبێت. بەڵکو تێکستی دەوڵەمەندی کوردییە کە کرمانجیی ناوەڕاست بە ئێرە گەیاندووە.

زمانی ستاندەرد، دەکرێ دەیان و سەدان شیکردنەوەو پێناسەی جیاوازی بۆ بکرێ، دەیان و سەدان ڕای پێچەوانە لە نێو زانایانی بواری زمانەوانییدا هەیە. بەڵام سەرجەمیان لەسەر گرنگیی و پێداویستیی زمانێکی ستاندەرد لە ئاست ئەرک و فەرمان و پێداویستییە نیشتمانیی و ناوچەیی و گلۆباڵییەکاندا جەخت دەکەنەوەو زۆرینەی ڕەهاشیان لەگەڵ سەپاندنی زمانی ستاندەردو فەرمییدان، چونکە ئەمە جگە لەوەی سەرئەنجام بڕیارێکی سیاسییە، بەڵام لەبنەچەدا، پاشخان و ستراکتۆر و مێژووی ئەو زمان و دایەلێکتە، ئەم مافەی بۆ دەستەبەر دەکات. کورد، وەک نەتەوەیەکی دابەشکراو، زۆر گرنگە زمانی ستاندەرد و لینگوا فرانکای لە ئێستادا هەبێ. نابێ لەئاست تەنگژە سیاسیی و جیۆگرافیی و کولتوورییەکاندا خۆمان کەڕ بکەین. ئێمە ئەمڕۆ قسە لەسەر زمانی یەکگرتووی کوردیی دەکەین، مەبەستمان لە کوردستانی باشوورە( کوردستانی عێراق ). گەلی کوردی پارچەپارچەکراو، توانا و بڕستی ئەوەی نییە لە ئێستادا زمانێکی یەکگرتوو دابنێ و لای کەم ، زۆرینەیەکی کەم لە خەڵکی سەرجەم کوردستان ڕایی بکات. دەکرێ وەک ڕیفەڕێندەمێک، ملیۆن ملیۆن خەڵکی نەخوێندەوار و بێئاگا لە زمان ، دەنگدان لە قازانجی کرمانجیی ژووروو ساغ بکەنەوە ، ئەوە ئەگەر ئەم فانتەسیی ڕیفەڕێندەمەش هەر لەبنەڕەتدا بێتە دی.

زمانی ستاندەرد و لینگوا فرانکای کوردیی بۆ کوردستانی باشوور، پێویستییەکی سیاسیی و کولتووریی و زمانەوانییە. هەر دواکەوتنێک لەم ئەرکەدا، زیانی زۆرتر بە پاشەڕۆژی یەکگرتوویی زمانی کوردیی دەگەیەنێت. زمانی ستاندەرد ئەو زمانەیە کە سنووری ناوچەگەرییەتیی دەبەزێنێ و دەبێتە زمانێکی نیشتمانیی یاخود سەرتاسەریی، دەست بەسەر زاراوەکانی تردا دەگرێ و لەچوارچێوەی ئاخافتندا قەتیسیان دەکات( Halliday,2003,p.4). چۆن زمانی گلۆباڵ کە ئینگلیزیی دەکات، سنووری هەموو نەتەوەو وڵاتەکانی

بڕیوە، بەهەمان شێوەش زمانی ستاندەردی هەر نەتەوەیەک یان وڵاتێک، سنووری دەڤەرەکان و دایەلێکتەکان دەبڕێت.

ئەمڕۆ لە کوردستان و ئەو شارو شارۆچکانەی لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێم و ناوچە سنوورییەکانی شەنگار و کەرکوک و خانەقین، وەک شاری سنووریی ناوچە کوردنشینەکان، سەرەڕای زۆرینەی رەهاش بە کرمانجیی ناوەڕاست دەدوێن و دەنووسن، بەڵام ئەم زۆرینەیە هیچ بنەمایەکی نییە بۆ ئەوەی بکرێ بە زمانی فەرمیی، بەڵکو ئەوە مێژووی گەشەی کرمانجیی ناوەڕاستە ئەم مافەی بۆ دەستەبەر دەکات. کرمانجیی ناوەڕاست بەکردەوەو بە ماندووبوون و مێژووی دەوڵەمەندی خۆی بووە بە زمانی ستاندەردی کوردستانی باشوور و تەواوی زاراوەکانی تری خستووەتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوەو هەموو سنوورێکی ناوچەگەرییەتیی سمیوە. ئەوانەی ئێستاش کەوتوونەتە بەربەرست دانان لە دژی، جگە لە مەترسیی دوولەتبوونی کرمانجیی ناوەڕاست وکرمانجیی ژووروو، سەرئەنجام زمانی کوردیی بەگشتیی، زیاتر شتێکی تریان پێ نییە و هیچیشیان لێ چاوەڕوان ناکرێ. ئەوە لەوە بگەڕێ کە کرمانجیی ناوەڕاست چەندە بەرهەمهێنەرەو( Productive) و کرمانجییش لە ئاستیدا، دەکرێ بڵێی نەزۆکە.

## سۆرمانجیی

ئەو کوردستانییانەی! خەون بە کوردستانی گەورەوە دەبینن، زۆرشانازیی بە سۆرمانجییەوە دەکەن، پێیانوایە بەزۆر تێکەڵکردنی کرمانجیی ناوەڕاست و کرمانجیی ژووروو ، کارێکە خزمەت بەئەجێندای سیاسیی و کولتووریی گەلی کورد دەکات، چ لە ئێستاداو چ لەداهاتوودا. ئەم پانکوردیستانە( Pan-Kurdish )، هێشتا لە سەردەمی ئەشکەوتدا دەژین و هیچ ئاگایەکیان لە راستییە جیۆپۆلیتیکەکانی ناوچەکەو جیهان نییە. لە خەوێکی قووڵی ئایدیۆلۆژییدا تەپاوتل دەکەن و فڕیان بەسەر هاوکێشە تێکهەڵکێشراوەکانی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە نییە. ئەوە وێڕای ئەوەی تێکەوڵێکەی سۆرمانجیی پێچەوانەی بناغە سەرەکییەکانی زمان و گەشەکردنی زمانیشە.

کرمانجیی ناوەڕاست و کرمانجیی سەروو راستە دوو زاراوەی سەرەکیی زمانی کوردیین، بەڵام ترشییمان بوێ یان شیرینیی، ئەمە دۆخێکەو تێی کەوتین، ئەم دوو زاراوەیە، ئەوەندەی نزیکایەتییان هەیە ئەوەندەش دوورایەتییان هەیە. پێش هەموو شتێ لەرووی رێزمان و داڕشتنەوە، جیاوازییان هەیە، نێرو مێ لە کرمانجیی ناوەڕاستدا یەکەو لە کرمانجییدا جودان. ئەوە لەو بەدبەختییەش بگەڕێ کە جەلادەت بەدرخان بەسەر زمانی کوردییدا هێنای و بەشێکی لە زمانی کوردیی بە بێ هیچ پرسێ بەکەسانی شارەزاو پسپۆر لەزماندا، لەسەردەمێکدا و بەچاولێکەری کەمالیستەکان، نووسینی کوردیی کرد بە ئەلفابێتای رۆمانیی ( لاتینیی). ئەوانەی پێیانوایە، جەلادەت بەم کارەی هەنگاوێکی پێشکەوتووانەو شارستانییانەی هاویشتووە، یان لای کەم "کوردپەروەرانە"ی ناوە، تا بینەقاقایان لە نائاگایی و نەدانیی و نابەڵەدییدا نوقم بووە.

ئەم پرۆلاتینییانە، هیچ ئارگیۆمێنتێکی لۆژیکانەیان نییە، جگە لەخاڵیکردنەوەی هەستێکی شرشێتانەی ناسیۆنالیستیی کە چەندێک قازانجی بۆ دۆزی کورد هەیە، سەد بەرامبەر زیانیشی هەیە. ئەندەرسن ( Benedict Anderson ) ئەم جۆرە ناسیۆنالیستە خوێنگەرمانە لە ناسیۆنالیزمێکی سەرگەردانـدا دەبینێتەوە و پێیوایە دەتوانن دەستبخەنە سەر گەشەکردنە نوێباوەکان، بەڵام ناتوانن یەک هەنگاو چییە بۆ پێشەوە برۆن( Anderson,1991).

هەندێ لەم پرۆلاتینییانە، بۆ ئەوەی سەرنجی کوردانی نەتەوەپەرست و ناسیۆنالیست بەلای خۆیاندا رابکێشن، بەمەبەستەوە نەقیزە لە کۆمەڵێ هەست و نەستی خەفەکراوی گەلی کورد دەژەنن، کە گوایە زمانی کوردیی( کرمانجیی ناوەڕاست) ، بەسکریپتی عەرەبیی دەنووسرێ و باشترە لێیان دوورکەوینەوەو حوشترەکان و کتێبەکان و سکریپتەکەیان بدەینەوەو بە پەژراندنی سکریپتی رۆمانیی ( لاتینیی)، بەیەکجاریی لەدەستیان رزگارمان دەبێت. هەروەها هەندێکیان بە بیانووی دژایەتییکردنی ئایینی ئیسلامەوە، دەیانەوێ سێکیولاریزیم بکەنە چەترێک، ئەوانەی لەباوبۆرانی پانعەرەبیزم و پانیسلامیزم پڕبوونە بە مەمەمژەی سکریپتی لاتینیی دڵیان بدەنەوە.

ئەم شەپۆلی جینگۆیزمی jingoism کوردیی و جینگۆیزمی لاتینییە، زۆر نەدانانەو زۆر نەزانانە دەست بۆ ئەم پێشەسازییە کەچە دەبەن، لە درۆ و

دەلەسەو چێکردنی چیرۆکی بێ بناغەدا دەستوپێ رەنگینن. ئاخر ئەم زینەفوبە xenophobe کوردستانییانە، زۆر لەوە نەدانترن کە فێری ئەوە بکرێن، سکریپتی عەرەبیی لە بنەچەدا سکریپتێکی ئارامییە Aramaic ، سکریپتی عەرەبیی دەگەرێتەوە بۆ سەدەی یەکەمی زایین، ئەوکاتەی نەبەتییەکان (Nabataea's – الأنباط) لە باکووری عەرەبستاندا دەژیان، سکریپتی ئارامییان وەرگرت( Negev 1986). ئارامیی کۆنیش گەشەی کردووەو خۆی لە زمانی عیبرییدا بینیوەتەوە. ئەو ئارامییەی عەرەبەکان وەریانگرت لە لقێکی عیبرییەوە نزیک بوو. ئارامیی بۆخۆیشی بەشێکە لە گرووپی سامییەکان Semitic و مێژووی چەندین هەزار ساڵەی لە سکریپتدا هەیە ( ibid ).

فارسەکان بەو هەموو مێژووە پڕ لەشکۆمەندییەیانەوە، کاتێ لەرووی سەربازییەوە لەسەردەستی عەرەب و لەشکری ئیسلام شکستیان خوارد، سکریپتی نەستەعلیقیان(Nastaleeq ) لە عەرەب وەرگرت و بە جوانترین هونەریش گەشەیان پێداو کەسیش منگەمنگی ئەوە ناکات لە میراتی عەرەبەوە بۆیان هاتووە( Muhammad, 1991 ). ئەو سکریپتەی کوردیش بەکاری دەهێنێ تێکەڵەیەک لە سکریپتی فارسیی و عەرەبییە، یان وەک شاکەلیی دەڵێت فارسیی- عەرەبییەکی دەستکارییکراوە ( شاکەلی،1990 ) بەکارهێنانیشی نەک شەرم نییە، بەڵکو ئەوە یاسای گەشەکردنی سروشتیی زمان و گەل و نەتەوە جۆراوجۆرەکانن کە لە نزیک یەکترییەوە ژیاون، چ بەشەڕ یان بەئاشتیی، بەسەریەکیانەوە هەبووە ئاڵوێریان بە کولتوور و رۆشنبیریی یەکترەوە کردووە، بە سەپاندن بووبێت یان بە سروشتیی . بەدڵنیاییشەوە ئەوەی بەدرخان کردی لە بەکارهێنانی سکریپتی لاتینیی ، ئێستا دەیبینین کە ئەم جیاوازییانەی نێوان ئەم دوو دایەلێکتە سەرەکییەی چەند گەورەتر و قووڵتر کردووەتەوە. چونکە بەدرخان کارەکەی زۆر تاکڕۆییانەو سەرەڕۆیانەو چاولێکەرییانە بوو. لە یەک رستەدا بەدرخان قاچی لەئاوێک خست کە ئەتاتورک رشتبووی.

ژاپۆنییەکان و ڤێتنامییەکان سکریپتی زمانەکەیان لە چاینییەکانەوە وەرگرتووە، ئۆردو لە فارسەکانەوەو ئەوانیش بەشێوەیەک لەشێوەکان لە عەرەبەکانەوە. ( Halliday,2003). ئەگەرچیی دواتر ڤێتنامییەکان سکریپتەکەیان کرد بە سکریپتی رۆمانیی( لاتینیی)، بەڵام هیچ کاتێک نە

ژاپونییەکان و نە ڤیتنامییەکان و نە ئوردوییەکان ئەمە بە لەکە نازانن و بگرە بە رابردوویەکی خۆیانی دەزانن بەباش و خراپەوە کردوویانە بە سکریپتی زمانی ستاندەردی نەتەوەکانی خۆیان. کەچیی پانکوردیستەکانی ئێمە، دەیانەوێت بە هەڵەکەی بەدرخاندا بمانبەن و قاچمان بخەنە ناو ئەو ئاوەی تۆرانیزم رشتی، هەموو مەبەست و ئەجێندا سەرەکییەکەشیان، لە رەگەزپەرستیی و ناوچەپەرستیی و دایەلێکتچییەتییەوە سەرچاوە دەگرێ و کرۆکی مەبەستەکانیشیان ئەوەیە، لە داهاتوودا کرمانجیی ناوەراست لە بۆتەی کرمانجییدا بچووک بکەنەوە، چونکە بەشێک لەم پانکوردیستانە، ئەوەندە خراپ بیردەکەنەوە، کە کرمانجیی ناوەراست هەر بەکوردییش نازانن. وێرای ئەوەی ئەم نووسینە بڕوای وایە کە هەر دایەلێکتێ بکرێ بە بناغەی زمانی ستاندەردی کوردیی گرنگ نییە، بەڵکو پرۆسێسە زمانەوانیی و کولتوورییەکانی تێکستی ئەو زاراوەیە گرنگە.

## لە زمانەوە دایەلێکت پێچەوانەی ستاندەردە

جیاوازیی نێوان زمانی ستاندەردو دایەلێکتەکان، بەشێوەیەکی سەرەکیی لە "فەنکشنی function سوسیۆکولتوورییدا خۆی دەبینێتەوە" ( Marle,1997,p.13 ). ئەم جیاوازییانە مەرج نییە لە جیاوازییە سیستماتیکییەکانی نێوان ئەم دوو لایەنەدا بێت، بەڵکو لە رەنگدانەوە و کارکردی ئەم دووانەدایە لە جیاوازییە سۆسیۆکولتوورییەکاندا. زمانی ستاندەرد دەکرێ بڵێی پیشەسازیی تێدایە، چونکە وەک دایەلێکت هەرگیز تەواو سروشتیی نییە، بەڵام دەستکردیش نییە بەو ئاقارەی کە بە شێوازێکی نامۆ چێکرابێت. زمانی ستاندەردی نووسین، لەدەرەوەی ویستی دایەلێکتەکان ، لە هەندێ تایبەتمەندیی "سروشتی زمانیی و دەنگ و رەنگی زمان و تەنانەت هەندیجار لە کۆنتێکستی سروشتیی دایەلێکتەکانیش دادەشۆرێت" ( ibid, p.15).

زمانی ستاندەرد کە زمانی سەرەکیی نووسین دەبێت، مەرج نییە زمانی ئاخافتنی تاک و کۆمیونیتییەکان بێت، زۆر زمانی ستاندەردی نووسین هەیە هەرگیز بەشێوەیەکی بەربڵاو ئاخافتنی پێنەکراوە. بۆ نموونە زمانی هۆڵەندیی

، Dutch )، تا سەدەی نۆزدەیەم نەبووەتە زمانی سەرەکیی ئاخافتن، سەرەڕای ئەوەی پیشتریش زمانی ستاندەردی نووسین بووە( Wexler, 1993 ). کەواتە ئەم پرۆسیسە ئەگەر پاش و پیشیشی تێ بکەویت، سەرئەنجام هەر دەمانباتەوە سەر ئەوەی، ئایا چەند گرنگە زمانی فەرمیی و ستاندەردی نووسینمان هەبێت. هاوکات زمانی سەرەکیی نووسین، مەرج نییە دایەلیکتەکان وەک زمانی دایک بەکاری بهێنن. چونکە هەر کاتیک زمانی ستاندەرد بەفەرمیی لەلایەن دەسەلاتی سیاسیی یان هەر چەشنە دەسەلاتیکی ترەوە کە قورسایی جیکەوتکردنی هەبێ، کاری پێکرا و گەشەی کرد، تەواوی دایەلیکتە جیاوازەکان، بەشێتەیی و بە تێپەڕبوونی کات، دەکەونە ژێر هێجەمۆنیی زمانی ستاندەردەوە ( Marle,1997 ). چونکە زمانی ستاندەرد و بەتایبەتیش لینگوا فرانکای نووسین خۆی خۆی دەڕازێنێتەوە ( embellishment) و ئاگایانە پەلوپۆ دەهاوێ (ibid, p.29). ئەمە راستییەکی زەقمان پێ دەلێت، کرمانجیی ناوەڕاست توانیتی لە رابردوودا ئەم پەلوپۆیە بهاوێژێ، بەلام کرمانجیی نەیتوانی و دواکەوت.

زمانی ستاندەردو فەرمیی، کۆمەلێ سیمیۆتیک (زمانی نیشانە- semiotic )ی ستراتیژیی بۆ دامودەسگاکان و پرۆسیسی خوێندن و ئەدەبی نووسراو دەهێنێت، ئەم ستراتیژییە زۆرتر دەردەکەوێ کاتێ ئەدگاری میتافۆرە ریزمانییەکان لە بەکارهێنانەکاندا جێگیرتر دەبن و لیرەشەوە سیمانتیکی زمان دەرگای تری بەسەردا دەکریتەوە( Halliday, 1998 ). ئەم بۆچوونانەی هالیدەی کتومت لەگەل سیمیۆتیکە ستراتیژییەکانی زمانی کوردیی ( کرمانجیی ناوەڕاست) دا جووت دەبێ. کێ هەیە ئەوە نەبینی کە سیمانتیکی کرمانجیی ناوەڕاست و میتافۆری ریزمانییەکەی لەچاو کرمانجییدا، لەچ گەشەیەکی سەرسووڕهێنەردایە.

"هەمیشە ئەو مۆدێلە دەکرێ بە بناغەی زمانی ستاندەرد، کە لەنووسیندا برەوی هەیە" ( Cheshire,1997,p.79). ئێستا نەک کرمانجیی ناوەڕاست برەوی هەیە، بەلکو کرمانجیی لە ئاست کرمانجیی ناوەڕاستدا، لە کێلگەی نووسیندا، هەر گوناهە بەراوردیش بکرێ. ئەم توێژینەوەیە لەو بڕوایەدایە، بەهەموو کرمانجییزانەکان و نووسەرەکان و توێژەرەوەکان و زمانزانەکانی ئەم دایەلیکتەی کوردیی، بەئەندازەی چاپخانەی "مەچکۆی" هەولیر، شارۆچکەی

هەلەبجە، شارۆچکەیەکی کەرکوک، نووسەرو ئەدیب و خەمخۆری زمانی کوردیی لە منداڵدانی بەرنەبووەتەوە. ئەوە لەشارێکی وەک سلێمانیی بگەڕێ کە قەڵای زمانی نووسینی کوردییە. جگە لە کوردستانی رۆژهەڵاتیش کە ناکرێ رۆڵی ئەدەب و هونەرو تێکستی کوردیی ئەوانیش لەبەرچاو نەگیردرێ.

ئەندەرسن، لە "Creole Pioneers" باسی ئەوە دەکات بۆ هەندێ نەتەوە زمان نابێتە ئەو توخمەی کە جیاوزایی دروست بکات لە حەزو خولیا بۆ وڵاتی دایک(Metropoles) ( Anderson, 1991,p.47). ئەم شیکردنەوەیەی ئەندەرسن، زۆر راستیی تێدایە،زۆرێک لەوانەی بەسۆرانیی ناسراون، چ بەگرتنی و چ بەبڵاوبوونەوەی دەرمانخواردکردنی عەبدوڵا ئۆجەلان، بەقوڵپ دەگریان، بە دڵنیاییشەوە ئەوەندەی کوردەکانی کوردستانی باشوور و رۆژهەڵات پەست و قەڵس بوون بە سووکایەتییکردنەکانی بە ئۆجەلان دەکرا، کوردەکانی باکووریش هەر ئەوەندە پێشیان خواردوەتەوە. لەکاتێکدا عەبدوڵا ئۆجەلان نەکوردیی کرمانجیی و نەکرمانجیی ناوەڕاستیش ئەوەندەی تورکییەکە دەزانێ. بگرە نووسینەکانیشی هەر بە تورکیی نووسراون. ئەوە جگە لەهەڵوێستە سیاسییە سەیروسەمەرەکانی، کەواتە گوناهێکی کومیدییە، لەبەر ئەوەی ئەوان کوردی رەسەنن! چاومان لە زمانزانەکانی کوردستانی باکوور بێت. ئەم خۆهەڵواسینەی هەندێ پرۆلاتینیی و پرۆکوردستانیی بە زمانزانە سەیرو نەبووەکانی کوردستانی باکووردا بۆچیی؟، ئاخر ئێمە گفتوگۆ لەسەر دیفاکتۆیەک دەکەین کە کوردستانی باشووری پێدەگوترێ، هەرێمی کوردستانی عێراقی پێدەگوترێ.

بەدڵنیاییەوە زۆرینەی رەهای کرمانجییەکان هەر کوردییش نازانن و هێشتا لەماڵیشەوە بە تورکیی دەئاخفن، تەنانەت کوردەکانی تاراوگە، لە ئەوروپاو ئەمێریکا و ئوستڕالیاشن، هەر بەتورکیی دەئاخفن. باشە بۆ دەبێ باجی ئەم خەمساردیی و کوردیی نەزانییەی کرمانجییەکان، هەرێمی کوردستانی باشوور و کوردستانی رۆژهەڵات بیدات. ئایا دەکرێ دەیان ساڵی تریش چاوەڕێی نووسەران و ئەدیبانی کرمانجی ژووروو بین تا فێری کوردیی و نووسینی کوردیی بن و ئەوسا بێین باسی زمانی ستاندەردی کوردیی بکەین. ئەوسا بێین لینگوا فرانکای کوردیی چێبکەین. چونکە ئەوان زۆرینەن و کرمانجیی ناوەڕاست کەمینەیە. قوڕ بەسەر کورد بۆ بەفەرمیی ناساندنی زمانی

ستاندەردی کوردیی، چاوەڕێی ئەم شێرو ڕێوییە بێت. جگە لەوەی کۆی ئەو باسە سیاسییانە، لەگەڵ دیفاکتۆکاندا ناگونجێ.

## کوردستانی گەورە، یۆتۆپیای کوردستانییان

بەبیستنی کوردستانی گەورە، موچوورکە بە لەشی مرۆڤدا دێت، ئەگەر تۆزقاڵێک شارەزایی لەسیاسەتی نێودەوڵەتیی و ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین بێت. زۆر هەن خەون بەوەوە دەبینن کە کوردستانی گەورە زۆر نابات دێتە دی. بەڵام ئایا بەڕاستیی لە ڕووی نەتەوەییشەوە، کوردستانی گەورە، کێشەی سەرەکیی تاکی کورد و کۆمەڵگەی کوردییە، یان دەستەبەرکردنی مافە کولتووریی و نیشتمانییەکان ئەرکی سەرەکیی و هەنووکەییە. با لە جیاتی کوردستانی گەورە، چەندین وڵات و وڵاتۆکەمان هەبێت و ناویان کوردستانی هێن و وانێک بێت. جارێ بۆ خاتری ئاهورامەزدا، هێشتا هەرێمۆکەیەکمان هەیە بەدەست ٤٠ ساڵ شەڕی نێوخۆوە دەتلێتەوە، جارێ هێشتا هەر بەناو دەڤەری بادینان و سۆران یەکیان گرتووەتەوە، لەولاشەوە، حیزبی دیمۆکراتی کوردستان و کۆمەڵە دوولەت و سێ لەت دەبن. بەپێی ئەم پرۆسێسە کیسەڵییە بێت، دەیان ساڵی تریشی دەوێت، هەرێمی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان، ببێتە هەرێمێکی چوونیەک و سێبەری حیزب و بنەماڵەو بەرەبابی بەسەرەوە نەمێنێت. ئەوە ئەگەر هەر هیچی پێچەوانەش ڕوونەدات.

هەندێ نووسەری پانکوردیی و پانسکریپتی- لاتینیی پەیدابوونە، لە ناڵیش و لە بزماریش دەدەن. لەلایەکەوە لەسەرۆکایەتی هەرێم دەپاڕێنەوە بۆ ڕەتکردنەوەی زمانی ستاندەردی کوردیی ، لەلایەکی تریشەوە هەڕەشەی یاخیبوون و پەرچەکرداری بەدرخانییانە دەکەن. لە سەنگەری بەرامبەریشیاندا، ئەوانەی بە عەشق و خۆشەویستیی و ئیمۆتیڤەوە دەیانەوێ زمانی ستاندەردی کوردیی "کرمانجیی ناوەڕاست" بکەنە دیفاکتۆ، چەکی دەستیان هەر پاڕانەوەیە. هاوکات ئەوانەی بە کوڕسالاریی لە باوکسالایی سەرۆکایەتی هەرێم و حکومەتی هەرێم و حیزبە دەسەلاتدارەکانی کوردستان دەڕوانن، گوایە ستەمێکی گەورە لە بادینانییەکان دەکرێ ئەگەر زمانی کوردیی( کرمانجیی

ناوەڕاست) بکرێ بە زمانی ستاندەرد و لینگوا فرانکای فەرمیی، ئەمانە جگە لە ئەفسانەتاشین و رەگەزپەرستیی و ناوچەپەرستیی و خۆجیاکردنەوە نەبێت، ئاکارەکانیان هیچ شیکردنەوەیەکی لۆژیکی تر هەڵناگرێ.

بەپێی ئەنسرۆپۆلۆجیی زمان، زمانی ستاندەرد دروست ناکرێ، بەڵکو زمانی ستاندەرد لەرووی سیاسییەوە لە ئەنجامی بەفەرمیکردنی زمانەوە دەبێت و دواتریش خۆقایمکردنی لەناو کولتوور و ئەدەب و چاپەمەنیی و راگەیاندنەکانەوە دەبێت. زمانی کوردیی ئەم قۆناغانەی هەمووی بڕیوەو، هیچ هێزێک ناتوانێ بەر بەم پێشکەوتن و گەشەکردنەی کرمانجیی ناوەڕاست بگرێ. ئیتر ئەم پاڕانەوەو خۆلکردنە بەسەر خۆدا، جگە لە زیانی زۆر گەورە بە زمانی کوردیی، هیچ دەستکەوتێکی تری لێ ناچنرێتەوە.

سەیری ئەم دەردە کوشندەیە بکە، هەندێک لە زمانزان و زمانەوان و نووسەرەکانی دهۆک ئامادە نین، هیچ لێدوانێک بدەن ئەگەر بە زاراوەی ناوچەکەی خۆیان، بۆچوونەکانیان بڵاونەکرێتەوە( ریپۆرتاژ لەلڤین ٥٦). بەڵام لەشەقەی باڵ دەدەن لە خۆشییدا ئەگەر ژۆرنالیستێکی عەرەب یان تورک،هەڤپەیڤینیان لەگەڵدا بکات و هەرگیزیش ئەو شەکرە ناشکێنن، بڵێن بەکرمانجی ژووروو بڵاوی بکەنەوە. ئیتر چاوەڕوانی چیی لەم دڵسۆزانەی کورد دەکرێ. ئەگەر ئەو پرسیارە بورووژێنرێ و بڵێین، برایینە، ئەوە بۆ لەسەردەمی بەعسدا بە گەشکەوە زمانی عەرەبییتان پەژراندو ئەو هەموو زارۆکە جوانکیلەیەی بادینانتان بەزمانی عەرەبیی لەخوێندندا پێگەیاند؟ وەڵامێکی دروست نادەنەوە.

بۆچیی پرۆژەکەی هاشم عەقراویی ( ئاکرەیی) تان پەسەند کرد و زمانی کوردییتان بەلادا خست و زمانی شیرینیی عەرەبییتان نۆشکرد؟، ئەی ئێستا وەک سیمبۆلێکی یەکێتیی نەتەوەیی بۆ نایەن مل بدەن بە دیفاکتۆی هەلومەرجەکە و زمانی ستاندەردی کوردیی بپەژرێنن؟ بۆچیی لەبری کەمپەینی واژۆکۆکردنەوە دژی کرمانجیی ناوەڕاست، بەهەموو لایەک هەوڵنادەن لینگوا فرانکای کوردیی چێبکەن. ئەوسا دەتوانن پتر لەنیوەی ئەو زمانە بە خەزینەی کرمانجیی ژووروو رۆبنێن و دەولەمەندیی بکەن. ئایا ئەم خۆڕاپسکان و کەمپەین بەرێخستنانە دەچێتە گیرفانی ' کێ' وە. ئایا دەزانن سەردەمی

قوتکردنەوەی "بزاڤ" ی بەعسی بادینانیی لەهەمبەر"ئاسۆ"ی بەعسی سورانییدا نەماوە.

بناغەو کۆنتێکست و ستراکتۆری زمانی ستاندەردی کوردیی، هەموو شتێکی ئامادەیەو تەنها ددانپێنانی سیاسیی دەوێ. ئەو کۆنسێپتەی ( Trevor Hill) لە سەر زمانی ستاندەرد بەکاریهێناوە بە "Institutional Linguistics" ناوزەدی کردووە( Hill,1958 )، بۆ ئێستای لینگوا فرانکای زمانی کوردیی دەقاودەق دروستە. ئەم بەداموودەسگاییکردن و چەسپاندنەی زمانی کوردیی( کرمانجیی ناوەڕاست) لە پرۆسێسێکی دوورودرێژی خوێندن و بەکارهێنان و نووسین و ستراتیژیی نەتەوەیەکدا بەسروشتیی گەشەی کردووە. تەنها بەرچاوڕۆشنیی سەرکردەیەکی کاریزمای دەوێ بۆ بە فەرمیی ناساندنی زمانی کوردیی( کرمانجیی ناوەڕاست) ئەم بڕیارە سیاسییە بدات. بەڵام لەگەڵ ئەم سەپاندنی زمانە فەرمییەشدا، باشترە لە هەرناوچەیەک کە خوازیاری پاراستنی دایەلێکتەکەیان ڕێگەیان پێ بدرێ ، دەست بە دایەلێکتەکەی خۆیانەوە بگرن و چاپەمەنیی خۆیان هەبێ، بەپێی ئارەزووی خۆیان، بەڵام ناکرێ بانگەشەی بوونی زمانی ستاندەردی نووسین بکرێ و لەبواری خوێندنیشدا، گەرەلاوژەی دایەلێکتەکان درێژەی هەبێ. بەواتایەکی تر، پرۆگرامی خوێندن و زمانی ئۆفیشەڵ دەبێ ستاندەرد بێ و لەدەرەوەی ئەم سیستەمەش هەرچی دەنووسرێ و دەگوترێ، زمانی ستاندەرد باکی پێی نییە.

شتێکی بەڵگەنەویست، یەکێ لەهەرە فاکتەرە سەرەکییەکانی ئەوەی گەلی کورد بەم ژمارە زۆرەیەوە، وڵاتی سەربەخۆی نییە، نەبوونی یەکڕیزیی و تەباییە. ئەم خۆخۆریی و لووتبەرزییە لەئاست یەکترداو سەرشۆر لەبەرامبەر نەتەوەکانی سەردەستدا، مێژوویەکی دوورو درێژیی هەیە و ئێرە جێگەی باسی نییە. بەڵام ئەو زمانزان و زمانەوانە کوردانەی بەلاتینیی و بەزۆرینەی کرمانجی ژووروووەوە گرتوویانە بۆ لەمپەردروستکردن لەبەردەم ستاندەردبوونی کرمانجیی ناوەڕاستدا، هەمان ئەدگارەکانی میرنشینە کوردەکانی سەدەکانی پێشوو، بەبیر دەهێننەوە. تەنها جیاوازییەک هەبێ لێرەدا ، میرە کوردەکان تا پاتاڵ و ناوچەکەی خۆیان بوەستایە، هەموو گیان و سامانی کوردیان بەقوربانی ئەوانەی خۆیان دەکرد. ئێستاش ئەم پانکوردیستە دایەلێکتپەرستانە،

زاراوە لۆکالییەکەی خۆیان لەسەروو لینگوا فرانکای کوردیی و چارەنووسی هەموو گەلی کوردەوە دەبینن.

با فێربین لە ئەزموونی گەلانی دنیاوە، زمانی گالیزیا(گالیکا، گالیکۆ یان گالیسیا - Galicia) وەک زمانێکی رۆمانیی، لە رووی ترادیسیۆنەوە لقێک لەلقەکانی زمانی پۆرتوگالیی بوو ، ئایا لە هەرێمێکی ئیسپانیادا، چۆن بوو بەزمانی ستاندەردی ئەو هەرێمە؟ لە حەفتاکانی سەدەی رابردوودا، باس هاتە سەر ستاندەردایزی زمان، ئایا زمانێکی سەربەخۆ چێبکرێ لە گالیسیا؟ یان پۆرتوگالیی بە بناغەی زمانێکی ستاندەرد دابرێژرێت( Cheshire and Stein, 1997). لەسەرەتای هەشتاکاندا، زمانی کاستیلیان (Castile) لابردو بە پشتبەستن بە دایەلێکتێکی هاوبەشی( کۆمۆن) گریکیی لەچەشنی کۆینێ ( کۆینیی- _koin )، و ئەزموونی گەلانی دەوروبەر زمانێکی سەرتاپا ستاندەرد و فەرمییان ناساند( Normas_.,1982). سەرئەنجام لە ساڵی ١٩٨٣دا، گالیزیا بەفەرمیی بەزمانی ئەم هەرێمە ئۆتۆنۆمەی ئیسپانیا بوو. هەموو ئەو کەسانەی لەو دەڤەرەدا دەژیان و ئیسپانیۆل زمانی زگماکیان بوو، بە هێمنیی و لەسەرەخۆیی، سەپاندنی ئەم زمانەیان پەژراند و ئێستا هیچ گرفتێکیان نییە( Cheshire and Stein, 1997). بەڵام کاتێک دێتە سەر بەفەرمیی ناسینی بناغەی زمانی کوردیی ( کرمانجیی ناوەراست) وەک زمانی ئۆفیشەڵی ستاندەردی کوردیی، تیرمۆمەتری رەگەزپەرستیی ناوچەیی بەرزدەبێتەوە و قوڵپ دەدات. ئەوە ئەگەر باسی سەپاندنیش بکەی، هەزار و یەک بیردۆزی فەلسەفیی پووچت بۆ دادەتاشن و بەعەرەبپەرست و فارسپەرست و سۆرانییپەرستت دەخوێننەوە.

چۆن زمانی گالیکی کۆینایزەکراو( koin_zation ) بوو بە زمانی لینگوا فرانکای هەرێمی ئۆتۆنۆمی گالیکییەکان، بەهەمان شێوەش، دەکرێ زمانی فەرمیی و ستاندەردی کوردیی، یان بێئارێشەتر، لینگوا فرانکای کوردیی، سۆرانییزە و کرمانجییزە بکرێ( Cheshire and Stein, 1997). مەبەست لە سۆرانییزەکردن ئەوە نییە، سەد لەسەد دایەلێکتەکانی تر فەرامۆش بکرێن، بەپێچەوانەوە، مەبەست ئەوەیە بناغەکەی بەسۆرانیی رۆبنرێ ( دەمێکە رۆشنراوە)، کرمانجییزەش بەواتای ئەوەی وشەو دەربڕینە کرمانجییەکان تانوپۆی ئەو زمانە داپۆشن. هاوکات هەموو زاراوەکانی تری تێ

هەلترینجینری. بەلام بەتیکەلکردن نا، بەلکو بە موتوربەکردن، چونکە ناکری جاریکی تر بناغەی پتەوی کرمانجیی ناوەڕاست هەلبوەشینریتەوەو بەکرمانجیی چیبکری. هاوکات لەدریژ ماوەدا، کرمانجیی ناوەڕاست رۆژ بەڕۆژ موتوربە بکری بە سیمانتیک و سینتاکسی دایەلیکتە جیاوازەکان و دەولەمەند بکری. هەر ئیستا زۆر لەنووسەرانی کورد، ئەم پرۆڤەی موتوربەکردنە دەکەن و لە کۆنتیکستی نووسینەکانیاندا، سەدان وشەی تایبەت بەزاراوەی کرمانجیی، لە کرمانجیی ناوەڕاستدا جیدەکەنەوەو کە بەدلنیاییەوە کاریکی باشەو داهاتوویەکی گەشی دەبیت. کەچیی بەداخەوە ئەمە کەمتر لەنووسینی کرمانجییەکان و بادینانییەکاندا دەبینری. عەرەبیی وتورکیی بەکاردەبەن، بەلام کەمتر حەزیان بە کوردیی ( کرمانجیی ناوەڕاست ) هەیە.

ستاندەردایزی هەر زمانیک، گومانی تیدا نییە، دەبی هەندی دایەلیکت قوربانیی بدات بە دایەلیکتیک یان چەند دایەلیکتیکی تر، چونکە پرۆسیسی بەستاندەردکردن بەپیی زانست و لیکۆلینەوەی زمانەوانیی دەرکەوتووە هەمیشە چەند دایەلیکتیک دەبنە قوربانیی و دانەیەک سەرکەوتن بەدەست دەهینیت ( Wanner, 1997). ئیستا کرمانجیی ناوەڕاست خۆبەخۆ ئەم سەرکەوتنەی بەدەست هیناوە، کورد چونکە گەلیک بووە هەمیشە خۆی قوربانیی بووە لەهاوکیشە سیاسییەکاندا، دایەلیکتیک ئەگەر قوربانیی بدات بۆ یەکیکی تر، پیی سەختەو بۆی هەرس ناکری. ئەمە بەشیکی رەنگە پیوەندیی بە مۆرالی سیاسیی و سۆسیۆکولتوورییەوە بیت، بەلام بەشی سەرەکیی لە دەروونرەشیی و خۆپەرستیی و هەلپەرستییماندایە. باشە شکۆمەندیی کورد دەکەویتە ژیر پرسیارەوە! ئەگەر ئیلیتە رۆشنبیرو زمانزانەکانی دایەلیکتەکانی تر، بلین بەلی بۆ زمانی ستاندەردی کوردیی ( کرمانجیی ناوەڕاست) ،بەلام دایەلیکتەکانی تریش بخەنە ناو پرۆسیسی دەولەمەندکردنی ئەم ستاندەردایزەوە. ئایاکوردستان ویران دەبی؟ کەرامەتی نەتەوەیی کورد دەچیتە ژیر پرسیارەوە! میژووەکەمان بزر دەکەین! ئەگەر ئەو زمانە ستاندەردەی هەنووکە بە شیوەیەکی فەرمیی و سیاسیی بپەژرینین.

## کارێکتەرە سەرەکییەکانی ستاندەردایزی کرمانجیی ناوەڕاست:

هەر زمانێکی فەرمیی و ستاندەرد، ئەگەر بە دۆخە سروشتییەکانی گەشەکردنی زماندا تێپەر بێت، ئەوا سێ جۆر پێوەندیی بناغەیی هەیە کە ڕاستەوخۆ بەندن بە کاریکتەرەکانی ستاندەردبوونی زمانەوە ( Milroy,2000 ). زمانی کوردیی ئەم کاریکتەرانەی میلڕۆی باسی دەکات، بەمشێوەیە تێیدا بەدی دەکرێت.

١- باڵادەستیی کوردیی (کرمانجیی ناوەڕاست)، بەهۆی ستراکتۆرێکی پتەو و پلەیەکی بەرز لە گەشەکردن لە ئاست گاکۆلکێی کرمانجییدا. هەر ئێستا کوردیی سۆرانیی لە ئاستێکی ئایدیالییدایە لەچاو گەشەو توانستی کرمانجییدا.

٢- فەنکشنی زمانی کوردیی( کرمانجیی ناوەڕاست) ، لە دێرەوە تا هەنووکە، لە فۆرمێکی نووسینی باڵاترو دەوڵەمەندترو بەهێزتردا بووە. ئەگەرچیی لەسەرەتادا کرمانجیی هەنگاوی باشی نا، بەڵام دواتر لە شوێنێکدا چەقی، تا ئێستاش لەهەمان شوێندایە.

٣- وەک پێداویستییەکی ستاندەردیی زمان و لینگوا فرانکای کۆمۆن، کرمانجیی ناوەڕاست توانیویەتی پێ بەپێی ئاڵوگۆڕە سیاسیی و کولتووریی و ڕۆشنبیرییەکان، کاژی کۆن فڕێ بدات و کاژی نوێ بهێنێتەوە. زمانی کوردیی ئەمێستا، ئاسمان و ڕێسمانی جودایە لەچاو زمانی کوردیی سەرەتای سەدەی ڕابردوودا، باشترین نموونەش، نووسینە پڕ لەداتاکەی گەورە مێژوونووسی کورد، ئەمین زەکی بەگە، بەبەراورد بەزمانی ئێستا هەر مرۆڤ واقی وڕ دەمێنێ کە ئەم زمانە چۆن ئەم گەشە زۆرەی کردووە. تەنانەت ئەم نوێخوازییەی ئێستای کرمانجیی ناوەڕاست، لەگەڵ حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی پێشووشدا هێشتا هەر گەشەیەکی سەرسوڕهێنەری پێوە دیارە.

مەرج نییە زمانی ستاندەرد، زۆرینە بەکاری بهێنێ، بەڵکو باڵادەستیی و شکۆمەندیی ( پریستیژ- prestige ) زمان گرنگیی هەیە ( Milroy, 2000). لە هەلومەرجی ئێستادا، لەئەنجامی پرۆسێسێکی دوورو درێژو قوربانییەکی

زۆر و ئەدەبێکی شۆڕشگێرانەو گیانی یاخیبوونێکی زۆرەوە، کرمانجیی ناوەڕاست کاتەگۆرییەکی کۆمەڵایەتیی و ستراکتۆرێکی بەهێز و یەکپارچەی بەرهەم هێناوە( ibid). جا ئەوەی کرمانجیی ناوەڕاست کەمینەیەو کرمانجیی زۆرینەیە، تەنها لە ئۆربیتالّی پانلاتینیی و پانکرمانجییەکاندا وڕێنەسازیی دەکات. چونکە ئەم کاتەگۆرییە کۆمەڵایەتییەو ئەم ستراکتورە بەهێزەی کرمانجیی ناوەڕاست، ئەوەندەی تر بازووی ستاندەردیی بەهێزتر دەکات. بەواتایەکی تر، زمانی ستاندەرد ، دەبێ بناغەکەی و گیانە سەرەکییەکەی، زمانی پریستیژ بێت. بۆ کوردیش زمانی پریستیژ تەنها و تەنها کرمانجیی ناوەڕاستە. ئەمە لە روانگەی پانسۆرانییەوە نییە، بەڵکو مێژووی ئەدەبی کوردیی و تێکستی کوردیی و قورسایی سیاسیی و کولتووریی کوردیی کرمانجیی ناوەڕاست، ئەم پریستیژبوونەی پێ رەوا دەبینێ.

ستاندەردایزی کرمانجیی ناوەڕاست ئەگەر وەک تاکە دایەلێکتی باووباپیر ( Single Ancestor Dialect – SAD ) ی ئەدەبی بەرخۆدان و بەگژداچوونەوەو دنیای نووسینیش سەیری نەکەین(Hope, 2000 ) ، بەڵکو تەنها وەک تاکە دایەلێکتیکێکی کاراو خاراوی کوردیی سەیری بکەین، هێشتا بە باشیی جێگەی خۆی کردووەتەوەو بە چنگەکرێی خۆیشی ئەم پریستیژبوونەی مسۆگەر کردووە. چونکە ستاندەردبوونی کوردیی( کرمانجیی ناوەڕاست) لەنزیکەوە پێوەندیی راستەوخۆی بەو هەموو تێکست و نووسین و مێژووە دووروودرێژەوە هەیە، چ لە ژانرە(genre) ئەدەبیی یان لە فەنکشنە کۆمەڵایەتییەکاندا خۆی کردووە بە لینگوا فرانکاو نمایشی کردووە ( Rissanen, 2000).

زمانی ستاندەرد ئەو زمانەیە پانوپۆڕ بووەتەوە یان دەبێتەوە، ستاندەردایزیش، بەواتای کەمکردنەوەو لەقاڵبدانی دایەلێکتەکانە و پاککردنەوە وهەڵبژاردنی دایەلێکتێکی باڵادەستە لە نێو زۆروبۆریی دایەلێکتە کەچ و دابڕاو و کەمکارپێکراوەکاندا( Hope, 2000). دەکرێ ئەم هەڵبژاردنە چەند دایەلێکتێک لەیەک کاتدا بگرێتەوە، بەڵام زۆر بنچینەییە کە دەبێ ئەدگارەکانی خۆیان لە بۆتەی ئەدگاری زمانی ستاندەردا بتوێننەوە( ibid).

یەکێک لە تایبەتمەندییە بنچینەییەکانی گەشەکردنی زمان بەرەو ستاندەردبوون، "گەشەی نووسین و ستراکتۆری نووسینە، هاوکات ئەم گەشە

هەمەلایەنەیە، مۆرفۆلەجی morphology و فەنۆلەجی و سینتاکسی زمانەکەش دەگریتەوە" ( Wright,1996,p.113). ئەم گەشەکردنانە لە زمانی کوردیی (کرمانجیی ناوەڕاست)دا، بەتایبەت فەنۆلەجی و سینتاکسی کرمانجیی ناوەڕاست لەچاو دایلێکتەکانی تردا، لێی دەڕژێتەوە.

ستاندەردایزی کرمانجیی ناوەڕاست بەبڕیارێکی بیرۆکراتییانە نابێت. چونکە گەشەی زمان و ئەنسرۆپۆلۆجیای زمان، دژی ئەم بیرۆکراسییەن، بەڵکو ئەمە بڕیارێکی بەرینەو پانتانییەکی زۆر لە نووسەران و رۆشنبیران و ئێلیتە هەمە جۆرەکانی کۆمەڵگە، وێرای خەرمانی تێکستەکانی ئەو دایلێکتە بەشداریی تێدا دەکەن. بەڵام ئایا ئەگەر نێوەندی سیاسیی بڕیاری ستاندەردایزی کرمانجیی ناوەڕاست لە قۆناغە سروشتییەکەیەوە نەخاتە بواری جێبەجێکردنەوە، ئەوە کێیە بەرپرسیارە لەم خەرەکی نەبوونی زمانی ستاندەردە؟ کێ لەنەبوونی لینگوافرانکای کوردیی، لە زمانی پرێستیژی کوردیی بەشێوە سیاسیی و فەرمییەکەی بەرپرسیارە؟

ئەوە چییە وا دەکات، کۆمەڵێ نووسەری بادینان و یەک دوو نووسەری هەورامیی، خەریکی واژۆکۆکردنەوە دەبن! بۆ ئەوەی ئەم گەرەلاوژەیەی دایلێکتە کوردییەکان بەردەوام بێت. باشە بەبێ هیچ مەبەستێکی خراپ،ئایا ئەجێندای ئەمانەو ئەجێنداکەی هاشم عەقراویی ( ئاکرەیی ) و حیزبی بەعس، چ جیاوازییەکان هەیە؟ کە بادینان ئامادەبوون عەرەبیی بپەژرێنن، بەس کوردیی (کرمانجیی ناوەڕاست) نەخوێنن. ئەمە هەر حیزبی بەعس و هاشم عەقراویی لێی بەرپرسیار نین، بەڵکو بەشێک لە رۆشنبیران و نووسەرانی دەڤەری بادینان لەم ئەنتاگەنیزمەی antagonism نێوان ئەم دوو دایەلێکتەدا بەشی شێریان بەردەکەوێ.

ستاندەردایزی زمان پرۆسێسێکی (پرۆسیسێکی) دوورو درێژەو بە سروشتیی دەست پێدەکات، لە مەلۆتکەییەوە تا دەگاتە هەراشبوون، بەڵام سەرئەنجام پێویستی بەناولێنان و بە فەرمییکردنە. ستاندەردایز لە ئۆپەراسیۆنێکی سروشتیی دا خۆی دەگەیەنێتە ترۆپک، بەڵام گرفتی پێرسپێکتیڤیزمی(دیدی باشبۆچوون-perspectivism) بۆ دروست دەبێ ( Hope, 2000). ئەم تیروانینی پێرسپێکتیڤیزمە، هەرچەندە هەڵەیە ئەگەر بگوترێ باڵی سیاسیی و ئایدیۆلۆژیی ستاندەردبوونی زمانە، بەڵام یۆتۆپیای

داهێنان لە ستاندەردکردنی زماندا دەکوژێ ( ibid). ئێستا بەنائاگایی و لەپەنای پانکوردیزمـەوە، لـەپـەنـای ئـەی رەقیبـەوە، ئـەم پیرسـپێکتیڤیزمە لێـرەو لـەوێ سـەردەردەهێنێ و مـەبـەسـتەکـەش لـە ئـەنتاگـەنیزمـی کـوردیی (کرمـانجیی ناوەڕاست) دا کورت دەکرێتەوە.

میلرۆی وەک سکۆلارو ئەکادیمیستێکی زمانـەوانیی لە زمـانی ئینگلیزیدا، زۆر بـەوردیی قۆناغـەکـانی گـەشـەکـردن و سـتاندەردبـوونی زمـانی ئینگلیزیـی لـە چـەنـدین توێژینـەوەی دانـسقەو ورددا، شـرۆڤە دەکـات. لـەم هـەڵسەنگاندنـەدا، ریـسانینیش( Rissanenn ) هـاوڕای میلرۆیـە. ئـەوان هـەڵـدەسـتن بەدەستنیشانکردنی دایەکرۆنیکی (پرۆسێسی ئاڵوگۆڕی زمان بەتێپەڕبوونی کات diachronic ) زمان بەشێوەیەکی داینـەمیکیی، هـەروەهـا قامـک خـستنە سـەر کاتەگۆریی و ئەدگارەکانی زمـانی سـتاندەرد و چۆنییـەتیی بەفـەرمیی ناسین و کارپێکردنی (Milroy 1992, p.129 and Risasanen,2002) بەمشێوەیەی خوارەوە:

١- نیشانەکانی ستاندەردایزی زمان جێگیرە

٢- کاریگـەریی سـتاندەردبوون لـەسـەر زمـان، لـەپرۆسێسێکی دوورو درێژو ماوەیەکی دیارییکراوی بەکارهێناندا بەڕوونیی دەردەکەوێ.

٣-پاش ئەوەی زمانی ستاندەرد خۆبەخۆ لە بەڕێوەبردنی ژیانی جڤاکدا خـۆی دەسەپێنێ و باڵادەستیی خۆی نمایش دەکات. لەلایەن دەسەڵاتی سیاسییشەوە( political power) بەتۆبزیی دەسەپێنرێ.

٤- هەر کاتێکیش زمان لە کاری ئیدارییەوە، چووە فەنکشنەکانی ترەوە، ئیتر پرێـستیژبوونی خـۆی بـەشـێوەی فـۆرمێکی سـوودبەخـش و پـەیـامێکی بـاڵا دەگەیەنێت.

مـرۆڤ دڵـی بـەخـۆی دەسـوتێت، کـاتێ لـە کوردبـوونی خـۆی ورد دەبێتـەوە. نـەتـەوەیـەکی ٤٠-٥٠ ملیـۆنیی لـەسـەرەتـای سـەدەی بیـست و یـەکدا، هێشتا خاوەنی زمانی ستاندەردو لینگوا فرانکا نییـە( لـەڕووی سیاسییەوە)و هـەروەک ئەوەی لە هەسارەیەکی تردا ژیان بـەسـەر بـەرێت. لـەکاتێکدا بـەدەیـان هـەزار کەللە ئەستووری هەیەو هەریەکەو پۆست و پلەو پایەی زانستیی و ئـەکـادیمیی و رۆشـنبیریی خـۆی بـە پلـەیتـۆ( پلاتـۆ) ناگۆڕێتـەوە، کـەچیـی دەیـان سـاڵە ژمـارەیـەکـی کـەم لـە خـەمخـۆرانی زمـانی کـوردیی هـاوار دەکـەن و داوای

ستانده‌ردایزی زمانی کوردیی ده‌که‌ن، هیچ پیاویکی سیاسیی و هیچ حیزبیک ( کومه‌لگه‌ی کوردیی تا ئیستاش هه‌ر کومه‌لگه‌یه‌کی حیزبییه) و هیچ خودایه‌ک گوییان لی ناگری.

شیرپه‌نجه‌ی ئه‌م دوخه‌ش ته‌نها و ته‌نها چه‌ند دایه‌لیکتییه. ئایا کاتی ئه‌وه نه‌هاتووه کرمانجیی ناوه‌راست و کرمانجیی ژووروو یه‌کیکیان قوربانیی بدات و یه‌کیکیشیان به‌م قوربانییه‌وه ده‌روازه‌یه‌کی نوی له گیلگه‌ی زمانی نووسینی ستانده‌ردا، له‌گه‌لیکی بی ئایدینتیی بکاته‌وه. ئه‌م نووسراوه ته‌واو هاورایه له‌گه‌ل سه‌ردیری وتاریکی شاکه‌لییدا کاتی ده‌لی" زمانی یه‌کگرتووی کوردی گه‌لیک له‌ده‌وله‌تی کوردی پیویستتره"( شاکه‌لی،١٩٩٩،لا١٧).

زمانی ئینگلیزیی به‌چه‌ندین قوناغدا تیپه‌ریوه، گرنگترینیان ئینگلیزیی کون و ئینگلیزیی ناوه‌راست و دوایه‌مینشیان ئینگلیزیی مودیرنه. ئینگلیزیی کون خاوه‌ن ستانده‌ردیکی به‌هیز بووه که میژووه‌که‌ی له‌پیش هه‌زار ساله‌وه بو دواوه ده‌گه‌ریته‌وه. ئه‌گه‌رچیی وه‌ک فیشه‌ر ( Fisher ) پییوایه له ١١٠٠-١٤٠٠ ی زایینیی، به‌هوی کومه‌لی هه‌لومه‌رجی سیاسییه‌وه، ئینگلیزیی ستانده‌ربوونی خوی له‌ده‌ست ده‌دات و ئه‌م ئینگلیزییه مودیرنه‌ی ئیستا نزیکه‌ی ٥٥٠-٦٠٠ ساله له‌گه‌شه‌کردنی به‌رده‌وامدایه( Fisher,2003). باشه ئه‌ی کوردی خوخورو عه‌شیره‌تپه‌رست و خیلپه‌رست، ئیمه له‌کویین و زمانه‌کانی دنیا له‌کوین، به‌م پیودانگه بیت، لای که‌م ئیمه سه‌دان سال، ئه‌گه‌ر نه‌شچیته هه‌زارو شتیکیش، هه‌ر له‌بواری زماندا له‌دوای ئیگلیزه‌وه‌ین.

هه‌نووکه، به‌هوی گلوبالیزه‌یشنه‌وه، ته‌واوی ورده‌کارییه‌کانی ژیانی مروڤ به‌خیراییه‌کی چاوه‌رواننه‌کراو ئالوگوری ریشه‌یی به‌سه‌ردا هاتووه، ئایا شه‌رم نییه و کیماسیی نییه بو هه‌موو میلله‌تی کورد که تا ئیستا خاوه‌نی زمانی ستانده‌ردی نووسینی کوردیی به‌شیوه فه‌رمیی و سیاسیی و ئیدارییه‌که‌ی نه‌بیت ، زوربه‌ی زمانه ئه‌وروپاییه‌کان به‌تایبه‌تی ئیسپانیول و فرانسیی و ئیتالیی و ئینگلیزیی، پیش ئه‌وه‌ی زمانی ستانده‌ردی ئاخافتنیان هه‌بووبی، زمانی ستانده‌ردی نووسینیان دارشتووه، چونکه ئه‌سته‌مه زمانی ستانده‌ردی ئاخافتن دیاریی بکری ( Fisher,2003). باشه بوچیی کورد له گلوبالیزه‌یشنیشدا هیشتا خاوه‌نی زمانی ستانده‌ردی نووسین نییه؟ وه‌لامی ئه‌م پرسیاره له دوو تاوانبار

زیاتر کەسی تر نییە. تاوانبارەکان ئەگەر بە گروپیش بن، لێرەدا وەک تاک مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ.

١- دەسەڵاتی سیاسیی کورد، لە ئێستادا حکومەتی هەرێمی کوردستان و هەردوو زلحیزبی کوردستان: پارتیی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، وێڕای سەرجەم لایەنە سیاسییەکانی تر لەسەرجەم پارچەکانی کوردستاندا و بەتایبەتییش کوردستانی باشوور.

٢-سکۆلارو زمانەوان و رۆشنبیران و ئەکادیمستان و زمانزانەکانی کورد، کە ئەوەندەی خەریکی ماستاوچییەتیی و پانکردنەوە بوونە بۆ رژێمە داگیرکەرەکان و لە هەنووکەشدا بۆ دەسەڵاتی خۆماڵیی، بەچارەکی ئەوەش ئاوڕێکیان لە زمانی ستاندەرد و لینگوا فرانکای کوردیی بدایەتەوە بەو هەموو کۆڵەوارییەی زۆربەشیانەوە، ئێستا چەندین قۆناغ لە پێشتر دەبووین.

بارزانیی وەک سەرۆکی هەرێمی کوردستان، لەسەر دووڕیانێکی مێژوویی وەستاوە، بۆیە سەرۆکی هەرێم لێرەدا مەبەستە، چونکە دەسەڵاتی سیاسیی و ئیداریی لە هەنووکەدا لەئەستۆی ئەوە. دووڕیانێک کە دەبێت خۆی ساغبکاتەوە، ئایا بەڕاستیی سەرۆکی هەرێمی کوردستانە، یان هێشتا کولتووری سەرۆکی حیزب و ئایدیۆلۆژیی حیزب و پاشخانی سیاسیی حیزب دەیجولێنێت. ئەوە بارزانییە دەتوانێ ئەم بڕیارە ساغبکاتەوە و زمانی کوردیی (کرمانجیی ناوەڕاست) بکاتە ستاندەردی نووسین لەڕووی سیاسییەوەو بۆ هەتاهەتایە ئەم مقۆمقۆیە لەکورستانی باشووردا دابخات.

ئەو چانسەی بۆ بارزانیی هەڵکەوتووە، زۆر گرنگە بیقۆستایەتەوەو لەسەردەمی خۆیدا گەشترین خاڵی مێژوویی بۆ خۆی تۆمار بکردایە. رۆڵی بارزانیی دووەم، وەک رۆڵی هێنری پێنجەمی ( Henry V) بریتانیا دێتە بەراوردکردن. ئەو زۆر بە راشکاویی و ئازایانە، بڕیاری سیاسیی دا بۆ ستاندەردایزی زمانی ئینگلیزیی لە ساڵانی ١٤٠٠ ەکاندا ، لەکاتێکدا تا سەردەمی ئەو خوێندن و سەرجەم جومگە سیاسیی و ئیدارییەکانی وڵات بە زمانی فرانسیی و لاتینیی بوون. لە ناو ئینگلیزدا هێنری پێنجەم بە باوەگەورەی نوسینی ئینگلیزی مۆدێرن دێتە ئەژماردن. پرسیار ئەوەیە ئایا بارزانیی دەتوانێ ئەو کاریزمایە بێت و ئەم شەڕی دایەلێکت و ناوچەگەرێتییەی هەندێ نووسەرو رۆشنبیری بادینانیی کورتبین بکوژێنێتەوەو گەورەترین شانازییش بۆ خۆی

و گەلەکەی و پۆستەکەی تۆماربکات. ئەمە پرسیاریکە داهاتوویەکی کورت دەبێ وەڵامی بداتەوە. ئایا بارزانیی دەیەوێ لەمێژوودا بەهێنەری پێنجەمی زمانی کوردیی بناسرێ؟

جەختکردنەوە لەسەر رۆڵی بارزانیی دووەم، لەوێوە سەرچاوە دەگرێ، کە شەڕی نێوخۆی کوردستان کە تەمەنی پتر لەچل ساڵە، ئەوەندەی کینەو بوغز و ناوچەگەرییەتیی و دایەلێکتچییەتیی رشتووە، ئەوەتا لە مەسەلەیەکی زۆر زۆر چارەنووسسازی وەک زمانی ستاندەردی نووسینی کوردییدا، بەهەزارو یەک رەنگ و شێوەی جیاجیا یەخەت دەگرێتەوە. چونکە هەموو کەس هەستیاریی ئەم مەسەلەیە دەزانێ و "ینک" خۆی ناکات بەخاوەنی ئەم مەسەلەیە، لای کەم لەبەر ئەوەی هێزو قورساییەکەی لە ناوچەکانی کرمانجیی ناوەڕاست زماندایە، ئەمەش جگە لەئۆپۆرتونیستیی و خەمساردیی و نەبانی ینک لەمەڕ ئەم بابەتەدا خوێندنەوەیەکی تر هەڵناگرێ. بۆیە بەهەموو ئاکامی هاوکێشەکانەوە ئەوە بارزانییە لەکورتماوەدا( چونکە لە درێژ ماوەدا رۆڵی سیاسیی بارزانییش نامێنێ ) دەتوانێ یەکێک لەم رێگە چارانە هەلبژێرێ:

١- بەشێوەیەکی فەرمیی و سیاسیی بڕیاری ستاندەردایزی زمانی نووسینی کوردیی( کرمانجیی ناوەڕاست) بپەژرێنێ و کرمانجیی ناوەڕاست بکاتە بناغەی لینگوا فرانکای کوردیی.

٢- ئەم مەسەلەیە بەپشتدا بخات، یان بە خۆدزینەوە لێی، یان بەبیانوو هێنانەوە ، گوایە کاتی ماوە و ئەمە ئەرکی ئەکادیمیستەکانە! ئەم گۆڵمەزە تا چەندین ساڵ و چەندین دەیەی تر درێژەی هەبێ.

ئەم توێژینەوەیە گاڵتەی بەو بۆچوونە دێت، کە پێیوایە ئەمە کاری " ئەکادیمیستەکان" و "زمانزانەکان" و "پسپۆرەکانی زمان"ە. راستە ئەمانە ئەگەر قریان تێنەکەوتبێ و هەبن، دەتوانن پرۆژە گەلاڵە بکەن و بۆچوونی نوێ دابرێژن و دیبەیت و سیمینار سازبکەن و ئەگەر برستیشیان تێدابێت ئەوە بە نووسین، توێژینەوەی لەسەر بکەن و هەموو ئەم ئارکایڤە" ئەرشیفە" دوورو درێژو قەبارە ئەستوورە پێشکەش بە پارلەمانی کوردستان( ئەو پارلەمانەی لەسەر نیوەی توانای نووسینی یەک پارەگرافیان نییە) و سەرۆکایەتیی هەرێم بکەن. ئەوانیش ، بەتایبەتیی سەرۆکی هەرێم بڕیاری سیاسیی لەسەر بدات.

ئاخۆ ئەم کاروانە کیسەڵییە کەی بەڕێ دەکەوێ؟ ئەوە مەگەر هەر زمانزانەکانی کورد بزانن.

سەرۆکی هەرێمی کوردستان، دەبێ لەوە دڵنیابێت، ئەو سەرۆکی هەرێمێکی جیۆگرافیی دیاریکراوە لەکوردستانی باشووردا، ئەگەر سبەی رۆژ کەرکوک و خانەقین و شەنگار و ناوچەکانیان هاتیشنەوە سەر ئەم هەرێمەی ئێستای کوردستان، هەر هەرێمی کوردستانەو ئەویش هەر سەرۆکی هەرێمی کوردستانەو نەبووە ونابێ بە سەرۆکی کوردستان. جا ئەو زمانزانە شاخدارانەی لە ئایدیۆلۆژیای حیزبدا کوڵاون و بۆ بارزانیی دەسوتێن و دەتوێنەوە، رۆژانە یەک ملیۆن جار بنووسن "سەرۆکی کوردستان" وەک ئەوە وایە بنووسن سەرۆکی سیبریا( ساییبریاSiberia)، بۆیە سەرۆکی هەرێمی کوردستان دەبێ ئەو راستییە بزانێ، باسکردن لە زمانی نووسین و ئەدەبی یەکگرتووی کوردیی، مەبەست لەم هەرێمەی ئێستایە، نە سەرۆکی هەرێم ئەو مافەی هەیە، زمانی ستاندەرد بۆ پارچەکانی تری کوردستان چێبکات و نە ئەوانیش ئەو مافەی پێ رەوا دەبینین. نە ئەمەش هیچ لۆژیک و راشناڵبوونێکی تێدایە. زمانی ستاندەرد بۆ کوردستانی گەورە! لە هەنووکەدا تەنها لەهزری پانکوردیستەکاندا هەیە.

مستەفا بارزانیی ( بارزانیی یەکەم)، سەرەڕای هەر رەخنەو سەرنجێک لەسەری ، بەڵام لە دوو هەڵوێستی سیاسییدا، زۆر بێئەندازە کاریزمایی خۆی بەرجەستەکردووەتەوە. یەکەمیان، مەسەلەی کەرکوکە، کە ئەو مافەی بەخۆی نەداوە، بەناوی گەلی کوردەوە سازشی لەسەر بکات، لەکاتێکدا سەرکردایەتی سیاسیی کورد لە هەنووکەدا گرەویان لەسەر کەرکوک کردووە. دووەمیان ، بەکارهێنانی کاریزمایی خۆی وەک سەرکردەی جوڵانەوەی سیاسیی لە کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکانی سەدەی رابردوودا لەهەمبەر خەڵکی بادیناندا، بۆ پەژراندنی خوێندن بەزمانی کوردیی( کرمانجیی ناوەڕاست).

خاڵی دووەم جێگەی سەرنجی ئەم توێژینەوەیەیە و ئەو پرسیارە دەوروژێنێ، بۆچیی بارزانیی دووەم، لە ئاست ساغکردنەوەی زمانی ستاندەردی کوردییدا، کەمتەرخەم بووەو لەسەردەمی ئەودا رێگە خۆشدەکرێ بۆ کەلێن کەوتنە نێوان ئەم دوو دایەلێکتەوە؟ باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە رێگەدان بە پرۆگرامەکانی خوێندن لە ناوچەکانی بادینان، بەشێوە زاری

کرمانجیی ( دروستتر بادینانیی) و تەنانەت تێکەولێکەیەکی زۆر نامۆ بەزمانی کوردیی لە ناوچەکانی ژێر قەڵەمڕەویی پارتییدا لە پرۆگرامەکانی خوێندندا هاتووەتە ئاراوە، دەکرێ پێی بگوترێ ڕەنگکردن و ماکیاژکردنی کرمانجیی ناوەڕاست بە بادینانیی، لەکاتێکدا دەبووایە پێچەوانەکەی بکرایە.

لایەنێکی تری ئەم کێشەیە، کێشەی سکریپتی نووسینە، ئایا سکریپتی فارسیی- عەرەبیی(ئارامیی) بەکار بهێنرێ یان لاتینیی ؟ ئەم نووسینە لەو بڕوایەدایە، سکریپتی ئێستا هیچ گرفتێکی ئەوتۆی نییە کە ڕێگر بێت لەبەردەم ستاندەردایزی زمانی کوردییدا. بەپێچەوانەوە هەندێ دەنگی سەرەکیی لەزمانی کوردییدا بەشێوەی تیپ (پیت) لەلاتینییدا بەتەواویی ون دەبن. ئەلفابێتای لاتینیی بۆ ئینگلیزییش بەتەواویی دەست نادات، چ جای بۆ کوردیی، چونکە خودی ئەلفابێتای لاتینیی بۆ ئینگلیزیی دروست نەکراوە، دوای ڕینیسانس بەماوەیەکی باش ئەوسا خەڵک فێر بوو بەزمانی ئینگلیزیی نوێ بنووسێ و بخوێنێ( Fisher,2003).

ئێستا پاش پتر لە چوار سەد دانە ساڵی ڕەبەق، ئینگلیزیی ناوەڕاست و دواتریش ئینگلیزیی مۆدێرن دەق دەگرێ و دەوڵەمەند دەبێ، هێشتا تیپە لاتینییەکان گەرووی ئینگلیز پڕ ناکاتەوە لە خوێندنەوەی تێکستدا، هێشتا دەنگەژێکان قورساییەکی زۆریان لەسەرە لە دەربڕینی تێکستەکاندا. هەر ئەمەشە وایکردووە بزوتنەوەیەک لە ئەمێریکا پەیدا ببێ، زۆر وشە بە سکریپتە ڕەسەنەکەی بریتانیا نانووسنەوە. کەچیی بابای پانکوردیست و پانلاتینستی کورد، تۆز دەکاو هەڵپەی ئەوەیەتی سکریپتی لاتینیی بسەپێنرێ، لەکاتێکدا هیچ خەمی زمانی ستاندەردی نووسینی نییە، چونکە ئەجێندایەکی پێچوپەنا لە هزریاندا پێکورە دەکات.

پەژراندنی تیپی لاتینیی، بۆ داهاتووی زمانێکی کۆمۆن لەنێو کوردەکاندا زۆر گرنگیی هەیە. بەتایبەت، لە ئێستا بەدواوە، نەوەی نوێی کوردانی دایەسپۆرا Diaspora ناتوانن ئەو سکریپتە عەرەبیی و فارسییەی، کورد سوودی لێوەردەگرێ بخوێننەوە فێری ببن. ئەم پرۆسێسی گۆڕینی سکریپتە بۆ لاتینیی، دەبێ زۆر بەبەرنامەو شێنەیی کاری بۆ بکرێ و بە تێپەڕبوونی کاتیش، پێداویستییەکان پڕ دەکاتەوە. بەلام ئەگەر هەر نەشکرێ، هیچ گرفتێ بۆ زمانی کوردیی دروست نابێت، تەنها ئەوە نەبێت لە داهاتوودا زیان لە یەکگرتوویی و

یەکزمانی کورد دەدات. یان دەکرێ هەردووکیان پێکەوە بۆ ماوەیەکی زۆر بەیەکەوە بەکار بهێنرێن، ئەمە وێڕای ئەوەی زۆرینەی مێژووی کورد دەبێ سەرلەنوێ بە لاتینیی بنووسرێتەوە، یان وەربگێڕدرێ، کە ئەمەش لە ئەستەمەوە نزیکە.

زمانی ستاندەردی ئینگلیزیی، سەرەتا بەڕێکخستن و بەیاساسییکردنی، یان ئەوەی پێی دەگوترێ کۆدڕۆنانی (کۆدیفای codify) لایەنی ڕێزمانیی و فەرهەنگیی دەستپێکرد و دواتریش دایەلێکتە جۆراوجۆرەکان بەرکەنارخران و یەک فۆرمی گشتگیری زمانەوانیی سەپێنرا( Milroy and Milroy,1985). لە هەنووکەدا زمانی ستاندەردی کوردیی لەهەموو ڕوویەکەوە خەملیوە. تەنها کارێک بیەوێ، ئەوەیە لەڕووی سیاسییەوە کۆدیفای( کۆددانان) بۆ بکرێ و بەسەر تەواوی هەرێمی کوردستاندا جێکەوت بکرێ. لێرەدا دەکرێ تایبەتمەندیی دایەلێکتە جیاوازەکان لەفۆرمی نوێی ستاندەردی کوردییدا بەتەواویی لەبەرچاوبگیردرێن و بکرێنە پەیین بۆ نەمامی نوێی زمانی ستاندەردی نووسین، بەواتایەکی تر زۆرترین سوود لە کەلەپوور و کولتوور و سینتاکس و سیمانتیک و لێکسیکۆن(lexicon) ی دایلێکتەکان وەربگیردرێ و زمانی ستاندەردی چەندین بەرامبەر پێ هەڵکشێنرێ. یاخود بەو بۆچوونە باوەی هەیە، هەموویان لەسەر درەختی ستاندەردی نووسین، موتوربە بکرێن و پێکەوە ببنە دەسکێکی هەمەڕەنگ، بەڵام بەیەک بنج ئاو بخۆنەوەو هەر لەو بنجەشەوە وەک یەک فۆرمی تاکزمانیی گەشەیان پێ بدرێ.

لە جیهانی هاوچەرخ و جیهانی کۆندا، مێژوو زۆر وردەکاریی بەسوودمان لەسەر چێکردن و بەفەرمییکردنی زمانی ستاندەرد بۆ دەگێڕێتەوە. ئەگەر کەمێک خۆمان ماندوو بکەین و شەلم کوێرم پێیدا نەکێشین و لەگێرفانی بەتاڵەوە قسە دەرنەهێنین، خۆمان تووشی هیستێریا نەکەین، کەفاوی دایلێکتچییەتی بە شەویلگەماندا نەچۆڕێتەوە و ناوچەگەرییەتیی و شارچییەتیی بخەینە لاوەو، هەندێک لەئەدەب و مێژووی زمانە جیهانیی و ناوچەییەکان بخوێنینەوە، بەدڵنیاییەوە بە ڕۆخی براوبەخۆبوون و یەکترپەژراندنمان دەگەیەنێت. چونکە ئەوە هەر ڕێکەوت نییە، بادینانییەک، عەرەبیی پێ باشتر بێ لە کرمانجیی ناوەڕاست ( لەسەردەمی بەعس و دیکتاتۆریی سەدامی

دیکتـاتوردا، وەک ئـاو، عـەرەبییـان دەخـواردەوە)، ئـەمـە دەردێکـە ئـەگـەر چارەسەرنەکرێ و ڕێگەی لێ نەگیرێ، دەست لەشوێنی خراپتریش دەکوتێ.

نموونەیەکی تری گەلان بۆ چێکردنی زمانی ستاندەرد، نۆرمی ستاندەردی فینلەندیی ( فینیش-Finnish)، کە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا ستراکتۆرەکەی بنیاتنراوە، ڕێک لەکاتێکدا دەستی پێکردووە کە ئایدێنتیتیی نیشتمانیی بۆ ئەو وڵاتە بەدەست هێنرا، لەو سەروبەندەدا، چینە باڵاکانی ئەم وڵاتە یان بە سویدیی ، یاخود بەزمانە ئەوروپاییەکانی تر دەئاخافتن، بۆ ئەوەی پردێک لەنێوان زۆرترین خەڵک کە دایەلێکتی فینیشیان هەبوو، لەگەڵ چینە باڵاکاندا کە بە سویدیی مامەڵەیان دەکرد، دروست بکرێ، زمانی ستاندەردی نوێی نوسینیان بەفەرمیی ناساند( Laitinen,1997 ).

بەمشێوەیە سکۆلارو ڕۆشنبیران و ئیلیتی نووسەران، هەزاران وشەی نوێیان چێکرد ، بەکەڵکوەرگرتن لە دایلێکتە جیاوازەکان و زمانی کۆنی جوتیارەکان و دێهاتنشینەکان، زمانی ستاندەردی فینیشیی تا ئێستایشی لەگەڵدا بێت هەر لەگەشەدایە(ibid ). کەواتە هەندێ کەس پێیانوایە زمان دروستکردن سەختە و نابێ و ناکرێ، هەر لەگیرفانی خۆیان دەریدەکەن، هەرچەند کورد لەهەرێمی کوردستاندا، پێویستی بە چێکردنی زمانێکی نوێ نییە، بەڵکو تەنها بەفەرمییکردن و خزمەتکردنی کوردیی (کرمانجیی ناوەڕاست) و کەڵکوەرگرتن لە دایەلێکتەکانی تر، جوانترین زمان و پوختترین و پاراوترین لینگوا فرانکای زمان لەئارادایەو لە هەڵکشانێکی بەردەوامیشدایە.

وێرای بەفەرمیی ناساندنی زمانی فینیشیی لە فینلاند، زمانی سویدیی بە هاوتەرییبی مایەوە لەو وڵاتەدا، هەردووکیان پێکەوە زمانی نیشتمانیی فینلاندن و وێرای زۆرایەتیی فینیشیی و کەمایەتیی سویدیی ، زۆر هارمۆنییانە پێکەوە هەڵدەکەن و هەردووکیشیان زمانی ستاندەرد و فەرمیی وڵاتن، ( LIEBKIND, TANDEFELT, and MORING, 2007 ) . ئەوانەی پێیانوایە، کە دەکرێ هەردوو دایەلێکتی کرمانجیی ناوەڕاست و کرمانجیی لەیەک کاتدا پێکەوە زمانی خوێندن و دامودەسگاکانی دوو دەڤەری جیاوازی هەرێمی کوردستان بن، نەک هەڵەن، بەڵکو زۆر نەدان و بێئاگان لەمەڕ ئەرک و ڕۆڵی لینگوا فرانکای نیشتمانیی. کرمانجیی ناوەڕاست و کرمانجیی و هەورامیی و زازایی ئەگەر زمانگەلێکی جیاوازن ، بەڵێ دەکرێ هەریەکەیان بکرین بەزمانی فەرمیی وڵات،

وەک سویسرا، کە ئەڵمانیی و فرانسیی و ئیتالیی و رۆمانشیی ( Rumantsch or Romansh) وەک چوار زمانی نیشتمانیی تیدا بەکار دەهینرێ. بەلام کرمانجیی ناوەڕاست و کرمانجیی ژووروو و ...تاد، کۆمەلە دایەلیکتیکی یەک نەتەوەن و دایلیکتەکانی زمانی کوردییان پیدەگوترێ. ناکرێ بەهیچ شیوەیەک لەوە زیاتر ریگەیان پی بدرێ لەیەک جیۆگرافیای سیاسییدا هەر دایلیکتەو بۆ خۆی تەراتین بکات لەسەرچییش ، لەسەر کەولی لینگوا فرانکای کوردیی تەراتین بکەن.

بیرمەندی زمانەوانیی ' باختین'، شرۆڤەی تاکزمانیی و زمانی ستاندەرد زۆر بە ریکوپیکی دەکات، ئەو زۆر بەوردیی دەست دەخاتە سەر گرنگیی یەکزمانیی و بەرکەنارکردنی فرە دایەلیکتیی، چونکە لای ئەو سەرکەوتنی زمانیک، یان دایەلیکتیک بەسەر ئەوانی تردا، واتای بەکویلەکردنی ژیرکەوتووەکان نییە، بەلکو ئەمە وەک "فاکتیک یەکگرتوویی نیشاندەدات" و هاوکاتیش پیداویستییەکی میژووییە(Bakhtin,1981,p.271). ئیستا کورد کۆمەڵە دایەلکتیکی هەیە، هەر یەکەو لەناوچەیەکدا کاری خەلک رایی دەکات، ئەم خەرەکە دەبێ لیرەدا بوەستینرێ، ئەمە نە ئازادییەو نە مافی مرۆڤە، ئەمە گەورەترین ستەمە لە یەکزمانیی (proto-language) و یەکدەستیی زمان دەکرێ.

ئەگەر بریارە زمانی ستاندەرد فۆرمیکی سینتراڵیی وەربگرێ و زمانی ئەدەبیی ئەم فۆرمە سینتراڵییە بیت ( Crowley,2003)، ئەوە کرمانجیی ناوەراستە دەبیت بناغەی زمانی ستاندەردی کوردیی بیت. چونکە هەر ئیستا لە کوردستاندا، زمانی فەرمیی زۆربەی دامودەسگا حکومیی و حیزبییەکان و نیوەندە کولتووریی و رۆشنبیرییەکانە. هەروەها دەوڵەمەندە لە ئەدەبی کوردییدا، بەبەراورد بەهەموو دایەلیکتەکانی تر. ئەوەی پییوایە ئەوە بەدرخانییەکان و کرمانجی ژووروو بوون، یەکەم گاڤیان وەشاند، ئەوە بەجیی خۆی و جیگەی شانازییە، بەلام ئەو نانە... نانە، ئەمرۆ لەخوانە، ئیمە باس لە هەنووکە دەکەین و باسیش لە هەریمی کوردستانی باشوور دەکەین، لیرەشەوە بە تفاقی ئیستاوە هەنگاو بۆ داهاتووی پرۆتوزمان( یەک – زمان)یی دەنیین.

پسپۆران و ئەدەبدۆستانی زمانی ئینگلیزیی لە ساڵی ۱۸۷۳ دا هەستان بەدامەزراندنی کۆمەڵەی دایەلیکتی ئینگلیزیی (EDS )، ئەم هەنگاوە هاوکات بوو لەگەڵ چیکردنی فەرهەنگی نویی ئۆکسفۆردی ئینگلیزیی لەلایەک و

چێکردنی فەرهەنگی دایەلێکتە ئینگلیزییەکاندا، مەبەستی سەرەکیی ئەم پرۆژانەش کۆکردنەوە و بژارکردنی زمانی ئینگلیزیی بوو لەیەک زمانی یەکرەنگ و سێنترال و تەواو ستاندەردو پرۆفیشنالدا، ئەم پرۆژەیە وشەگەلێکی زۆری هەرێمە جیاوازەکان و دایلێکتە جیاوازەکانی ترینجاندە ناو زمانی ئەدەبیی و ستاندەردی ئینگلیزییەوە( Crowley, 2003 ). بەهەمان شێوە، کوردیش پاش بەفەرمییناسینی زمانی ستاندەردی کوردیی، دەتوانێ چەندین وشەو و تێرمۆنۆلۆجی دایلێکتە جیاوازەکان بهێنێ و پێکەوە هەموویان بقلێپێنێتە ناو زمانی ستاندەردی کوردییەوەو سێنترالیزمی ئەم زمانە ستاندەردو ئەدەبییە مسۆگەرتر و مکومتر بکات.

هەر دایەلێکتێک یاخود زمانی دەڤەرێک، توانیتی خۆی بکاتە " سوپەرزمان" و دایەلێکت و زمانەکانی تری خستە بن هەنگلییەوە، واتای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم زمانە خۆی تیۆرایز( theorize ) کردووە ( Chapman,1932,p.562). کرمانجیی ناوەڕاست بەهەوڵ و کۆششی خۆی و رێبوارانی، ئەم تیۆرایزەی تێپەڕاندووە، یان لە خراپترین دۆخدا دەکرێ بڵێین لە تیۆرایزبووندایە، ئەم تیۆرایزبوونەش پرێستیژبوونی دەداتێ و هەموو نیشانەکانی ستاندەردایزی پێ دەبەخشێت( ibid, p.563 ).

گەورەترین مەترسیی بۆ سەر زمانی ستاندەرد، رێگەدان بەخوێندنە بە دایەلێکتە دابڕاو و گۆشەگیرەکان، لەمەش مەترسیدارتر، ئەوەیە زۆریی و بۆریی خەڵکی نەخوێندەوارو بێئاگا لە ئەدەب و نووسین، پشکیان هەبێ لە قورسایی دانان بەسەر دەوڵەت یان دەسەڵاتی جێبەجێکردندا بۆ لەمپەردانان لەبەردەم زمانی ستاندەردا( Newbolt,1921). هەزار درووود لەگۆڕی نیوبۆڵت، بەڕاستیی باش مەترسییەکانی سەر زمانی ستاندەردی شیکردووەتەوە. وەرە بێژت لەخۆت نەبێتەوە، لەم کات و ساتەدا، کۆمەڵێ رۆشنبیرو ئەدیب و مامۆستاو..تاد، تازە بەتازە دێن داوای ئەوە دەکەن پرۆگرامەکانی خوێندن بەزاراوە لۆکاڵییەکانی دەڤەرەکەی خۆیان بێت. لەم ئاقارەشەوە دەیانەوێ لۆبیی دروست بکەن و بەرەشکە واژۆ کۆبکەنەوە، بە پارانەوەو لالانەوەو نازونووز دەیانەوێ سەرۆکی هەرێمی کوردستان، رێگە نەدات کوردیی ستاندەرد یان وەک ئەوان دەڵێن، سۆرانیی پێ بنێتە

قوتابخانەکانیانەوە. دەیانەوێ خوێندکارەکانیان بەدایەلێکتە شیرینەکەی خۆیان بخوێنن و زمانی ستاندەرد لەپێ بکەن.

ئەگەر تا ئێرە وازانراوە، کە ئایدێنتیتیی ئێسنۆزمانەوانیی، پابەندە بە تێکهەڵکێشە سۆسیۆزمانەوانییەکانی ئایدێنتیی ئێسنیکییەوەو وەک بەشێک لە گێڵگەی ئەنسرۆپۆلۆجی لە زمانی کەمایەتییە نەتەوەیی و ئێسنیکییەکان دەکۆڵێتەوە( Giles,1977; Heine, 1997 ) . ئەوە دەبێ لێرە بەدواوە، کوردی دایەلێکتپەرست، لقێکی تریش بۆ ئەنسرۆپۆلۆجیای ئەم دەردە دایەلێکتچییە بدۆزێتەوەو ناوێکی زانستیی پڕ بە پێستی خۆی لێ بنێت. چونکە ئەوەتا ئێسنیکی کورد، ئامادە نین لەهەرێمی کوردستانی باشووردا، زمانی ستاندەرد بپەژرێنن، ئامادەنین لینگوافرانکای نووسین بپەژرێنن و هەرەشەی یاخیبوون و بەرخۆدان دەکەن. لە کاتێکدا کاتی ئەوە هاتووە کورد پرۆتۆزمانی هەبێ و پەتای دایەلێکتەکان بنبڕ بکات، کەچیی بەداخەوە ئەگەر بە پەنجەیەک بەم دایەلێکتچییانە دەگوترێ نا، بە نۆ پەنجەکەی تر ئاماژەی هاندان و دەست لەپشتدانیان بە پەیام بۆ دەنێردرێ. ئەگینا ئەم دۆخە ناجۆرە، تەنها چەند ساتێک لەکاریزمایی سەرکردە و پارلەمانە چەوت سوێندخۆرەکەی کوردستانی دەوێ، بۆ یەکلاییکردنەوەو بڕیارێکی ئازایانەو نیشتمانییانە.

سەیرە، هەموو مێژووی کورد، بە وردبینیش بگەڕێی یەکگرتوویی و یەکدەستیی لەمەڕ هیچ پرسێکی نیشتمانیی تێدا نییە. ئەگەر هەشبووبێ یان هەبێ، کە زۆر کەمیش بووە هەمیشە تاکتیکیی بووە و هەرگیز ستراتیژیی نەبووە. ئایدێنتیتیی ئێسنۆزمانەوانیی، هەمیشە زمانی وەک خۆشەویسترین جگەرگۆشە لە ئامێز گرتووە و بە چەکێکی هاوبەش و سیمبۆڵێکی هاوبەشی زانیوەو بەتوندیی لەلایەن ئێسنیکەکانیشەوە دەست بەم دۆکترینەوە گیراوە ( Bourhis ,1979; Haarmann,1986; Shukla,1985 ). کەچیی ئێسنیکی کورد، لەبری ئەوەی زمانێکی ستاندەردو یەکگرتوو چێبکەن و پێوەندییەکانیان توندوتۆڵ بکاتەوەو بیکەنە سیمبۆڵی یەکدەنگیی و یەکدەستیی و بیلاوێننەوە، بەپێچەوانە هەر دەڤەرەو لەخەمی زاراوەکەی خۆیدایە و ئەوەی بەلایدا ناچن زمانی لینگوافرانکای نووسینی کوردییە.

ئەم شەڕە گەڕەکەو ئەم هەلومەرجە ناجۆرەی زمانی کوردیی پێدا تێپەڕ دەبێ لەنێوان فڕکان فڕکانی هەردوو دایەلێکتی سەرەکیی زمانی کوردیی (

کرمانجیی ناوەڕاست و سەروو ، یان هەندێک پێی دەڵێ کرمانجیی خواروو و ژووروو) دەبێت بەلایەکدا بخرێ، ئەوە گومانی تێدا نییە، هەندێک لەو بادینانیانەی کوردستانی باشوور پشت ئەستوورن بە زۆرایەتی کوردەکانی باکوور و رۆژئاوا، ئەمەش لەئەنجامی خوێندنەوەیەکی چەوت بۆ جیۆپۆلیتیک و سۆسیۆزمانەوانییەوە سەری هەڵداوە. ئەم دۆخە دۆخێکی زۆر ناوازەیە، تەنانەت یەک رۆژ زیاتر درێژە بەم هێتەرەجینییەسە( heterogeneous- هەمەچیزەیی) ی زمانی کوردیی بدرێ، کەمتەرخەمییەکی مەترسیدار دەبێ. زمانی کوردیی دەبێ لە قۆناغی هێتەرەجینییەسەوە بۆ قۆناغی هۆمەجینییەس( homogenous- چوونیەکیی) بگوازرێتەوە.

کاتێ ئەم توێژینەوەیە دەڵێ زمانی ستاندەرد دەبێ بسەپێنرێ، بەو واتایە نییە ئەم سەپاندە ئایدێنتیتیی کۆمەلایەتیی و ئیسنۆگرافیی بەسەر بەشێک لە جڤاکی کوردییدا بسەپێنێ. چونکە ئەمە خۆی دژی بنەما سەرەکییەکانی ئەو ئەدگارانەیە کە کوردی وەک نەتەوە، یەکدەست و یەک دیسکۆرس بۆ جیاکردنەوە لەگەلانی تر هێشتووەتەوە. بەلام لێرەدا قسە لەسەر فۆرماتەکانی زمانە وەک گرنگترین پێوەندییەکانی ئەندامییەتیی( ئەندامێتیی) گرووپەکان لەرووی ئیسنۆزمانەوانییەوە، ناکرێ ستراتیژیی ئەم ئایدێنتیتییە کارگوزارییە، نەخرێتە کرۆکی باسی ئیسنۆزمانەوانییەوە( Louw-Potgieter and Giles,1988). بەواتایەکی روونتر، ئایدێنتیتیی کارپێکەوەکردنی ئەندامبوونی تاکەکانی کۆمەڵ، لەستراتیژیی ئیسنۆزمانەوانییەوە سەرچاوە دەگرێ. بەداخەوە لە نێوان فۆرماتی زمانی کوردیی ( کرمانجیی ناوەڕاست و کرمانجیی) دا،کەمتر ئەم ئایدێنتیتییە ئیسنۆزمانەوانییە دەبینرێ.

زمانی ستاندەردی فرانسیی لە سەدەی شانزەیەمەوە ، پاش ئەوەی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ" زمانی ئێلیتە ئەدەبدۆستەکان بوو، بەتەواویی کریستاڵ کرایەوە"( Lodge,2003,p206 ). دواتریش بەگوێرەی قۆناغە سیاسیی و کۆمەلایەتییەکان، ئەم زمانە گەشەی بەخۆیەوە بینیوەو، جار دوای جار زۆرتر ستاندەردایزتر و کریستاڵتر بووە، سەرئەنجام ئەم گەشە کولتووریی و زمانەوانییە لەگەڵ قۆناغەکانی بنیاتنانی نەتەوەو ولاتدا( nation-state building )، بووەتە هۆی زیاتر ستاندەردایزی زمانی فرانسیی و دواجار بووە بە سیمبۆلی ئایدێنتیتیی نیشتمانیی( ibid).

ئەگەر سوودیش لە ئەدەب و زمانی ئینگلیزیی و فرانسیی و نەتەوەکانی تر وەرناگرین، خۆ دەکرێ هەر بەبۆنکردن، کۆمەڵێ شتی نوێیان لێوە فێربین. ئەگەر دەست بە ستاندەردایزی زمانی کوردیی بە فەرمیی نەکرێ، ئەوە گومانی تێدا نییە ئەم خەرەکی دایەلێکتبازییەی نێوان زاراوە سەرەکییەکانی کورد، "بەرەو جیاوازییەکی قووڵی سۆسیۆستایلی socio-stylistic دەڕوات" (Lodge,2003,p216). ئەم سۆسیۆشێوازییە لە زماندا دەردوبەلاو سەریەشەی زۆرتر دەهێنێ و تا دێتیش دایەلێکتەکان زۆرتر لێک دووردەکەونەوە. تەنها ستاندەردایزی زمانی کوردییە دەتوانێ پێش بەم بەرەلایی و پاشاگەردانییە بهێنێ. "کە دەڵێی زمان، رێک دەڵێی جڤاک "-L. Vi Strauss in Duranti 1997, p.337"، ئایا بەڕاستیی و بێ خۆهەڵخەڵەتاندن ، جڤاکی کوردیی زمانی کوردیی هەیە؟، یان کۆمەڵێ دایەلێکتی جیاوازی هەیەو هەر دایەلێکتەو لە خەمی خۆیدایە. ئایا بەڕاست، کورد ئەوەی لەباردایە کە لینگوا فرانکایەکی ستاندەرد چێبکات و پیرۆزی بکات؟

بەدەستهێنانی(acquisition) زمانێکی ستاندەرد لە بواری کۆدە زمانەوانییەکاندا، هەر کارێکی نێوخۆیی نییە، بەڵکو جیهانبینییەکە بۆ کارتێکردنە کۆمەلایەتییەکان، چونکە ئەوە زمانە کە ئایدێنتیتییەکی کولتووریی هاوبەش و دووبارە بەرهەمهێنانەوەی جیاوازییە کۆمەلایەتییەکان لەنگەر پێ دەگرێ(-Mac Giolla Chriost, 2003 ). بەلام بەداخەوە ئەم ئایدێنتیتییە هاوبەشە ، خەریکە بەتەواویی بەکێردی دایەلێکتچییەتیی هەنجن هەنجن دەکرێ.

ئەم خۆجیاکردنەوەیەی هەندێ نووسەرو ئێلیتی رۆشنبیرانی بادینان لە کوردستانی باشووردا و نەپەژراندنی زمانی ستاندەردی کوردیی و هەڕەشەی یاخیبوون و واژۆکوکردنەوە بۆ ئەوەی دایەلێکتە لۆکاڵییەکەی خۆیان رەپ و راست بمێنێتەوەو رێگە نەدەن زمانی کوردیی (کرمانجیی ناوەڕاست) بچێتە بواری پەروەردەو خوێندن و دامودەسگاکانەوە، ئەو پرسیارەمان لا دروست دەکات، ئایا کولتوورو باکگراوند و سیمای ئێسنیکیی جودایان هەیە لەچاو شوێنەکانی تری کوردستاندا، ئایا بەئاشکرایی و بێ ترس ئەو پرسیارە بکەین، زمانی کوردیی ئەوان لەزمانی کوردیی شوێنەکانی تر جودایە؟ راشکاوانەتر ئایا زمانی کوردیی یەک زمانە؟ هەموو ئەم نیگەرانیی و ددانتەنانە

بەراستییەکاندا، دەمناباتەوە بۆ ورەدەکاریی و ئاریشەکانی ئەو لقە زانستەی ئەنسرۆپۆلۆجی کە بە ئێسنۆلۆجی ethnology ناسراوە.

ئەگەر لەرووی سۆسیۆزمانەوانییەوە و سایکۆلۆژی زمانەوانییەوە دەرمانسازیی و بیماری ئەم گرفتی زمان و دایەلێکتگەلەی کوردستانی باشوور شرۆڤە نەکرێ، ئەوا لەرووی ئێسنۆلۆجییەوە دەگەینە ئەو راستییەی تێگەیشتن لە شڵەژان و باری دەروونیی بەشێک یان توێژێک لە هەناوی ئێسنیکێکی پارچەپارچەکراوەوە کە خۆیان جیادەکەنەوە، یان خۆیان بەنەژادی بالاتر دەزانن لە پێکهاتەی زمانەوانییدا، سەختتر دەکات. زمانی مرۆڤ، کە مانیفێستۆی گرنگترین لایەنی دەروونیی ژیان دەکات، لەرووی ئێسنۆلۆجییەوە گومانی جیایی و دووبەرەکیی نێوان پێکهاتەکانی یەک ئێسنیک دەکات( Duranti,1997 ).

لەنێو کورددا، کە بەپێی زۆرینەی زانستە مرۆییەکان بێت، یەک نەتەوەو یەک خاک و یەک کولتووری هاوبەشی هەیە، بەکەمێک جیاوزیی ناوچە جیۆگرافییەکان و نزیکایەتی بەشەکان لە نەتەوە سەردەستەکانەوە، کەچیی لە روانگەی دورانتییەوە بێت، ئەنسرۆپۆلۆجی کولتووریی و ئەنسرۆپۆلۆجی زمانەوانیی ئەم حەز وخولیا شێتانەیەی کورد تێر ناکات و ئەوە ئێسنۆلۆجییە دەبێت لەم دیاردە ناوازەیەی زمان-جیاوازییە بکۆڵێتەوە( Duranti,1997 ). پرسیارو وەڵامەکە زۆر ئاسان دەست دەکەوێت، ئایا بەراستیی کورد یەک زمانی هەیە، یان دوو، سێ و چوار....ئەگەریش بڕیارە لە رووی ئێسنیکییەوە یەک نەتەوەبین و پێچەوانەی زانستە مرۆییەکان فەنکشن نەکەین، هۆی چییە ئەم هەموو تەنگە چیکڵدانەیی و بەلارێدابردنی نەخشەرێگای (roadmap) زمانی ستاندەردی کوردیی؟ ئەگەر نا، ئایا بەراستیی کورد یەک زمانی کۆمۆنی هەیە؟ ئایا بەویژدانەوە، ئەگەری جێکەوتکردنی لینگوای فرانکای کوردیی هەیە لەناو ئەنتاگەنیزمی ئەم دایەلێکتچییانەدا؟

زمانی کوردیی بەرادەیەک جیاوازییەکانی تێدا زەقبووەتەوە کە بووەتە جێگەی سەرنج و تێرامانی لێکۆڵەرانی بیانییش، چونکە لەدیدی زۆریانەوە جیاوازییەکانی نێوان ئەم دایەلێکتانە ئەوەندە زۆرە، وەک جیاوازیی نێوان چەندین زمانی سەربەخۆ دەیخوێننەوە(Mac Giolla Chriost, 2003). بۆ نا، ئەمە راستییەکەو نکۆڵیکردن لێی، جگە لە نەدانیی و نەزانیی هیچ بنەمایەکی

زانستیی نییە، تاخۆمانی لێ کەڕ بکەین. هەر ئێستا چەندین کەس لێرەو لەوێ پەیدابوونە، لەناو زازایی و ئێزیدیی و تەنانەت لوڕییەکانیشدا کە خۆیان بەکورد نازانن. هەورامییش پەیدابوونە، هەڕەشەی ئەوە دەکەن ئەگەر کرمانجیی ناوەڕاست بکرێ بەزمانی ستاندەرد، دەدەن بەکێودا و پەرچەکرداری توندوتیژ دەنوێنن.

دیسان بۆ نا، ئەوە نییە ئینتەرناسیۆنال-گرووپی مافی کەمایەتییەکان، بە ئاشکرا ئاماژە بەوە دەکات، کە هەندێ کەس لەنێو کوردە جۆراوجۆرەکاندا بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە گۆرانیی و کرماشانیی و لوڕیی و زازایی و لەکیی، زمانی زگماکیی جیاوازیان هەیە( MRG,1997). ئاخۆ بێویژدانییە کاتێ سکۆلارە بیانییەکان پێشبینی ئەوە بکەن، جیاوازییە دایەلێکتییەکان،، گومان دەخەنە سەر یەکێتیی ئایدێنتیتیی و کولتووریی و سیاسیی کورد و پرۆبلماتیک و سەریەشە بۆ زمانی ستاندەردی کوردیی پەیدا دەکەن( Mac Giolla Chriost, 2003).

لەهەوڵێکی بەرچاو و ئازایانەدا، نووسەران و رۆشنبیرانی کورد، بەسەدان وشەی کرمانجی ژووروویان تێکەڵ بە کوردیی سۆرانیی کردووە، ئەمە زۆر جێگەی دەستخۆشییە بۆ تێکەڵکردنی ئەم دوو دایەلێکتە سەرەکییە لە سەرەوە ( نەک لەژێرەوە). بەواتایەکی تر بناغەی ئەم دوو دایەلێکتە تێکەڵ ناکرێن، بەڵکو دەبێ لەسەرەوە تێکەڵ بکرێن لەسەر رەگوڕیشەی یەکێکیان ستاندەردی کوردیی پانوپۆڕ چێبکرێ. لەکاتێکدا لە رووی سیمیانتیک و سینتاکس و لێکسیکۆنیشەوە بێت، کرمانجیی ناوەڕاست زۆر دەوڵەمەندترە، باشترین بەڵگەش تێکست و مێژووی ئەدەبیی کرمانجیی ناوەڕاستە بەبەراورد بە کرمانجیی، کەچیی زۆر کەم دەبینرێ، نووسەرانی کرمانجی ژووروو، وشە و دەربڕینی کرمانجیی ناوەڕاست لە تێکستەکانی خۆیاندا بەکار بهێنن. ئەمەش زۆر بەمەبەستەوە دەکرێ و جۆرێک لە لووتبەرزیی و خۆبەزلزانیی تێدایە.

وەک ئەنسرۆپۆلۆجیستی فرانسیی Bourdieu بۆی چووە، زمانی فەرمیی کۆمەڵگە، بەشێوازە یاسایی و سیاسییەکەی، دەوڵەت دەستنیشانی دەکات، لەم دەستنیشانکردنەشدا، زمانێکی یەکگرتوو، دەبێتە زمانی دەستووریی کە وەڵامدەرەوەی پێداویستییە سەرەکییەکانی جڤاکە( Bourdieu,1991). ئەگەر کورد دەوڵەتی سەربەخۆی نییە، بەڵام حکومەتی دیفاکتۆی هەرێمی کوردستان

دەتوانێ ئەم فەنکشنە لەبری دەوڵەتی کوردیی دوورمەودا، بەتەواویی جێکەوت بکات و بڕیاری لەسەر بدات. ئەگەریش حکومەتی هەرێم، لەژێر هێجەمۆنیی حیزبدایە( پارتیی و یەکێتیی)، ئەوا باڵاترین ئۆرگانی دەستوریی، کە پارلەمان ( نوێنەری حیزبەکان ) و سەرۆکایەتی هەرێمە دەتوانن ئەمە یەکلابکەنەوە. بۆچیی ناکرێ؟ ئەم پرسیارە ساکارە، زۆر شتی خراپی لێ دەخوێنرێتەوە، بەتایبەت کە ساڵ بەساڵ دەیخەنە دواوە.

## زمانی پێشەسازیی و دەستکرد( interlingua )

ئەوە کاری ئینتیلەجینسیای ( Intelligentsia) کوردە، کە زمانی ستاندەردی کوردیی بەم ئاستە لە ئێستێتیک گەیاندووە، ئیتر کاری سیاسییەکان و دەسگا دەستووریی و یاساییەکانە ئەمە ستاندەردایز بکەن و بیکەن بە زمانی ئۆفیشەڵ بۆ سەرجەم جیۆگرافیای هەرێمی کوردستان. ئەگەر تێرمی ئێسنۆزمانەوانیی بۆ کێشەی نێوان ئەم دایەلێکتانە دروستیش نەبێ، بەڵام راستییەک هەیە دەبێ نەترسانە ددانی پێدا بنێین. ئەم دوو دایەلێکتە یەکزمانیی ئێسنیکی کوردییان کوشتووە، وەک فیشمان پێشبینی دەکات، "ئەم جیاوازییە ئەهریمەنییە، سەرئەنجام توندوتیژیی لێدەکەوێتەوە"، ئەگەر ئێسنۆلینگویستەکان، چارەسەری ریشەیی بەمیکانیزمی ئێسنۆلۆجی بۆ ئەم بابەتە نەدۆزنەوە( Fishman,1999,p.453 ). لە باری دیمۆگرافییەوە دەکرێ بڵێین ئەم توندوتیژییەی نێوان ئەم دایەلێکتانە، دابڕانێکی قووڵتر و لێک دوورکەوتنەوەیەکی کولتووریی بە یەکجاریی بەدواوە دەبێ، ئەگەر بەفەرمیی چارەسەر نەکرێ.

## بەرئەنجامی باسەکە:

کورد وەک نەتەوە و ئێسنیک، زمانی ستاندەرد و پرۆفیشناڵی تا ئێستا نییە، تەنها گەلە بەو ژمارە زۆرەوە خاوەنی زمانی لینگوافرانکایەکی فەرمیی نەبێت، هەروەک چۆنیش گەورەترین گەلی بێ دەوڵەتە. لەماوەی پتر لەسەدەیەکدا، زمانی کوردیی (کرمانجیی ناوەڕاست) گەشەیەکی گەورەی کردووە، لەهەموو لقە زمانەوانییەکاندا پێش کرمانجیی کەوتووە. ئەم گەشەی کرمانجیی ناوەڕاستە، بە بیروڕای زۆر لە پسپۆرانی زمانەوانیی ، بناغەیەکی تۆکمەیە بۆ چێکردنی زمانی ستاندەردی کوردیی بەشێوە فەرمیی و سیاسییەکەی، ئەم توێژینەوەیەو زۆرێک لە شارەزایانی بواری زمان پێیانوایە، زمانی ستاندەردی کوردیی، لینگوافرانکای کوردیی، زمانی پرێستیژی کوردیی خۆبەخۆ رسکاوەو تەنها بەفەرمییناسینی لەڕووی سیاسییەوە، بەسە بۆ ئەوەی ئەم ستاندەردایزە بەتەواویی لە جڤاکی کوردییدا، بە یاسا ببێت.

گرفتی تیپە ئارامییەکان ( فارسیی و عەرەبیی جەڕێنراو) و لاتینییەکان، ئەوەندە قورس نییە و هیچ رێگرییەکی بۆ ستاندەردایزی زمانی کوردیی لەهەرێمی کوردستان دانەناوە. ئەمەیان لە پرۆسێسێکی شێنەییدا دەکرێ چارەسەر بکرێ. بەڵام گرفتی سەرەکیی هەنووکە، بەفەرمییناسینی ستاندەردایزی زمانی کوردییە. ئەمەیان پێداویستییەکی ژیارییەو بەپشتداخستنی لەوە زیاتر، مەترسیی گەورەی بەشوێنەوەیە. مەترسییەک کە جیاوازییە کولتوورییەکانی نێوان کرمانجیی و کرمانجیی ناوەڕاست قووڵ و قووڵتر دەکاتەوە. ئەم بڕیاری ستاندەردایزەی لینگوا فرانکای کوردیی، تەنها هەڵوێستەی سەرکردەیەکی کاریزماو دووربینیی سیاسییەکانی دەوێ. لە کۆتاییشدا ئەم توێژینەوەیە، بە لۆژیکەوە بڕوای بەسەپاندنی لینگوا فرانکای کوردیی و زمانی ستاندەرد هەیە. دواکەوتنیش لەم هەنگاوە، مەترسییەکانی دوولەتبوونی زمانی کوردیی بۆ چەند دایەلێکتێکی ستاندەرد، لەبری زمانی ستاندەرد برەو پێدەدات.

References:


1. BAKHTIN, M.M.(1981), *The dialogic Imagination*, Austin, University of Texas Press.
2. BARTELY, W.W(1982) Critical Study: The Philosophy of Karl Popper. Part III: Rationality, criticism, and logic. *Philosophia* 11(1):121-221
3. BOURHIS, R. Y. (1979) Language and ethnic interaction. IN GILES, H. (Ed.) *Language and Ethnic Relation.* Oxford, Pergamon Press.
4. BURDIEU, P. (1991) *Language and symbolic power,* Cambridge, polity press.
5. CHAPMAN, R. W. (1932) Oxford English. *Society for Pure English,* 4. No.XXXVII
6. CHOMSKY,N (1988c) *Language and Politics* C.P.Otero(ed),. Montreal, Black Rose Books.
7. COUPLAND, N. (2000) Sociolinguistic prevarication about 'standard English'. *Journal of Sociolinguistics,* 4(4), 622–634.
8. CROWLEY, T. (2003) *Standard English and the Political of Language,*2nd edition, London, New York., Palgrave Mcamillan.
9. DERRIDA, J (1967) ,*Of Grammatology, trans, Gayatri Chakravorty Spivak Baltimore MD*: The John Hopkins University Press.
10. DURANTI, A. (1997) *Linguistic anthropology,* Cambridge, Cambridge University press
11. FEYEBEND, P(1978) *Science in a Free Society.* London: New Left Book

12. FISHER, J. H. (2004) The Origins of the English Writing System and the Roots of its Letter – Sound Confusion,interview with The Children of the Code( registered interview).
13. Fishman, J.A 1999, *Handbook of Language and ethnic identity*, Oxford: Oxford University Press.
14. Fishman, Joshua (2004) Language maintenance, language shift, and reversing language shift. In *The Handbook of Bilingualism*. Edited by Tej Bhatia and William C. Ritchie. Oxford: Blackwell
15. FOUCAULT, M (1980), *Power and Knowledge*. New York, Pantheon.
16. GILES, H. (Ed.) (1977) *Language, Ethnicity and Intergroup Relations,* London, Academic Press.
17. Gumperz, J (1982) *Discourse Strategies*. Cambridge: Cambridge University Press.
18. HAARMANN,H.L(1986) *Language in Ethnicity: A view of Basic Ecological Relations*, . New York,: Mouton de Gruyter..
19. HALLIDAY, M. A. K. (1998) Things and relations: regrammaticizing experience as technical knowledge. IN MARTIN, J. R. & VEEL, R. (Eds.) *R ea ding Science: Critical and functional perspectives on discourses of science.* London and New York, Routledge.
20. HALLIDAY, M. A. K. (2003) Written language, standard language, global language. *World Englishes, Vol.22, No.4, PP.,2003,* 22(4), 405-418
21. Heine, B (1997) *Cognitive Foundations of Grammar*. Oxford/New York: Oxford University Press.
22. Hill, T ( 1958), Institutional Linguistics, Orbis 7
23. HLHÄUSLER, P. (1996) Ecological and non-ecological approaches to language planning. IN HELLINGER, M. & AMMON, U. (Eds.) *Contrastive Sociolinguistics*. Berlin, Mouton de Gruyter.
24. HONEY,J(1997) *Language is Power, The Story of Standard English and its Enemies*, , London, Boston,Faber and Faber.
25. HOPE,J (2000) , Rats,,Bats,Sparrows and dogs: biology linguistics and the nature of Standard English . IN WRIGHT, L. (Ed.) *The Development of Standard English 1300-1800,*

*Theories, Descriptions, Conflicts.* UK, USA, Australia and Spain,, Cambridge University Press.
26. KABATEK, J. (1997) Strengthening identity : differentiation and change in contemporary Galician. IN CHEHIRE, J. & STEIN, D. (Eds.) *Taming The Vernacular, from dialect to written standard language.* London, New York, Longman.
27. KACHRU, B. (1983) *The Indianization of English: The English Language in India.* Delhi: Oxford University Press.
28. KRISTIANSEN, T. (2001) The Notion of Standard Language in Late Modernity: Introducing Three Studies of Young Danes' Perceptions and Evaluations of Standardness in Language. *LANGUAGE AWARENESS,* 10(1).
29. LAITINEN, L. (1997) Norms made easy: case marking with modal verbs in Finnish. IN CHESHIRE, J. & STEIN, D. (Eds.) *Taming The Vernacular, from dialect to written standard language.* London and New York. , Longman.
30. LIEBKIND, K., TANDEFELT, M. & MORING, T. (2007) why a special issue on the Swedish-speaking Finns? *International Journal of the Sociology of Language.*
31. LODGE, R. A. (2003) *A Sociolinguistic History of Parisian French,* UK,USA,AUSTRALIA,SPAIN,SOUTH AFRICA, Cambridge University Press.
32. LOUW-POTGIETER, J. & GILES, H. (1988) Imposed identity and linguistic strategies. IN GUDYKUNST, W. B. (Ed.) *Language and Ethnic Identity.* UK and USA, Short Run Press.
33. MAC GIOLLA CHRIOST, D. (2003) Language, Identity and Conflict, A comparative study of language. *Ethnic conflict in Europe and Eurasia.* London and New York, Routledge.
34. Milroy, J (1992), *Linguistic Variation and Change,* Oxford and Cambridge, Mass: Blackwell.
35. MILROY, J. & MILROY, L. (1985) *Authority in Language, Investigating Language Prescription and Standardisation, .* London and New York., Routledge and Kegan Paul.
36. MILROY, J. (2000) Historical description and the ideology of the standard langue. IN WRIGHT, L. (Ed.) *The Development of Standard English 1300-1800, Theories,*

*Descriptions, Conflicts.* UK, USA, Australia and Spain,, Cambridge University Press.

37. Milroy, L. and Milroy, J. (1991) Authority in Language. Investigating Language Prescription *and Standardisation* (2nd ed). London/New York: Routledge.
38. Minority Rights Group International {MRG}(ed.), (1997), World directory of Minorities, London: MRG
39. MUHAMMAD, Z. (1991) Islamic Calligraphy: A Technical Overview. IN FISHER, C. G. (Ed.) *Brocade of the Pen: The Art of Islamic Writing.* Michigan State University.
40. MÜLLER, M.(1861), Lectures on the Science of Language, Vol.1.
41. NEGEV,A(1986) *Nabataean Archaeology Today* ,New York: New York University press
42. NEWBOLT, H (1921), *the teaching of English in England: Being the Report of the Departmental Committee Appointed by the President of the Board of Education to Enquire into the Position of English in the Educational System of England* , London, HMSO.
43. Normas Ortograficas e Morfoloxicas de idioma Galego 1982.Real Academia Galega/ Instituto da Lingua Galega.
44. Pinker,S.(1994) *The Language Instinct.* London: Penguin
45. RISSANEN,M(2002) Standaristaion and the language of early statues. . IN WRIGHT, L. (Ed.) *The Development of Standard English 1300-1800, Theories, Descriptions, Conflicts.* UK, USA, Australia and Spain,, Cambridge University Press.
46. ROMAINE, S(1984). *The Language of Children and Adolescents. The acquisition of communicative competence.* Oxford: Blackwell.
47. SHUKLA, H.L (1985*), Language, Ethnicity, and History,* Delhi: B. R. Publishing Corporation
48. SMITH,N (1999) *Chomsky Ideas and Ideals,* Cambridge, New York, Melbourne, Cambridge University Press
49. ST.CLAIR, R. (1982) "from social history to language attitudes. IN RYAN, E. B. & GILES, H. (Eds.) *Attitudes Towards Language Variation.*

50. Tabouret-Keller, A (1997) Language and identity. In *The Handbook of Sociolinguistics*. Florian C(eds). Oxford: Blackwell, pp. 315–26.
51. WEXLER, P. (1993) Unspoken languages. *International Conference of Historical Linguistics*. Los Angeles,.
52. Wright, L(1996), About the evolution of Stand English, in Studies in English Language and Literature: , *Doubt wisely*, papers in Honour of E.G. Stanley, ed. MJ .Toswell and E.M. Tyler, London, and New York ,:Routledge, pp.99-115.

٥٣- لەتیف. س، شێخ وەسانی،ئا(٢٠٠٧) بادینییەکان شێوەزاری سۆرانی تەلاقدەدەن، دهۆک بەنیازە بۆ ساڵی نوێ، کتێبی خوێندگاکان بە زاری کرمانجی دابەش بکات، ریپۆرتاژ، لڤین، ژ.٥٦، سێپتەمبەر، لا٩٧-١١ .

٥٤- شاکەلی،ئە(١٩٩٠)، گیروگرفتی ئەلفبێ و دیالێکت لە زمانی کوردیدا و چەند سەرنجێک،سایتی دەنگەکان، ئارکایڤی نووسەر: سوێد.

٥٥- شاکەلی،ئە ( ١٩٩٩)، زمانی یەکگرتووی کوردی،گەلێک لە دەوڵەتی کوردی،پێویستترە، ،سایتی دەنگەکان، ئارکایڤی نووسەر: سوێد.

٥٤- زەکی، م.ئە(٢٠٠٤) خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان،بەشی ١-٢، چاپی دووەم، چاپخانەو ئۆفسێتی شڤان،سلێمانیی.

**<u>سەرنج</u>: ئەم چوار ژێدەرەی دوایی، سەرچاوەی کوردیین، سکریپتی نووسینەکان و کۆوتەیشنەکانیان وەک خۆی دانراونەتەوەو دەستکاریی نەکراوون.**

-٣-

## (( گفتوگۆیەکی پەرتووک لەگەڵ بەڕێز دکتۆری حەسەنپووردا
## لەسەر "ستاندەردایزی زمانی کوردی" ))

### "ئەمڕۆ یەک زمانی ستاندەردی کوردیی هەیە و ئەوەی تر هەمووی دایەلێکتە"

ئەنداز حەویزیی

بۆ ئەوەی خوێنەر، هەندێ سەرەداوی دەست بکەوێ لەسەر ئەم وەڵامە، باشترە هەلومەرجی وەڵامەکەی د.حەسەنپوور دەستنیشان بکرێ. لەسەروبەندی کەمپەینی ستاندەردایزی زمانی کوردییدا، کلیشەیەکی سەرەتایی بۆ د.حەسەنپوور ، وەک ئەکادیمیستێکی کورد و شارەزا لەبواری ناسیۆنالیزمی کوردییدا نێردرا. ئەوەبوو بەڕێزیان وەڵامیان دایەوە و کۆپییەکیشیان بۆ سایتی دەنگەکان نارد، زۆر دۆستانە بە د.حەسەنپوور راگەیاندرا، لەباری مۆراڵی نووسین و هاوڕێیەتییەوە دروست نییە، پرۆژەکە تەواو نەبووەو بڵاونەکراوەتەوە، وەڵامەکەی ئێوە بڵاو بکرێتەوە. ئەوەبوو بەرێزەوە ئەویش گوتی باشە، بەڵام ئەو بابەتە دەبێ بۆ دیبەتی کراوە بێت، پێی راگەیەندرایەوە، بەدڵنیاییەوە بۆ ئەوەیە، کە شەقامی کوردیی و ناوەندی دەسەڵاتی سیاسیی بهەژێنێ و دەیانی وەک بەڕێزیشتان لەسەری بەقسە بێن.

خۆشبەختانە د.حەسەنپوور وەڵامەکەی خۆی دواخست تا پرۆژەکە بڵاو دەبێتەوە، کە زۆر هەڵدەگری لەسەری قسە بکری، من زۆر خۆشحاڵم ئەکادیمیستێک، شارەزایەک، کەسێک کاتی خۆی تەرخان دەکات و لێکۆڵینەوە لەسەر زمان دەکات و دێتە وەڵام، زۆرخۆشە لەگەڵ ئەکادیمستێکدا بچیتە شەڕێکەوە( ئارگیومێنتی جیاواز جیاواز بوڕووژێنی). بەلام زۆر سەختە بچیتە شەڕێکەوە، لەگەڵ کەسانێکدا بێت، کە مۆتیڤی ئایدیۆلۆژیی ئاوەزیانی کۆنترۆڵ کردووەو لەجەهلدا خوساونەتەوە، جگە لە تۆمەت بەخشینەوە، شتێکی تر فێرنەبوونە و فێرنابن. ئەگەر لەمانە بگەڕێین و بێینەوە سەر ئارگیومێنتەکانی ئەکادیمستێکی کوردی تاراوگە، بەوشێوەیە بیەوێ بەلارێدابردن (. misleading ) بکات و هەندێ نموونە و کەیس وەربگرێ، کە زۆر دوورن لەڕاستییەوە، جێگەی سەیرو تێرامانە! بەلام لەوەش سەیرتر، من پێموایە هەر بۆ کرێدتی ئەکادیمیی د.حەسەنپوور زۆرزۆر خراپە، وەڵامەکەی لەسایتێکدا بڵاوبووەتەوە کە تەنها یەک ڕۆژ پێشتر بەم سەردێرە وەلامی پرۆژەی ستاندەردایزی زمانی کوردیی دایەوە" پەیامی کۆمەڵێک لە ڕاسیستە کەمالیستەکان و خۆپەرست و دز و جەردەی وشە بۆ سەرۆکایەتی هەرێم...." دواتر ناوەکانی بەمشێوەیە بڵاو کردووەتەوە" ناوی ئەو ڕاسیستانەی لە ڕۆژنامەی هاوڵاتیدا بەیاننامەکەیان بڵاوکردۆتەوە". هاوکات نووسینەکەی لەهەمان ئەو سایتەدا هاوشانی ئەم سەردێرە هاتووە "بۆ ٥٣ نووسەری بە شێوەی هیتلەر بیر دەکەنەوە: ئایە لە چین یەک زمان ڕەسمیە؟؟؟ ئایە ڕاستە لە دەرەوەی وڵات خەڵکی بەهدینان بە سۆرانی دەخوێنن؟؟؟".

بەڕاستیی د.حەسەنپوور ئەگەر بچێتە ئەو سایتەوەو نووسینەکەی خۆی ببینێ لەپاڵ ئەو نووسینانەدا، دەبێ چ وەڵامێکی هەبێ.. دواتر خۆشبەختانە جەختم لێکردەوە و پێوەندییم پێوە کرد، لەوەڵامدا گوتی، من نووسینەکەم تەنها بۆ سایتی دەنگەکان و چەند هاوڕێیەکی نزیک و تۆ ( من) ناردووە. ئەوەش ئەو پەیامە دەگەیەنێ، ئەو سایتەی ئەو هەموو تۆمەت و تاوانانە بەسەر خەڵکدا دەبەخشێتەوە، دزیی کردووەو بەبێ ڕەزامەندیی نووسەر، نووسینەکەی بڵاوکردووەتەوە. پەیامێک کە د.حەسەنپوور ، دوای ئەوەی لەدەنگەکان و ڕۆژنامەی ڕۆژنامەدا بڵاوی کردووەتەوە نووسیویەتی" *ئەم نووسینە بۆ بڵاوکردنەوە، تەنها بۆ ڕۆژنامە و ڕۆژنامەی ڕۆژنامە و دەنگەکان نێردراوە". پەیامێکە زۆر

مەغزای سیاسیی ومۆرالیی تێدایە، سایتێکی بێ مۆراڵی پانکوردیستەکان بۆ مەبەستی سیاسیی و چەواشەکاریی ، ئارگیومێنتی ئەکادیمیستێکی کورد بۆ مەبەست و پلانی خۆی بەکاردەهێنێ! لەئەنجامی لاوازییانەوەیە. لەهەمووی گاڵتەجاڕییتر ئەوەیە، د.حەسەنپوور پێویستی بەوە نییە، نازناوی دۆکتەر و خاوەن بڕوانامە لەخۆی بنێ، بەلام لەو سایتەدا، پرۆفایلێکیان بۆ دروستکردووە، کابرا، دۆکتەری زانکۆی تورۆنتۆی کانەدایە. ئەمە بۆ ئەوەیە بەخوێنەری سادەی کورد بگوترێ، ئەها کەسانێتر، کابرای ئەکادیمیستی کورد دژی ئێوەیە ئەی " ئەکادیمیستە راسیستەکان!!!".

وەڵامەکەی د.حەسەنپوور، کە بە کوردییەکی زۆر خراپ نووسراوە، هەرگیز لەوە ناچێ زمانی نووسینی ئەکادیمستێک بێت. بەلام گوتمان ئەو بەفارسیی و ئینگلیزیی خوێندوویەتی و کوردییەکەی باش نییە، بەلام لێرەدا بە کوردیی دەنووسێ و لەسەر پرۆژەیەکی زۆر گرنگیش دەنووسێ کە ستاندەردایزی زمانی کوردییە. کەواتە دەبێ بەزمانێکی پاراو و تەندروست و کەم تا زۆر ستاندەرد بنووسێ. هاوکات د.حەسەنپوور پاش ئەوەی بە لینگوافرانکای جیهانیی ( ئینگلیزیی) ، چەندینجار بۆم نووسی و جەختم لێکردەوە، ئەو پێتشنە دەستکاریی دەکرێ، شتێتری دەخرێتە سەر، کەچیی ئەو گوێی بەوە نەدا، ئەگەر سەیری وەڵامەکەی ئەو بکرێ، دەردەکەوێ ئەو دوو خاڵەی ئەو باسی دەکات، ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە وپانوپۆڕتر بوونەتەوە. واتە هەمان وەڵامی بڵاوکردەوە کە پێشتر نووسیبووی. بەکورتییەکەی د.حەسەنپوور پێیوایە، کورد دەبێ زمانی جووتستاندەردی هەبێ( کە گومانی تێدا نییە دەکاتە دوو زمانی سەربەخۆ)، ئەم تێرمۆنۆلۆجییەی د.حەسەنپوور باسی دەکات بە ئینگلیزیی پێی دەڵێن "bio standard language"،کە بەگاڵتە نەبێ ئەمە لە زمانناسییدا بووەتە نوکتە"joke" و هەرگیز تێناگەم، ئەم دۆستە ئەکادیمیستە چۆن ئەو شتانەی تێکەڵ کردووە؟

ئەو زەمانە رۆیشت بەخەڵکی خاوەن فیکری وەک مەسعود محەمەد بگوترێ نائەکادیمیی، هەموو ئەوکەسانەی بەیەکداهەڵشاخانەکانی نێوان مەسعود محەمەد و د.حەسەنپووری خوێندبێتەوە، تێدەگەن کە تێگەیشتنەکانیان چەند جیاوازە لەسەر هەلومەرجی کوردستان و شۆڕش و کرێکارو جوتیاری کورد. " بۆ ئەمیری حەسەنپوور لەهەر کوییەک بێت" لە نووسینی مەسعود محەمەد،

واقیعی کوردستانی شرۆڤەکردووە، کریکار ، رەعییەت ، چینی ناوەڕاست، ئاغا و دەرەبەگ کێن، چینەکان کامانەن و ستەمی نەتەوایەتیی و پێشێلکردنی مافی نەتەوایەتیی و کوشتنی تاکی کورد لە بۆتەی پرۆژەکانی نەتەوە سەردەستەکاندا ( بەحکومەت و ئۆپۆزیسیۆنیانەوە) کامانەن. بەلام بۆ د.حەسەنپوور، ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم و تێکەڵەیەک لە بیری چەپی رۆژئاوایی ( هیی حەفتاکانی سەدەی رابردوو) ، قورئانیک بوو لادان لێیان کوفر بوو.

هەنووکە چەندین دەیە بەسەر ئەو نامیلکەیەدا دەگوزەرێ، مەسعود محەمەد وەک جەستە مردو رۆیشت، بەلام نووسینەکانی وەک گەوهەر دەمێننەوە. د.حەسەنپوور بەس بەبیانووی ئەوەی مەسعود محەمەد کەسێکی ئەکادیمیی نەبووە و نییە!، تا ئێستاش دەیەوێ لە ئیعتیباری رووناکبیریی و کولتووریی ئەو پیاوە گەورەیە بدات. بەلام بۆ ئەوەی ئەم گەزۆی ئەکادیمییە جاریکیتر هیچ کەسێ نەیملچێنێتەوە، من بڕیاردەدەم ، بەو شێوازەی ئەو پێی دەڵێ ئەکادیمیی ، سەرلەبەری ئەو بۆچوونانەی، لە توێژینەوەیەکی کورتدا تەتەڵە بکەم.

بۆچوونەکانی ئەو لەسەر زمانی ستاندەردی کوردیی، کە پێیوایە کورد وەک ئەرمەن و ئەلبانیی و نۆرویژییەکان، دەبێ زمانێکی جووتستاندەریان هەبێ! وەک خاوەنی ئەو سایتەی نووسینەکەی ئەوی بۆ مەبەستیی سیاسیی( politicized) بلاوکردووەتەوە زاراوەی سۆرانیی و !( سلێمانیی!) بەکار دەهێنێ و زۆر بە وریایی و مەبەستیشەوە، لەکاتێکدا لەسەرجەم پێتشنەکەدا جەخت لەسەر کرمانجیی ناوەڕاست کراوەتەوە. کرمانجیی ناوەڕاستیش ، هێڵێکی پانوپۆڕ لەخۆ دەگرێ، لە دەشتی هەولێر و کەرکوکەوە دەست پێدەکات بە خوار دەربەندیخان و سەروو سۆراندا دەڕوات تا سابلاغ و نزیک سنە، هەموو شارە سەرەکییەکانی وەک سلێمانیی و کەرکوک و هەولێر و مەریوان و سەردەشت و سەقز و سابلاغ و بۆکان..........تاد لەخۆ دەگرێ. بەکارهێنانی زاراوەی سلێمانیی، مەبەستێکی شۆڤینیی و بەلاڕێدابردن و چاوبەستن نەبێ، رقێکی تەریقەتیی و شێخایەتیی و ناوچەگەریی نەبێ لە شاری سلێمانیی، هیچیتر نییە. کە دیارە ئەم رقە لەناو هەندێ بادینانییدا کلپە دەکات و د.حەسەنپووریش بەئاگایی بێ، یان بەدڵسافیی کەوتووەتەوە ناوییەوە.

لە بواری پراکتیکدا، لەبواری پەروەردە و زمانی نووسیندا، چ لەئەرمەنستان( ئەرمینیا) و چ لە ئەلبانیاو کۆسۆڤۆ، زمانی ستاندەرد ساغبووەتەوەو یەک

ستایلی زمانی فەرمیی وستاندەردی نووسین هەیە، ئەوەی کە د. حەسەنپوور باسی دەکات، ئەوە دایەلیکتیکی ستاندەردە، نەک زمانێکی ستاندەرد، بۆ نموونە زمانی ئاخافتنی بەشێک لە ئەرمەنییەکانی دایاسپۆرا، دایەلیکتیکی ستاندەرد قسە دەکەن ومامەڵەی پێوە دەکەن، بەڵام هیچ ئەرمەنییەک نییە لەم دنیایەدا، زمانی ئوفیشەڵی وڵاتی ئەرمینیا بەزمانی ستاندەردی خۆی نەزانێ. ئەستەمە ئەلبانییەک هەبێ لەم دنیایەدا شانازیی بەزمانی وڵاتەکەی خۆی ' ئەلبانیا' و تەنانەت بە زمانی' کۆسۆڤۆ'شەوە نەکات.

هەرچیی سەبارەت بە نۆرویژە، کەیسێکی ناوازەیە، کەیسێکە لەسەقەتیی و ناجۆرییدا بەس کوردی سەرگەردان و زمانەوانەکانی، وێنەی ئەوانن. بەڵام هێشتاش بەو جۆرە نییە کە جووتستاندەردیی لە نووسیندا هەمان باڵانسیان هەبێ، لێرەدا بەکورتیی ئەوەندە دەڵێم، لە وڵاتی نۆرویژ دوو شێوە نووسین بەکار دەهێنرێ، بۆکماڵیی و نینۆرسکیی (Bokm⊥l and Nynorsk)، بەپێی ئاماری ساڵی ٢٠٠٥، پتر لە ٨٦% ی خەڵکی ئەو وڵاتە تەنها بۆکماڵ بۆ نووسین بەکار دەهێنن، لەکاتێکدا تەنها ٧.٥ حەوت و نیو لەسەددا نووسینی نینۆرسکیی بەکار دەهێنن و نزیکەی ٥.٥ پێنج و نیو لەسەددا، هەردووکیان بەکار دەهێنن. بەویژدانی کێ ، بۆکماڵ ستاندەردی تەواو نییەو نینۆرسکیش سەبستاندەرد( substandard) نییە.

منێکی کەرکوکیی، ئەگەر عەبدولخالیقی هەولێریی و باباتاهیری هەمەدانیی ( لوڕیی) و هێمنی موکریانیی و گۆرانی ( هەڵەبجەیی- سلێمانیی) و ئەحمەدی خانیی و نالیی....تاد هەموویان بەو قەڵامەنە نەژمێرم کە ئەدەبی کوردیی و تێکستی کوردیی بەرهەمی ئەوانە، چۆن دەتوانم لە عەقڵییەتیی عەشایەریی و ناوچەگەریی و شارچییەتیی رزگارم بێ! ئیتر ئەم سنگکوتان و پێشخواردنەوەیە بۆ لەشاری سلێمانیی؟ ئەوە چییە ئەکادیمستێک لەگەڵ زبڵنووسێکی' شۆڤینیزمی لەهجەیی'دا یەکدەخات و دژایەتیی سلێمانیی دەکەن؟ ئەوە چ رێکەوتێکە د.حەسەنپووری ئەکادیمیست!، بیروبۆچوونی جووتساندەرد! دەبێ لەگەڵ شۆڤینیستێکی ناوچەییدا، کە پێیوایە، ئەم هەڵمەتی ستاندەردایزی زمانە، سلێمانییەکانی لەپشتەوەن! سلێمانییچییەتیی دەکەن! نەوشیروان مستەفای لەپشتەوەیە! نەوشیروانێک بەکوردییەک دەنووسێ لە کوردیی سەردەمی نوری سەعید دەچێ و هیچ نزیکایەتییەکی بەزمانی کوردیی و ستاندەردایزەکەیەوە

نییە. بۆچیی ئەم هەموو دۆو دۆشاو بەیەکداکردن و بەلاڕیدابردن و شانداچەکاندنە لەئاست مەسەلەیەکی سیاسیی و نەتەوەیی و زمانەوانیی؟ ئەم هەموو کارت تێکەڵکردنە، چ مەبەستێکی سیاسیی و ئەکادیمیی و ئایدیۆلۆژیی لەپشتەوەیە؟

زاراوەی کرمانجیی چ قودسییەتێکی تێدایە، لەچاو زاراوەکانی تردا ئەم هەموو نازەی بدرێتێ و بەپشتی دەسەڵاتی سیاسییەوە کەڵەگایی بکات! بۆچیی هەورامییەکان، زازاییەکان و لووڕییەکان ........تاد هەمان ئاستی لەبەرچاوگرتنیان نەبێ؟ ئەوە قسەیەکی زۆر سەرپێییە کە زمان پێوەندیی بەزۆروبۆرییەوە هەبێ، خۆزگە ئەوەمان لەد.حەسەنپوور نەدەبیست، کرمانجییەکان زۆرترن( لەقسەیەکی گیرفان و سەرخواردنەوە زیاتر هیچیتر نییە)، بۆ دەبێ چاومان دابخەین لەئاست ئینتێلەجێنسیای کوردیی کە لە کوردستانی باشووردا مێژوویەکی دووردرێژی هەیە، کەچیی بێین بەهۆقەی خەڵکی زۆروبۆر، خەڵکی ئاسایی کوردستانی گەورە! زمانی ستاندەرد پێوانە بکەین.

لەکوردستانی باشووردا، زمانی ستاندەردی کوردیی لەقۆناغی تەواوبوون و پێگەیشتندایە، ساغبووەتەوە، ناکرێ جارێکی تر بۆ خاتری ناوچەیەک و عەشیرەتێک و دایەلێکتێک، فۆرمی گراماتیکی ئەم زمانە دەستکارییەکی ریشەیی بکرێ، یاخود وەک هەندێ کەس پێیانوایە، لایەنە رێزمانییەکەی لەگەڵ کرمانجییدا تێکەڵ بکرێ ، زمانی ستاندەرد سێ سیمای سەرەکیی هەیە، سێ کارێکتەری بنچینەیی هەیە، یەکەم ستایلی گراماتیک، دووەم بەکارهێنانی فەرمییانەو زمانحاڵی دەسەڵات، سێیەمیش، زمانی خوێندن و فیکرو بیرکردنەوە، لەهیچ شوێنێکی ئەم دنیایەدا ئەم خەیاڵپلاوییە سەری نەگرتووە، تا زمانی کوردیی بناغەکەی هەڵبوەشێنرێتەوە. ئەوە لەکام هەسارەی ئەم بوونەدا هەیە، گراماتیکی دایەلێکت و زمانەکان تێکەڵ بکرێن، زمانی ستاندەرد، بەسروشتیی گەشە دەکات و بەچەمکی نەتەوەو ناسیۆنالیزمەوە شەتەک دراوە و دەسەڵاتی سیاسیی هەندێجار خێراتر یەکلای دەکاتەوە، ئەم هەموو گرفت و سەختیی و لەمپەرە لەبەردەمیدا، ئەوەندەی تر گیانی نەتەوەیی لەناو کورددا دەکوژێ.

جووتساندەردیی، رازییکردنی شارێک، ناوچەیەک، تایەفەک، عەشیرەتێکە.... رازییکردنی دایەلێکتێکە لەسەر حیسابی کەرامەتی نەتەوەیی، ئایدێنتیتیی

نیشتمانیی ، مافخواردنی دایەلێکتەکانی تری کوردییە لەچەشنی گۆرانیی( هەورامانیی) ، زازایی، لوڕیی و کرمانجیی ناوەڕاست( بەدەیان لق وپۆپییەوە)............تاد. دوو سکریپتیی دوومەڵێکە تاوانە سەرەکییەکەی جەلادەتی بەدرخان کردی، کاتێ دوای هەڵلای کەمالیزم و تۆرانیزم کەوت. ناشیرینکردنی سکریپتی ئارامیی لەلایەن هەندێ کرمانجەوەو چوواندنی بە سکریپتی عەرەبیی و ئیسلامیی ، بەشێکە لەو نەخشەی بەئەهریمەنکردنەی زمانی ستاندەردی کوردیی، کە دەسەلاتی سیاسیی لەکوردستاندا ( بنەماڵەی بارزانیی بەتایبەتیی) جڵەوی بۆی شلکردووەو لێرەو لەوێش بەپارە و بودجەی خەڵکی کوردستانەوە دەیکەن بەقوڕگیانداو دەست لەپشتیان دەدەن.

من زۆر بەئاگایی و وریاییەوە دەڵێم، سەرۆکی هەرێمی کوردستان، کە ڕێگەدەدات بەدەزگای ڕاگەیاندنی حیزبەکەی و فانتەسیی "سەرۆکی کوردستان" ی بۆ دادەتاشن و لەماسمیدیاکانی جیهانییشدا سەرۆکی " اقلیم ، regional " ە، ئەگەر لەسەر دروشم و باقوبریقی کوردایەتیی و سەرۆکی کوردستان بەردەوام بێت، زیانێکی زۆر گەورە لەمێژووی خۆی ، داهاتووی گەلەکەی و لەو هەلومەرجە دەدات، کە کەرکوک بۆ سەر هەرێمی کوردیی دەگەڕێنێتەوە. سەرۆکی کوردستان، لەڕووی سیاسییەوە زۆر سەقەتەو دەستێوەردانێکی ئاشکرایە لە پارچەکانی تری کوردستان وفەرشێکی سووری بیانووە بۆ تورکیاو ئێران و سوریا ڕاخراوە. بۆیە سەرۆکی هەرێمی کوردستان، تەنها دوو ئۆڵتێرنەتیڤی لەبەردەمدایە، سێیەمیان کە بێدەنگییە، لێکدانەوەی خراپی لەسەر دەکرێ.

یەکەم ئۆڵتێرنەتیڤ وەک سەرکردەیەکی سیاسیی، کارێزمایی لەوەدا نیشان بدات و لەڕووی سیاسییەوە زمانی کوردیی لە کوردستانی باشووردا جێکەوت بکات، بەمەش لەسەرۆکی عەشیرەت و حیزب و ناوچەیەکەوە بە کردەوەو بۆ مێژوو دەبێ بەسەرۆکی هەرێمی کوردستان، هەر هیچ نا ئەو هەڵوێستە سیاسیی و نەتەوەییەی باوکی نواندی لەئاستی مەسەلەی زمانی کوردییدا ( بەتایبەت لە ڕووی ئۆفیشەڵیی و زمانی پەروەردەوە)، ئەمیش دەتوانێ بینوێنێ و گەشترین مێژوو بۆ خۆی تۆمار بکات. ئۆڵتێرنەتیڤی دووەم ئەوەیە بکەوێتە دوای هەلای هەندێ لە کرمانجییزانەکان و شۆڤینیستەکانی لەهجەچییەتیی و تۆمارکردنی شەقڵێکی مێژوویی لەجەستەی کورددا، کە سەرئەنجامەکەی

پەرتبوونی یەکجاریی نەتەوەی کورد دەبێت. لەم دۆخەشدا وەک سەرۆکی عەشیرەت و سەرۆکی بادینان و بارزان و دایەلێکتەکەی خۆی گیانی بەمێژوو دەسپێرێ.

لە پێوەند بە تێپەڕاندنی هەستی ناوچەچییەتیی ، لێرەدا چەند نموونەیک باس دەکەم جێگەی سەرنجن. عامر باجەلان، کە زۆر بەسادەیی دەنووسێ ، بەڵام زۆر پەروشی ئەو سیمبۆلیزمەیە کە نەتەوەو زمان پێکەوە دەبەستێتەوە، دەستبەرداری زاراوە لۆکاڵییەکەی خۆی( لوڕیی) بووەوە بەزمانی ستاندەرد دەنووسێ و شانازیشی پێوە دەکات. بەڕێوەبەری سایتی دەنگەکان، کە بەبنەچە کاکەیین، تەنانەت لە ناو ماڵەکەی خۆیشیاندا لەناو ماڵ و منداڵدا، لە وڵاتی کانەدا، بەزمانی ستاندەردی کوردیی دەئاخفن و زاراوەکەی خۆیان بۆ گرنگ نییە. فەتاح زاخۆیی ئامادەیە لەپێناوی زمانی ستاندەردی نەتەوەی کورد لەکوردستانی عێراقدا دەستەبەرداری زاراوەکەی خۆی بێ و نووسینی زمانی ستاندەرد بپەژرێنێ. موحسین جوامێریکی هەولێریی، دەستبەرداری دایەلێکتە لۆکاڵییە هەولێرییەکەی خۆی ببێ و تەنها و تەنها بەزمانی ستاندەرد بنووسێ، ئەمانە هەڵوێست و تێگەیشتن لەچەمکی نەتەوەو و هەستی بەرزی نیشتمانیی نەبێ، چییترن؟

دواتر سەرجەم پرۆژەی ستاندەردایزەکە جەخت لەیەک پارچەی کوردستان دەکاتەوە، کە کوردستانی باشووره( کوردستانی عێراق تەنها). بە چ تەرازوویەک ڕەوایە، کرمانجیی ( یان سەبدایەلێکتی بادینانیی) بکرێتە هاوشانی ئەوەی د.حەسەنپوور سەرمەستانە پێی دەڵێ ' سۆرانیی' و ببێ بە جووتستاندەرد لەگەڵ زمانی ستاندەردی کوردییدا. مەسەلەی زمان، مەسەلەی چینایەتیی و خەباتی کرێکاران و شۆڕشی کرێکاریی نییە، لەیەک کاتدا و لەهەموو شوێنێک پێکەوە بکرێ، وەک د.حەسەنپوور بەچەپێکی رادیکاڵ ناسراوە، بەئەنتی ئەمێریکایی و ئیسرائیلیی ناسراوە و بیرکردنەوە چینایەتیی و چەپییەکەی بەسەریدا زاڵەو لایەنە ئەکادیمییەکەی زۆر کاڵکردووەتەوە. زمانی کوردیی پێوەندیی بە دەوڵەت و ناسیۆنالیزمەوە هەیە. لەکوردستانی عێراقدا کورد پاڵێکی پێوە بنێی دەکەوێ بەسەر دەوڵەتدا، دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیی لە کوردستانی عێراقدا بەڕێوەیە ئەگەر ئیرادەی سیاسیی لەپشتەوە بێ. بارزانییش سەرۆکی دیاربەکرو ماردین و سابڵاغ و قامیشلۆ نییە، ئەو تەنها و

تەنها سەرۆکی دهۆک ، سلێمانیی و هەولێرە ( لەگەڵ کەرکوکدا ئەگەر بگەڕێتەوە). بۆیە زۆر گرنگە، کاتێ لەڕووی سیاسییەوە بیر لەساغکردنەوەی زمانی ستاندەردی کوردیی دەکاتەوە، بیری پانکوردیزمیی فڕێ بدات و بیرێکی واقیعیی سیاسیی پیرۆز بکات.

ئەو پرۆژەیەی پێشکەشکراوە بەدەسەڵاتە جۆراوجۆرەکانی سیاسیی لەهەرێمی کوردستاندا، پرۆژەیەکە، زۆر بیری لێکراوەتەوە، دەیان پسپۆرو شارەزا، لە ئەدەبی کوردیی، تێکستی کوردیی، مێژووی کورد، تیۆریی و دۆکترینەکانی نەتەوە، ناسیۆنالیزم، زمانناسیی، دروستکردنی دەوڵەت_نەتەوە ( Nation-State Building )، پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان، سۆسیۆسیاسیی، سۆسیۆکولتووریی و ئەنسرۆپۆلۆجیای زمان بەشدارییان تێدا کردووەو بیرورا گۆڕدراوەتەوەو دیبەیتی لەسەرکراوە. پرۆژەیەکە زۆر دووربینانەو واقیعییانە هەلومەرجە جیۆسیاسییەکانی ناوچەکەو کوردستانی لێکداتەوە. هاوکات، پرۆژەیەکە، دوو پێشنیاری زۆر مڵ و گونجاوی کردووە. زمانی خوێندن و پەروەردە، زمانی فەرمیی دامودەزگا حکومییەکان لەسەرتاسەری هەرێمی کوردستاندا یەک زمان بێت. بەڵام تەواوی دایەلێکتە سەرەکییەکان ( نەک هەر بادینانیی) ، لە چوارچێوەی یەک پرۆگرامی خوێندنی زمانی کوردییدا بخوێندرێن و گرنگییان پێ بدرێ. واتە لە سەرجەم هەرێمی کوردستاندا، لە چوارچێوەی یەک curriculum دا بێت، لەناو Syllabus ی زمانی کوردییدا. هاوزەمان، ئینستیتیوت و ناوەندە ئەکادیمییەکان، لێکۆڵینەوە لەسەر دایەلێکتەکان بکەن، بۆ خزمەتکردنی زمانی ستاندەردی کوردیی لەئاستێکی گشتگیردا، زمانێک کە ببێتە دایکێکی میهرەبانی هەموو دایەلێکتەکان.

کەواتە کاتێ باسی زمانی ستاندەرد لەکوردستانی عێراقدا دەکرێ، چ پێویست بە شێرو ڕێویی ئەرمەنییەکان و ئەلبانییەکان و نۆرویژییەکان دەکات، باشە ئەو ویژدانە چۆن دەبێ سڕ بێ لەئاست لووڕییەکاندا ( ئەوانەی بەفەیلی ناسراون) خۆ ئەوان بەهەموو لۆژیکێک زۆرترن لە بادینانییەکانی کوردستانی عێراق. یاخود بۆ دەبێ هەورامییەکان هەمان مافیان نەبێ، ئەوەش کە کرمانجییەکان زۆرترن لەئاستی هەموو کوردستانەکاندا، لەقسەیەکی بێ بناغە زیاتر هیچی تر نییە. دەیان ساڵە وادەڵێین، بەڵام یەک ئاماری باوەڕپێکراو، یەک ستاتیستیکی ( ئامار - statistic) جێی متمانە نییە کە ئەوان زۆرتربن. لەئاستی گشت

کوردستانەکاندا، ئەگەر وەک یەک نەبن، هەرگیز زۆرتر نین. پانکوردیستەکان و ئەوانەی خەیاڵی کوردایەتیی دەکەن، هەمیشە دەیانەوێ ژمارەی کوردەکانی کوردستانی باکوور بەرز بکەنەوە. بەڵام هەرگیزاو هەرگیزیش لەدەوروبەری ١٠-١٥ ملیۆن تێپەڕ ناکەن، کە ئەگەر لایەنە زۆرەکەیشی وەربگرین، ١٤ ملیۆن و نۆسەد هەزارایان هەر نازانن کوردیی بنووسن.

بەداخەوە، ئەکادیمیستێکی وەک د.حەسەنپوور کە پێموایە ئەمە یەکێک دەبێ لە هەژارترین تێڕوانینەکانی ئەو بۆ زمانی ستاندەردی کوردیی، جیاوازیی دایەلێکتەکانی کورد وەک دوو نەتەوە و دوو ئێسنیکی جیاوازی سرب و کروات یاخود چیک و سلۆڤاک سەیر دەکات. دێت باسی دڵسۆزیی و خەمخۆریی بۆ کورد دەکات و دەڵێ ستاندەردایزی "سۆرانیی"!! گەلی کورد دەکات بە دوو بەشەوەو ئەو پرۆسەیەی جیابوونەوەیە خێراتر دەکات. لەکاتێکدا بیرکردنەوەی ئەو وەک چەپێکی ئەکادیمسیت هەمیشە پێچەوانەی مافە نەتەوایەتییەکانی کورد بووەو هەمیشەش بەچاویلکەی ئایدیۆلۆژیای مارکسیزمی ئێرانییەوە سەیری کێشەی کوردی کردووە. ئاخر ویژدانی ئەکادیمیی و زانستیی لەکوێیە، چوار نەتەوەی باکگراوند جیاواز( سرب و کروات، چیک و سلۆڤاک)، جیاواز بەئەندازەی تورک و عەرەب و فارس و کورد لەڕووی ئێسنیکییەوە، چۆن بە کورد و دایەلێکتەکانی بەراورد دەکرێن؟، کارەسات ئەوەیە ئەکادیمیستێک ئەم قسەیە بکات، نەک جاهیلێکی ناوچەپەرست و شۆڤێنیستێکی لەهجەیی ناوچەیەکی کوردستان بیکات.

ئاخر ئەوەی کرمانجیی و هەورامیی زووتر دەستیان کردووە بە نووسین، بەجێی خۆی و مەم و زینی خانیی، کە یەکێکە لەشاکارەکانی کورد، لەسەر سەرمان، مەولەویی لەسەر دڵمان، باباتاهیر لەسەر چاومان، بەڵام ئەوەمان لەبیر نەچێ بە سکریپتی ئارامیی نووسراون نەک بەسکریپتی تورکیی-لاتینیی، کە وەک شێرپەنجە گیانی میللەتی کوردی دووڵەتکردووە. بەڵام ئەو نانە، نانە ئەمڕۆ لەخوانە. کتێبخانەی کوردیی ، زانست و ئەکادیمیای کوردیی، ئەدەب و تێکستی کوردیی بەم زمانە ستاندەردە دەنووسرێ و نووسراوە بەهەمان ڕێژەی زمانی بۆکماڵییەکەی نۆرویژ، ئەگەر زیاتر نەبێ کەمتر نییە، واتە بە ڕێژەی ٨٦% ی تێکستی کوردیی . با فێڵ لەخۆمان نەکەین، کرمانجییەکان لەدوای چەند تێکستێکی مەزنەوە کە بەسکریپتی ئارامیی- کوردیی نووسراوە،

چییان هەیە بە سکریپتی تورکیی لاتینیی کە بەراورد بکرێ بە هەردوو کرمانجیی ناوەراست و خواروو ؟ ئەوەی د.حەسەنپوور بەهەڵەیەکی سیاسیی و زمانەوانیی و ئایدیۆلۆژیی بە سۆرانیی ناوزەدی دەکات و مەلعونی دەکات .
لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بدرێ، کرمانجیی ناوەراست و خواروو ئەوەندە تێکەڵ بوونە یەک فۆرمی نووسینیان وەرگرتووە، ئەوە تەنها هەندێ ئایدیۆلۆژیست و ناوچەگەرن بەناوی کرمانجیی ژووروووەوە چەتوونیی و لاساریی دەکەن و واز لە پۆزلێدانی ناوچەیی ناهێنن و مل بەدیفاکتۆی زمانی ستاندەردی کوردیی نادەن.
هەمووومان حەزمان دەکرد لە بادینان و ناو ئاخێوەرانی کرمانجییدا، تێکستی مەزنیان هەبووایە، ئاخر من بڵێم چیی، هەموو تێکستی بادینان کەرەتی ژمارە ۱۰۰۰ یش بکەیت تەنها دەقێکی مەزنی وەک شاری مۆسیقارە سپییەکانیان لێ پەیدا نابێ. بڵێین چیی رۆماننووس و چیرۆکنووسی وەک شێرزاد حەسەن لە ناوچەکانی هەولێر پەیدا دەبێ ، شێرکۆ بێکەس و دەیانی تریش لە سلێمانیی و کەرکوکەوە دەردەکەون. زمانناس فەرهاد شاکەلیی لە گوندێکی گەرمیانەوە پەیدا دەبێ، ئێ زۆریی و بۆریی کەێ سەنگی مەحەکە لەیەکلاییکردنەوەی زماندا! ئەگەر بەزۆریی زۆرداریش پێیان سەلماندیان زۆروبۆرترن. من بڵێم چیی باشترین و چالاکترین و ئازادترین رۆژنامەو هەفتەنامەکانی کوردستان ( هاوڵاتی، ئاوێنە، رۆژنامە) لەسلێمانیی دەردەچن، باشترین سایتی کوردیی بەم زمانە دەوەشێنرێن. باشترین کتێبە کوردییەکان بەم زمانە چاپ دەکرێن.
یەکێک لەو هەڵە زەقانەی د.حەسەنپوور دەیکات ئەوەیە، لەسەر مەسەلەی چاپەمەنیی دەڵێ هیچ بابەتێک نییە کە بکرێ بە سۆرانی باسی بکرێ و بە کرمانجیی نەکرێ بەراستیی کەی وایە؟ من یەکێکم لەو خوێنەرە فانەتیکانەی بۆ ماوەی پێنج ساڵی رەبەقە رۆژانە نزیکەی ۱۲- ١٤ سەعات دەخوێنمەوە، بەکوردیی و ئینگلیزیی، جارجارەش بەعەرەبیی و فارسیی، بەڵام لەژیانمدا ۱۰ لاپەرەم لە ئەدەبیاتی دایەلێکتی کرمانجیی بە سکریپتی لاتینیی –تورکیی نەخوێندووەتەوە، تەنها بادینانیی بەسکریپتی ئارامیی دەخوێنمەوە. چونکە وەک کورد، زمانێکی زۆر باڵاو جوان و ستاندەردمان هەیە، چ پێویست دەکات کاتی خۆم بەدایەلێکتیکەوە ئەویش بەسکریپتی کەمالیزم نووسرابێ، خەرج بکەم. ئا لێرەدایە مەترسیی سەرەکیی ئەم دابرانە دەردەکەوێ. تا ئەوان بە سکریپتی

تورکیی لاتینیی بنووسن و بەدایەلیکتە شیرینەکەی خۆیان بنووسن و زمانی کوردیی فێرنەبن و گرنگیی پێنەدەن، ئەم شەقڵی دوورکەوتنەوەیە، گەورەو گەورەتر دەبێتەوە.

هەرگیز لەو بڕوایەدا نیم، زمانی ستاندەردی کوردیی لە هەنووکەدا ، بتوانرێ بە سکریپتی لاتینیی تورکیی بنووسرێ، ئەم سکریپتە ئارامییەی پێی دەنووسرێ، گرفتێکی ئەوتۆی نییە، بەپێچەوانەوە ئەوە ئەو سکریپتە تورکییەیە، کە دایەلیکتی کرمانجیی بەدەستیەوە گیانەلایەتی. دەکرێ سکریپتی لاتینیی نوێ دابڕێژرێ( بەدڵنیاییەوە سکریپتەکەی جەلادەت بەدرخان نا)، بەلام ئەمە لە هەنووکەو داهاتوویەکی نزیکیشدا ئەستەمە. زۆر هەوڵدرا، لەهەولێر و هەندێ شوێنی تر نووسین بە سکریپتی تورکیی-لاتینیی قاچ بگرێ، بەلام هەموویان هەر چۆن بەسەقەتیی لەدایک بوون! هەر بەئیفلیجییش زۆر زوو دەمردن. سێ پارچەی کوردستانیش بەسکریپتی ئارامیی دەنووسن، ئیتر کوردستانی باکوور ئەگەر بیر لەوە بکاتەوە ئەو دوومەڵەی جەلادەت بەدرخان کردییە جەستەی کوردەوە، لەبنەوە ببڕێتەوە، ئاسمان دەڕووخێ! ئەگەر کرمانجییەکان، کوردبوونیان بۆ مەبەستەو کرمانجیبوونیان بەلاوە گرنگ نییە، بۆ بیر لە پەسەندکردنی زمانی کولتووریی،فیکریی، سیاسیی و زانستیی نەتەوەی خۆیان ناکەنەوە، بۆ شانازیی بەوەوە ناکەن، کە کورد لەکوردستانی باشووردا زمانێکی ستاندەردی هەیەو بێن بەهەمووومان خزمەتی بکەین و موتوربەی بکەین ( لە ناوقەد بەسەرەوە، نەک لەڕەگەوە، لە لق وپۆپەکانیانەوە، نەک لە گرامەرەکەیەوە)

بۆ لەکوردستانی عێراقدا، نابێ بەفەرمیی زمانی کوردیی ساغبکرێتەوە؟ د.حەسەنپوور لەخوتوخۆڕایی چووە کوردستانەکانی تری تێکەڵ کردووە و خۆی لە کرۆکی مەسەلەکە دزیوەتەوە. بۆ دەبێ لە ولاتێکی وەک چایینەدا( چین) کە ڕێکوڕەوان لەجەنگەڵی زمان و دایەلێکت دەچێ، پتر لە یەک بیلیۆن و سێسەد میلیۆن مرۆڤن، سەدان نەتەوەو ئێسنیک و زمان و دایەلێکت و باکگراوند و ئایینی جیاوازی تێدایە، ئەکادیمیستێکی چەپ، پەیدا نابێ و داوای جووتستاندەردیی بکات؟ لەکاتێکدا لەسەردەمی کۆماری گەلیی چایینەدا، دایەلێکتی تەنها یەک شار( پایتەختی ولات) بەسەر ئەو دارستانە چڕوپڕو زەبەندەدا وەک زمانی ستاندەرد، ساغکرایەوە ، کە لەهەنووکەشدا ژمارەی

دانیشتوانی ئەو شارە ناگاتە ١٥ میلیۆن پاش ئەو هەموو پێشکەوتنە تەکنەلۆژیی و کۆچکردنە زۆرەی رووەو پایتەخت کرا. بەڵێ بە پێوانەی ئەمڕۆ زمانی ١٥ میلیۆن بوو بە زمانی پتر لەیەک بیلیۆن و سێسەد میلیۆن مرۆڤ، بوو بەزمانی ئۆفیشەڵی چەندین وڵاتی ترا، بوو بە زمانی UN. بۆچیی ئەکادیمیستێک نە لەچاپینەدا و نە لەهیچ شوێنێک، نالی، ماندەرین و کانتەنیز ببن بە جووت-ستاندەرد!

ئەم باسە بەرکوڵە، لە توێژینەوەیەکی تردا لەسەر زمانی ستاندەردی کوردیی و چەمکی نەتەوەو زمان، لەکوردستانی باشووردا، وردتر باسدەکەم.

( ٤ )

## (( نەتەوەو زمانی کوردیی؛ دایگلۆسیا یان جووتستاندەرد! ))

ئەم باسە، لە گرنگیی ستاندەردایزی زمانی کوردیی لەهەلومەرجی سیاسیی و کۆمەلایەتیی و کولتووریی کوردستانی باشوور دەکۆلێتەوە. لە کوردستانێکدا، کە زمانی کوردیی تەواو دایگلۆسیا diglossia بووەتەوە، لەزماننناسییدا ئەم دایگلۆسیایە کاتێ بەکاردەهێنرێ ئەگەر لەهەرێمێکدا زمانێکی پرێستیژی prestige بالا لەکاردا بێت، لەلاتەنگەشەوە زاراوەیەکی لۆکالیی خەریکی بەردەفرکێ ببێ ( Walters 1996 ) . لە هەلومەرجی کوردستاندا، زمانی کوردیی زمانێکی دایگلۆسیایە، لەکاتێکدا، ئەم پارچەیەی کوردستان، کە بەپێی ستاندەردە نێودەولەتییەکان باکووری عێراقە، بە قۆناغێکی زۆر ستراتیژیی و تێژتێپەر( بەبەراورد بە دەیان سال لە سەرگەردانیی بزوتنەوەی سیاسیی کورد) و چارەنووسسازدا دەگوزەرێ کە بەقۆناغی نەتەوە-دەولەت دروستکردن دێتە ئەژماردن ، ئەم دۆخەش بەشێنەیی لەپێشڤەچووندایەو گاڤی باشیشی بریوە، بەلام ئەم پرۆسێسە بە چڕوپڕیی لەئاست هەرێمی کوردستانی عێراقدایە، دۆخی سیاسیی و کولتووریی کوردی پارچەکانی تری کوردستانی کەمتر گرتووەتەوە، یاخود لەباشترین دۆخدا، هەلومەرجی کوردستانی عێراق رەنگدانەوەی پۆزەتیڤیی و نێگەتیڤیی هەبووە بەسەریانەوە.

ئەم باسە، بەقووڵیی بڕوای بەوەیە، لە ئێستادا، یاخود لەداهاتوویەکی نزیکدا، لەهەلومەرجێکدا کە گەلی کورد و ناوچە دابڕاو و جیاوازەکانی، پاش دابڕانێکی زۆری مێژوویی و سیاسیی و جیۆگرافیی ناکرێ بەهیچ شێوەیەک بیر لەزمانێکی ستاندەردی گشتگیر لە ئاستی کوردستانی گەورە(!!) دا بکرێتەوە. کوردستانی گەورە وەک مانگا لات و ڕەق و وشکەوەبووەکەی میسرو یەمەن و ئوردن و عێراقی هەشتاکانی سەدەی رابردوو، دەهێنرێتە پێشچاو، کاتێ ویستیان یەکێتییەکی عەرەبیی دروست بکەن. ئەم بیروبۆچوونە تەنها لەلای هەندێ نەتەوەپەرستی شۆڤینیست و دەمارگیری ناسیۆنالیست و خۆشخەیاڵ و سەرخۆش بەکوردایەتیی هەیە و بازاڕی گەرمە کە لەیانەکانی گەمژەیی و گەلۆرییدا پاڵیان لێداوەتەوە و قسەڵۆکی بێ باج دەکەن. بەڵام دەکرێ ئەم زمانە کوردییەی لە دوو بەشی سەرەکیی پارچەکانی کوردستان، زمانی باڵاو پرێستیژە، زمانی نووسینی کوردیی و تێکستی کوردییە، بکرێ بە پردێکی پێکەوەبەستن لەنێوان سەرجەم دایەلێکتە جیاوازەکانی کوردستاندا. ئەمەش چەندێک کاری ئینتێلەجێنسیای کوردە، ئەوەندەش کاری دەسەڵاتی سیاسیی و ناسیۆنالیزمێکی دووربینە.

هاوکات ئەم نووسینە بڕوای بەڕەخنەگەلێک نییە بەزمانی گوڵ بنووسرێن، زمانی گوڵ لەهەر شوێنێکی ئەم دنیایە بیخوات، لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیی کورددا نایخوات. دەسەڵاتێک کۆمەڵی مۆگابیی بەرهەم هێناوەو کوردستانیشیان لەبری دوبەی و هۆنگ کۆنگ، بە زیمبابۆ و مۆزەمبیکیان کردووە. کوردستانێک دەسەڵاتێکی سیاسیی حوکمڕان بێ، کە ئایدیۆلۆژیای تایەفەگەریی و ناوچەچییەتیی و دایەلێکتبازیی و تۆڕوپێوەندییەکانی خێڵ بیجوڵێنێ، زمانی گوڵ چۆن و لەگەڵ کێدا دەیخوات. کۆمەڵی شۆڕشگێڕی ئەدیداس دڕینی حەفتاکان و هەشتاکان وەک کەڵەگا سواری سەری خەڵکی کوردستان بوونەو ١٨ دانە ساڵە بودجە و دەرامەتی نیشتمانیی هەڵدەدەن و ئاودیوی دەکەن و بانکە تایبەتییەکانیان زیاتر بەپارەی کاش دەئاخنن و بودجەو دەرامەتی کوردستان دیزە بەدەرخۆنە(laundry) دەکەن، کەچیی کارەبا بۆ کوردستان دابین ناکەن. لە خاکێکدا کە کوردی تێدا جینۆساید کرا، ئەوە دوو دەیەیە، ژنی تێدا جینۆساید دەکرێ. گەورەترین پەڵەی شەرمەزاریی بەناوچەوانی تاک تاکی کورد و دەسەڵاتی کوردییەوە لەسەر ئەو قەسابخانەیەی کە پیاوە شەریفەکانی کورد و

دەسەڵاتی شەریفی سیاسیی، ژنان و کچان ، دایکان و خوشکانی خۆیانی تیدا قەتڵوعام دەکەن. لەسەر ئەم جینۆسایدەی ژنان، نەوەکانی داهاتوو، میژوو، ویژدانی مرۆڤایەتی تف و نەعلەت لەریکۆردی ئەو دەسەڵاتە کوردییە دەکات. بەکورتیی لەگەڵ ریکۆردی ئەم دەسەڵاتە تایەفیی و میلیشیاییەدا، لەگەڵ دەسەڵاتی قەتڵوعامی نامووسپەرستی ژناندا، لەگەڵ دەسەڵاتی خێڵ و هۆز و ناوچەپەرستدا، زمانی گوڵ کەی خواردوویەتی تا هەنووکە بیخوات.

بۆیە کۆی باسوخواسی ئەم نووسینە رەخنەی زبرو رەقە. رەخنە دەبێ بەزمانێکی ئەوەندە گورچگبڕ بێ، کە ناوجەرگ بەربداتەوە، نەک بە شێوازی سووکایەتیی و هێرش بۆسەر کەرامەتی مرۆیی هیچ کەسێک، نەک بە جوێن و پەلاماردان، بەڵکو بەدانانەوەی خاڵ لەسەر ئەو کارانەی خودی دەسەڵات کردوونی. بەواتایەکی تر دەبێ دڵی ئەو دامودەسگاو ئایدیۆلۆژیاو حیزبانە توند توند بگوشرێ، کە هیچ ناوێک هەڵناگرن لە دزی زۆر گەورە زیاتر. ئەگەر لەوڵاتێکی دیمۆکراسیی بووایە، زۆربەی سەرکردە سیاسییەکانی کوردستان، بەخاوێن و فایلدارییانەوە، بە قارەمان و ترسنۆکیانەوە، لەسەر مەسەلەی گەندەڵیی و دزینی سامانی گشتیی و وێرانکردنی ژێرخانی کوردستان، دەبووایە هەموو تەمەنیان لە زینداندا بەسەر ببردایە. ئیتر رەخنە بەزمانی گوڵ و کۆمەڵێ مافیای چاوچنۆکی سیاسیی کوجا مەرحەبا. ئاخر کورتانی ئەم دزیی و گەندەڵییە ئەوەندە ئەستوورە، شمشێرە ئەفسووناوییەکەی ئیمامی عەلیش نایبڕێ، ئیتر رەخنە بەزمانی گوڵ و عەتر و مێخەک و لاولاو چیی پێ دەکرێ؟

یەکێ لەو رۆڵە گرنگانەی زمان دەیبینێ لە مانیفێستۆی چێکردنی نەتەوە-دەوڵەت دا، ئایدینتیتی پەیداکردنە، لێرەوە زۆر گرنگە بەوردیی سەرنج بدرێ، بەدیدی Gellner ئەنسرۆپۆلۆجیستی فرانسیی، ئەوە مانیفێستۆی ئایدێنتیتیی زمانە، کە سنوورەکانی زۆرێک لەچەمکی سیاسیی نەتەوە- وڵات دادەرێژێ(Gellner 1994). لەکاتێکدا لە روانگەی مۆدێرنیزمەوە، زمانێکی باڵا بۆ پەروەردەو خوێندن بەهایەکی گرنگی هەیە، کەچیی ناسیۆنالیزمی کوردیی و پانکوردیستە جاهیلەکانی کورد، زۆر رۆمانتیسیزمانە romanticism لە شکۆمەندیی زمان، وەک گەوهەرێکی نەتەوەیی ئەبستراکت دەڕوانن، وەک خولیایەکی نیشتمانیی بۆی دەڕوانن، وەک لەوەی فەنکشنێکی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئایدێنتیتی بێت( Coulmas 1991 ).

ئەگەر کورد بەتەمای گەڕانەوەی کەرکوکە بوسەر هەریمی کوردستان، دەبێ زۆر شت لە یاساورێساکانی کوردستان و عەقڵی حیزبیی و سیاسییدا بگۆڕێ. زمانی عەرەبیی و تورکمانیی و ئاشووریی بکات بەزمانی ئوفیشەڵی کوردستان یان لای کەم لەناوچەکانی خۆیاندا، نەک بنزاراوەیەکی کوردیی، کە ڕەگی خزمایەتیی و بەرەبابیی و بنەماڵەیی لەگەڵ بەشێکی دەسترۆیشتووی دەسەلاتی کوردییدا هەیە، مەگەر چاوی کاڵی بادینانییەکان لە لووڕییەکان گەشترو جوانترە، مەگەر ئەوان مرۆڤی بالاترن و لووڕییەکان مرۆڤی خوارترن. باشە بەکام پێوەری کولتووریی و سیاسیی، بادینانییەکان زێدەمافییان هەبێ بەسەر لووڕییەکاندا، لەکاتێکدا، لووڕییەکان بەژمارە زۆر زیاترن لە بادینانییەکانی هەرێمی کوردستانی عێراق ( ناوچە تەعریبکراوەکانیشیان لەگەڵدا). بۆچیی دەبێ زاراوەی هەورامییەکان وەک خاپەڕۆ سەیر بکرێ و بنزاراوەکەی بادینانیش نەخشی سەربەرد بێت. ئەم جیاوازیی و هەلاواردن و بەرکەنارخستن و پەراوێز خستنانە، هەمووی زۆر بەوردیی عەقڵی سیاسیی و حیزبیی و ئایدیۆلۆژیی بنەماڵەیەکی لۆرد و دەسەلاتداری کوردستانی لەپشتەوەیە.

لە دروستبوونی چەمکی نەتەوەو دەوڵەتی نەتەوەیی لە ئەوروپادا، یەکزمانیی و زمانێکی نیشتمانیی ستاندەرد، بناغەیەکی سەرەکیی بووە بۆ پرۆسێسی بەنەتەوەبوون و بەدەوڵەتبوون(Caviedes 2003 ). لە سەردەمی مۆدێرنیزم و گلۆبالیزەیشندا، داتاکان و مەوداکانی ئەم چەمکانە ئالوگۆڕیان بەسەردا هاتووەو زۆرێک لە سۆسیۆلینگویستەکان، چەمکە کۆنەکان ڕەتدەکەنەوە. بەلام نەک بەو واتایەی، یەکزمانیی و ستاندەردبوونی زمان، زەمینەی خۆی لەدەست دابێ. بەڵکو بەو واتایەی لە فاکتەرێکی سەرەکییەوە بووە بەفاکتەرێکی مامناوەندیی. ئەم ڕاستییەمان باشتر بۆ دەردەکەوێ، ئەگەر وەک پانکوردیستە جاهیلەکانی کورد، تووشی ئینتەلا نەبین و ڕاستییە مێژوویی و سیاسیی و جیۆگرافییەکان بەوردیی و ڕۆشنیی ببینین. ئەم نووسینە بەقووڵیی بڕوای وایە، کە یەکزمانیی بۆ نەتەوەی کورد لەئاستی کوردستانی گەورەدا خۆکوژییەکی زۆر ئەحمەقانەیە. چونکە شتێکی زۆر نالۆژیکییە، بە ئاوەز و پەڕپووتیی پانکوردیست و ئەوانەی کوردایەتیی! دەکەن، توخنی approach بابەتێکی وەک زمانی ستاندەرد ببینەوە.

بەداخەوە لەناو کورددا زۆر کەم لێکۆڵینەوە لەسەر رەهەندە خراپەکانی ناسیۆنالیزمی کورد کراوە، بەتایبەت لەسەر دۆکترینی سەقەتی کوردایەتیی!. زۆر لە توێژەرەوە کورد و بیانییەکانیش لەو بڕوایەدان، لە بنەڕەتدا کورد ناسیۆنالیزمێکی بیرتیژ و کارامە و نیشتمانیی نەبووە. بەڵام ئەوەی ئێستا هەیە، لەناو هەندێ پانکوردیستدا، کارەساتێکی زۆر گەورەیە. هیچ پانکوردیستێ عەقڵی بەوە ناشکێ کەزمانی کوردیی چەند گرنگ و ستراتیژییە، چەند فاکتەرێکی سەرەکییە لەرۆڵی بنیاتنانی نەتەوەدا. وەک مێگەل هەموو شتێ بەیەکدا دەکەن، هەرچەند دەکۆشم یەک پانکوردیستی ئەکادیمست و شارەزا لەکورددا نابینم، ئەوەی هەیە هەمووی شۆڤینیزم چاوی کوێر کردووە، رقبوون لەعەرەب و فارس و تورک، رقبوونەوە لەکولتووریان، لە رۆشنبیرییان، لە هەموو شتێکیان، ئەجێندای سەرەکیی ئەم پانکوردیستە جاهیلانەیە.

فەرموو ئەوە کوردستانێکی گەورەو گران، یەک تاقە پانکوردیستی شۆڤینیست نییە خەمی زمانی ستاندەردی کوردیی بێ. بەڵام ئەگەر عەبدوڵا ئۆجەلان دوومەڵێک لەڕانی بێ، بەمانگ خەویان لێ ناکەوێ، بەرەشکە شیعر و پەخشان و وتاری بۆ دەنووسن، وەک ئەوەی لەکورددا پیاوێکی تر نەبێ، تەنها دیلێکی ژێردەست و زەلیل نەبێ. عەبدوڵا ئۆجەلانی سەرکردەی پێشووی پەکەکە و سەرکردەی ئێستاو داهاتوویشی، کە لەهەنووکەدا دیل و کۆیلەی دەستی داگیرکارانە، مەبەستی بێ، ئەم مەسەلەی زمانە بەسانایی یەکلایی دەکاتەوە. چونکە گومانی تێدا نییە، ئەم دانەجیرەیەو شۆڤینیزمی ناوچەگەرییەی بادینان لەهەمبەر زمانی کوردییدا بە پاڵپشتیی کوردەکانی کوردستانی تورکیاوە دەکرێ. بە زۆرو بۆرییی ئەوانەوە دەلاوێنرێتەوە. سەیرکەن ئەمە گاڵتەوگەپ نییە، پیاوێک لە زیندانەوە، کۆیلەی دەستی تورکیا و کەمالیستەکانە، ئەگەر سبەینی خەونێکی خۆش ببینێ و بڵێ گەلۆ هەڤاڵینە بۆ پرسی گشتیی و نیشتمانیی پێویستە گرنگیی بەو زمانە ستاندەردەی کوردستانی باشوور و رۆژهەڵات بدەن. بزانە لە ماوەی یەک ساڵدا چیی دەگوزەرێ!

بەپێی پێوەرە ستاندەردە جیهانییەکان، ئەمە کاریزمایی ئۆجەلان ناگەیەنێت. بەڵکو بەدبەختیی کوردە، پیاوێک وەک عەبد لەژێر دەستی دەوڵەتی تورکیادایە، تەواوی گۆڕەپانی سیاسیی و کولتووریی کوردستانی باکوور هەڵدەسوڕێنێ، چەندین هەزار گەریلای خوێنگەرمی کورد لە شاخەکانی قەندیل، بەکۆکەی ئەو

ساتمه دەکەن.... سەدان و هەزاران نووسەر و ئەکادیمست و دۆکتەری زانکۆ و پزیشکییمان هەیە، بەم ریتوالانە کار دەکەن. چ ناسیۆنالیزمی کورد و چ رووناکبیری کورد، نابێ هیچ گرەوێک لەسەر ئەگەری مانەوەو کاریزمایی ئۆجەلان بکەن. پیاوێک رۆژگارێک هەبوو خەباتی کرد، قوربانیی دا بەڵام مرد، بەلاشە زیندووەو بەبیر لەژێر دەستی داگیرکاردایە. دەبێ قسەی ئاپۆ ، بیری ئاپۆی زیندانیی ، ئایدیۆلۆژیا و رێنمایی ئەو پیاوە دیلە تووڕ هەڵدرێ و بزوتنەوەی سیاسیی کورد لەم خاپەرۆیانە پاکبکریتەوە. بەڵام کاتێ کورد ئەم ئیرادەیەی نییە، هەر داگیرکارانی کوردستان ئەهریمەن نین، ئێمە خۆیشمان بەشدارین لەم پرۆسێسی کۆیلەبوون و ژێردەستییەدا. بەشدارین لەم سەرگەردانیی و بێزمانیی و بێ کولتوورییەدا.

زمان، دیدی رۆشن و ئاسۆی گەشی پێشکەوتنی بزوتنەوە کولتوورییەکانە، پلاندانان بۆ ستاندەردایزی زمانی نووسین بەرەو زمانێکی فەرمیی، مەودا و ئەجێندای سیاسیی هەیەو چارەنووسی ئایدێنتیتی نیشتمانیی دیاریی دەکات( Caviedes 2003). زۆر لە توێژینەوەی زماننناسەکانی جیهان، بەتایبەت ئەو توێژینەوانەی، لەدیدی سۆسیۆکولتووریی و سۆسیۆلینگویستییەوە(کۆمەڵناسیی کولتووریی و کۆمەڵناسیی زمانەوانیی) ، باس لە مەترسییەکانی ئایدیۆلۆژیای چێکردنی نەتەوە- دەوڵەت، نەتەوەیەکی زۆرینە بەسەر کەمە نەتەوەکانی تردا دەکەن، دەست دەخەنە سەر ئەو پارادۆکسانەی لە هاواروناڵەی نەتەوەی دەوڵەت دروستکەرەوە دەرهەق بە کەمایەتییە ئێسنیکیی و مەزهەبەبییەکان دەکرێ( Freeland and Patrick,2004) ، ئاماژە بە شین و شەپۆڕی دایەلێکتبازیی و قورپیوانی "شۆڤینیزمی لەهجەیی" ناکەن، وەک ئەو دۆخەی لەکوردستانی عیراقدا لەئارادایە.

هەرێمی کوردستانی عێراق، بەکەرکوکیشەوە، وەک کورد قۆناغی نەتەوە دروستکردن دەبڕێ و لەفۆرمی دەوڵەتێکی سەربەخۆدا ناوکی دەبڕێ. یاخود ئەو قەوارە سیاسییە دیفاکتۆیەی تا ئەو رۆژەی ئازادیی و سەربەخۆیی تەواو بەدەست دەهێنێ و لەفۆرمی فیدراڵیزم و ئۆتۆنۆمییەکی مۆدێرندا دەژیی و مافی چارەنووسی سیاسیی و کولتووریی ، جڤاکی کورد و کەمەنەتەوەکانی تری لەئەستۆیە و دەبێ بیانپارێزێ. ئەو دەوڵەتە کوردییە نوێیە، دەبێ لەبیری ئەوەدا بێت، مافی کەمە نەتەوەکانی وەک عەرەب، تورکمان، کلدوئاشوورییەکان

بپارێزێ، نەک خەمی ئەوەی ببێ، نازی دایەلێکتە جیاوازەکانی کوردستان هەڵبگرێ و بیانلاوێنێتەوە.

ستاندەردایزی زمانی کوردیی، کاتێ گرنگیی دەبێ، ئەگەر لەرێی خوێندن و پەروەردەوە، حکومەت بەفەرمیی لەدڵەوە بکەوێتە خزمەتی ئەو پرۆسێسە. لێرەشدا مافی کەمەنەتەوەکانی هەرێمی کوردستانە کە مافە کولتووریی و رۆشنبیرییەکانیان پارێزراو بێ، بەڵام ئەگەر لەرێی خوێندنیشەوە ئەم مافە بۆ کەمایەتییەکان دابین نەکرێ، زمانی کەمە نەتەوەکان دەمێنێتەوەو هیچ هێزی نییە لەناویان بدات( M_hlh usler, 1996 ). بەڵام حوکمی مێژووە، گەشەی سروشتیی زمانە، دایەلێکتەکان دەکەونە ژێر هێجەمونی زمانی ستاندەردەوە، بەتایبەتیی لەبواری نووسیندا، دایەلێکت دەبێ وەک ئاخاوتن بمێنێ، نەک لە هەمبەر زمانە ستانداردەکەی هەمان گەل ، نەتەوەو ئێسنیکدا، هەوڵی کوودەتا بدات.

راستە زمان، تەنها یەکێکە لە فاکتەرە جیاکەرەوەکانی ئایدێنتیتیی نیشتمانیی بەگشتیی و ئایدێنتیتیی ئێسنیکیی بەتایبەتیی، بەواتایەکی بەرینتر هەموو شتێک نییە( May,2001 ). بەڵام بەو ئاقارەش نا، کە زمان وەک ئایدێنتیتی ، سیمبۆڵێکی نیشتمانیی و نەتەوەیی و کولتووریی نەبێ، بەو واتایە نا کە تاک و جڤاک و دەوڵەت و نەتەوە، پێویستیان پێی نەبێ و گرنگیی بۆ دانەنێن و نەیکەنە بەردی بناغەی سیمبۆڵیزمی نەتەوەیی و نیشتمانیی ( Weinstein 1983 and Blommaert 1999). گەلی کورد لەکوردستانی باشووردا، پێویستییەکی ژیاریی و مێژوویی و کولتووریی بە ستاندەردایزی لینگوا فرانکایەکی سەرتاسەریی ( تەواوی هەرێمی کوردستان) هەیە. ئەوانەی دەیانەوێ بەبیانووی خەمخۆریی و پاراستنی دایەلێکتەکانەوە، رێگریی بۆ بەفەرمیی ناسینی ئەو ستاندەردایزە دروست بکەن، وەک مێژووی رەشی میرنشینە کۆنەکانی داردەستی سەفەویی و عوسمانییەکان ئەرهەق بەدۆزی نەتەوەیی دەچنە مێژووەوە. کەمتەرخەم دەبن لەئاست ئەو کۆنسێپتەی نازراگرتنی ناوچەیەکیان لە سیمبۆڵیزمی نەتەوەیی پێ فەرزتر و بەرزترە. مێژووی رەش بەو واتایەی وەک مێنتاڵی میرنشینە کوردەکانی سەدەکانی رابردوو، هەر کاکەو بۆ خۆی خەریکی کوێخایەتیی بووە لەسەر حیسابی ئەوانی تر و تەواوی نەتەوەی کورد.

ئەم دووبەرەکیی و دوو فاقیی و دوو فلیقانەییە( dichotomy) لەناو عەشیرەت و هۆزو خێڵ و ماڵباتی دایەلێکتە جیاوازەکاندا، لەڕوانگەی Stephen May ەوە، زۆر ورد شییکراوەتەوە، ئەو پێیوایە ئەم میکانیزمە، دوو دەردەسەریی و دوو سەرگەردانیی زۆر ماڵوێرانکەر بەدوای خۆیدا دەهێنێ. ماڵوێرانیی یەکەم لە زەقکردنەوەی دایەلێکتەکاندا دەبینێتەوە کە وەک گونە، نازونووزیان بدرێتێ و گێچەڵ بە زمانی ستاندەرد بکەن، لێرەشەوە رەنگدانەوەی ئەوە دەبینین کە بۆچیی کاریکتەرە لینگویستیکیی و کولتوورییەکان نابنە هۆکاری ناسینەوەی ئەم جۆرە ئێسنیک و گرووپانە( May 2004). ماڵوێرانیی دووەمیش ئەوەیە، سەرکردە سیاسییەکان و رابەرە رۆحییەکان و ئینتێلەجێنسیا پیتزافرۆشەکانی ئەم گرووپ و تاقمانە، چ لە کوردستان و چ لەئەوروپا، ئەم کاڵا قۆرە دەکڕن و سەودای پێوە دەکەن ، لەئاستی مەسەلە نیشتمانییەکاندا بازرگانیی پێوە دەکەن و گیانی عەشیرەتبازیی و تایەفەگەریی و بنەماڵەزادەیی و چاوکاڵیی دەڤەرەکان بەرجەستە دەکەنەوە، لەسەر حیسابی ئەجێندای گشتگیری نەتەوەیی و نیشتمانیی مامەڵەی پێوەدەکەن( ibid ).

لەڕوانگەی باومان و ئەنسرۆپۆلۆجیست و سۆسیۆلۆجیست و لینگویستیکی فرانسییەوەPierre Bourdieu (بۆوردیو) وئەم فەرتەنەیەی ئایدیۆلۆژیستە بادینانیی و هەندێک لە سیاسییەکانی ئەو دەڤەرە ناویانەتەوە، لە روانگەی سوسیۆزماناسەکانەوە بە نیۆعەشیرەتگەرایی ( neo tribalism) و خووسالاریی ( هابیتیوس -habitus) ئەژمارد دەکرێ( Bauman 1999 and Bourdieu 1991 ) . نیۆعەشیرەتگەراییەک، کە دڵنەشکاندن و خاترجەمی چەند عەشیرەت و ناوچەیەک لەسەروو هەموو بەرژوەندییە نیشتمانیی و نەتەوەییەکانەوە دادەنێ. هابیتوسێک، کە خوویەکی بەرەبابییەو چاوی هیچ ئەجێندایەکی دوورمەودای نیشتمانیی نابینێ. زمان بە کلێشە سواوەکە، بەبڕوای بۆوردیو زمان بەس هۆکاری تێگەیشتن و پێوەندیی نییە، بەڵکو میکانیزمی دەسەلاتیشە( ibid). دەسەلاتی کوردیی و هەرێمی دیفاکتۆی کوردستان ئەم میکانیزمەی نەک نییە، بەڵکو ئەو کەرەسە سەرەکییانەی ئەم میکانیزمەش( ئەگەر بوونیشی هەبێ) تەرتەو وەرتە دەکات و زمان بەسەر عەشیرەت و دەڤەرو شارەکاندا دابەش دەکات. هەروەها Bourdieu پێیوایە،

زمان مانیفیستۆی بەدامودەسگاییکردنی دەسەلاتە، کە ئەو مافەی دەداتی ، گوێی لێ بگیردرێ و حیسابی جدیی لە کۆڕو کۆمەڵە نەتەوەییەکاندا بۆ بکرێ( ibid). بەلام دەسەلاتی عەشیرەتیی کوردیی لە کوردستانی باشووردا، ئەوەندەی خەریکی دیوەخان گەرمکردنەوەی سەرۆک عەشیرەتەکانە، ئەوەندە کار لەمەودا نیشتمانییەکاندا ناکات، ئەوەی خەمی ئەم دەسەلاتە گەندەڵ و قرپۆکە نەبێ، خەمی زمانێکی ستاندەردی نووسینە لەهەرێمی کوردستاندا.

لە باری سیاسییەوە، زمان گرنگییەکی زۆر پایەدارو بەنرخی هەیە، لەهەرێمی کوردستانی عێراقدا، زۆر لە هاووڵاتییانی کوردستان هەست بەنامۆبوونێکی زۆر ئاشکرا دەکەن. هەندێک لەهەورامییەکان و بادینانییەکان، نووزەنووزی ئەوەیان تێکەوتووە، پێش ئەوەی وەک ئێسنیک، کورد بن ، ئەوان هەورامیی و بادینانیین. ئەم نامۆبوونە، بۆ ئێسنیکەکانی تر کارەساتئامێزترە. هەرێمی کوردستان، چ بەمشێوەیەو چ ئەوەی سەربەخۆیی تەواو بەدەست بهێنێ، کۆمەڵێ کەمینە نەتەوەی وەک عەرەب و تورکمان و کلدۆئاشوورییمان لەگەڵدا دەژین، ئەمانە بەهەموو شێوەیەک دەبێ مافی کولتووریی و خوێندن بەزمانی خۆیان ئازاد بن و ئەرکی حکومەتی هەرێمیشە داکۆکیی لەم مافە کولتوورییانە بکات. بەلام ئەو کەمینە نەتەوانە لەکوردستاندا، پێویستییان بەوە هەیە زمانێکی سەرتاسەریی هاولاتیبوون بۆ هەموو پێکهاتە سیاسیی و کولتووریی و مەزهەبیی و نەتەوەییەکان هەبێ.

بەهەموو پێودانگە زانستیی و لینگویستییەکان بێ، ئەو زمانە دەبێ زمانی ستاندەردی کوردیی بێ. کاتێ لەنێوان دایەلێکتە کوردییەکاندا، هێشتا ئەم زمانی هاولاتیبوونە بەفەرمیی نەناسێنراوە، ئیتر رەگەزپەرستەکانی عەرەب و تورک، ناهەقیانە گاڵتە بەکورد بکەن و هەڵماقۆ بە دایەلێکتەکانی کوردیی بکەن. کاتێ هەنگاو بۆ دەوڵەتێکی دیمۆکراسیی و ئازاد، بۆ دەسەلاتێکی نیشتمانیی لیبراڵ و پێشکەوتوو دەهاوێژرێ، دەستی هەموو هاووڵاتییانی ئەو هەرێمە دەگیردرێ و بە دۆکترینی زمانی هاووڵاتیبوون و تەواوی گرووپەکانی جڤاک پڕ چەک دەکرێن، ئەوسا دەکرێ بگوترێ، ئەو هەرێم و دەسەلاتە، کارێکتەرەکانی هاووڵاتیبوونی لەڕووی سوسیۆلینگویستیکییەوە دابین کردووە( Faulks 2000). کوردستانێک زمانێکی نیشتمانیی یەکگرتووی نووسینی نەبێ، نەتوانێ خانەقینییەک و زاخۆییەک، هەولێرییەک و هەورامییەک لە ئایدێنتیتیی زمانی

هاوولاتیبووندا بتوێنێتەوە، چۆن دەبین بەنەتەوە، کەی شایانی ئەوەین بەم سەرکردایەتییە عەشیرەتیی و تایەفییەوە هەنگاو بەرەو سەربەخۆیی بنێین.
ئەم دەستگرتنە بە هابیتوسەوە habitus ، دەستگرتنە بە تەوقەکانی رابردووەوە کە لەگەردنی تاک تاکی کورددا بووە لە ناو کۆی پێوەندییە خێڵەکییەکانی عەشیرەت و میرنشینەکاندا. بەلای Bourdieu یەوە ئەم هابیتوسە مێژوو لەخۆگرتنە embodied ، مێژوویەک کە ئێستا سەرلەبەر بە رابردووەوە دەبەستێتەوە (Bourdieu, 1990:56). مێژوویەک کە کرمانجییەکان، بادینانییەکان، هەورامییەکان و لورییەکان دەستبەرداریی نابن و پیرۆزی دەکەن و دەستیپێوەدەگرن و داهاتووی پێ رەنگرێژ دەکەن ، چونکە کوڕی تاقانەو نازداری سەرۆک عەشیرەت و بنەزار و ناوچەکەیانە. دەستگرتن بەم هابیتوسانەوە، گەڕانەوەیەکی تیژە بۆ سەروەریی و شکۆمەندییەکانی عەشیرەت و خێڵ و بەرەباب. گەڕانەوەیەکی مەترسییدارە بۆ دواوە لەبەر خاتری شۆڤینیزمی دایەلیکتپەرستەکان.
لە ساتەوەختی چێکردنی نەتەوەدا، لە دۆکترینی " نەتەوە" دا، لە فەنکشنی ئەرکە سەرەکییەکانی ئەم میکانیزمەدا،هەموو گرووپە ئەبستراکتەکان بەپێی بەرژەوەندییە بالاکان و نیشتمانییەکان، زۆر پێویستە indispensable زمانێکی ستاندەرد بنیات بنێن(Bourdieu 1991) ئەو بایەخە گرنگەی لە هەنووکە و رابردوویەکی نزیکدا، لەلایەن زۆر سکۆلارو ئەکادیمست و نووسەری کوردەوە، بەزمان و ستاندەردایزی زمانی کوردیی دەدرێ، لەخۆڕایی نییە. زمانی کوردیی گەشەیەکی سەرسوڕهێنەری کردووە، لەهەموو بوارە کولتووریی، سیاسیی، کۆمەلایەتیی، زانستیی، ئەکادیمیی و زمانەوانییەکاندا پێشڤەچوونی زۆر گەورەی بەخۆیەوە دیوە. هیگل لە فیلۆسۆفی مێژوودا( فەلسەفەی مێژوو)، بەوردیی باس لە گرنگیی زمان و نەتەوە دەکات. لە روانگەی هیگلەوە، ئەو گەشەکردنەی زمان، نزیکبوونەوەیە لەچەمکی دروستکردنی" نەتەوە- دەوڵەت"، گەشەی زمان پێوەندییەکی راستەوخۆی بە دامودەسگا سیاسیی و ئۆرگانە سیاسییە کاراکانەوە هەیە، کە بناغەیەکی "کۆنکریتیی" لە ماتیریالی "زمان" بۆ "نەتەوە" دادەرێژن(Hegel 1956 ).
چۆمسکی لەسەر بەرپرسیارییەتیی لەهەمبەر زماندا دەڵێ "پرسی زمان لەبنەڕەتدا پرسی دەسەلاتە"( Chomsky, 1979: 191 ). بەلام دەسەلاتی

سیاسیی کورد لەکوردستاندا، کە دەبووایە بەرهەمی ناسیۆنالیزمێکی چاوکراوەو گوێ قولاغ و بەئاگا بووایە لە هاوکێشە سیاسییەکاندا، وەستایەکی کارامە بووایە لە دارشتنی بناغەی نەتەوەی کورددا و بەرپرسیارییەتییەکی هۆشیارانەو ئاگایانە و دووربینانەی بۆ زمانی کوردیی هەبووایە، کەچیی بەپێچەوانەوە، لە جیاتی ئەوەی پرۆژەیەکی نیشتمانیی و نەتەوەیی هەبووایە بۆ زمانی ستاندەردی کوردیی لە هەرێمی کوردستاندا، کەوتووەتە فیتنە نانەوەو بنزاراوەیەکی کوردیی ( بادینانیی) وەک پرۆکسی( بریکار proxy ) لە ناوچەیەکی دیاریکراوی هەرێمی کوردستاندا وەک مۆتەکە بۆ چێکردنی زمانێکی ستاندەردی فانتەسیی( وەهمیی) رەپ و راست کردووەتەوە.

ناسیۆنالیزمی خەوالوو، دواکەوتوو، نەدان، بێئاگاو گەلحۆی کوردیی کەی تێدەگات کە نەتەوە، کۆمیونیتییەکی پرێستیژە( prestige community ) ، کۆمیونیتییەکی سیاسیی بالایەو جێگەی تەپاوتل و خۆگەوزاندنی ناوچەگەریی، عەشیرەتگەریی، دیوەخانی دایەلێکتگەریی و تایەفەرگەریی و رەشبەلەکی دایەلێکتەکان و خاپەرۆی بنزاراوەکانی تێدا نابێتەوە( Webber 1962 ). ئەو کۆمیونیتییەی کە نەک هەر دەبێ دایەلێکتەکان، بەلکو ئێسنیکە جیاوازەکان و مەزهەبە جیاوازەکانیش لە ئایدێنتییەکی نیشتمانیی یەککگرتوودا لەنگەر پێ بگرێ( ibid ). بەلام ئەمە بەو واتایە نا، کە ستەم و جەور لە مافە کولتووریی و مرۆییەکانی هیچ دایەلێکت و ئێسنیکێک و تەنانەت مەزهەبێک بکرێ. بەلکو بەو واتایەی لەبۆتەیەکی نیشتمانییدا بەتایبەت مەسەلەی زمانی نووسین، کە گومانی تێدا نییە زمانی ستاندەرد دەبێ، بەتەواویی یەکلایی بکرێتەوە و لەرەگوریشەوە ساغبکرێتەوە.

لەسەردەمی خۆیدا چۆن بورژوازیی bourgeois ولاتی فرانس، رۆلێکی کارای بینی لە ستاندەردایزی زمانی فرانسییدا، بە دانانی دایەلێکتی پاریس بەبەردی بناغەی زمانێکی نیشتمانیی لەئاستی فرانسەدا، بەهەمان میتۆدی سیاسیی، ناسیۆنالیزمی کوردیی و دەسەلاتی سیاسیی کورد کە هەنووکە لە بنەمالەی بارزانییدا زیاتر خۆی دەبینێتەوە، دەبێ ئەو ئەفسانە پیرۆزەی لە عەشیرەت و ناوچەکەو بنزاراوەکەی خۆیاندا دەیبیننەوە، بخەنە لاوە، وەک ناسیۆنالیزمێکی مۆدێرن و لیبرال و نیشتمانیی و دووربین، لەسەر مەسەلەی

زمانی ستاندەرد کاردانەوەیان هەبێ و چیتر لەوە زیاتر ئەم دەستییە درێژە پێ نەدەن و ئەم پرسە ستراتیژییە دیزە بەدەرخۆنە نەکەن.

"زمان یەکێکە لە خاراوترین malleable و پشتئەستوورترین کاتەگۆرییە کولتوورییەکان" (Smith, 1986:27). نەرم و نیان و خاراوە چونکە تاکە جیاکەرەوەی جیاوازییە ئیسنیکییەکان نییە، بەڵکو ئایدێنتیتی زۆر لەنەتەوەو کەمایەتییەکانە. کاتەگۆرییەکی مڵ و جیڕ و قایمە، چونکە رەهەندە کوولتوورییەکان شرۆڤە دەکات و پێوەرێکی وردی کولتوور و ئەدەب و تێکستی نووسینە. لەسەر ئەم بناغە تیۆرییانەوەیە کە ئەنتۆنی سمیس پێیوایە، زۆر بە جوانیی و وەستایانە ئەو تەوژم و باڵادەستییە تەکنەلۆژیایەی تێکەڵ بە میدیا بووە لەلایەن بێنەدیکت ئەندەرسنەوە بەشێوەیەکی زۆر بڵند و زمانێکی زۆر کەڵەگەت باسکراوەو شرۆڤەی لەسەر کراوە و بەرز دەینرخێنێ. زمانێکی کەڵەگەت کە سمیس لە زمانی ئەندەرسنەوە پێیوایە ستاندەردایزی زمانی دامودەسگاکانی دەوڵەت، بەمەرکەزییکردنی بیرۆکراتییانەی دەوڵەتە، کە خاوەنی زمانێکی پانوپۆڕی چاپکراو بێت( Smith, 1986 ).

## سیمبۆلیزمی زمان

زمانی ستاندەردی کوردیی دەبێ لەو گەرەلاوژەیەی هەندێ شاعیری دەسەلات و کوردییزان دەربهێنرێ، کە بەزۆری زۆردارەکیی خۆیان بەزمانناس و زمانەوانیی کورد دەناسێنن. زۆر لەوانە جگە لە فشەسازیی هیچیتر ناتوانن بەرهەم بهێنن. سەد ساڵی تریش پێناسەی بکەرو فرمان و ئاوەڵناو بکەن، رستە هەڵوەشێننەوە و دایبرێژنەوە، ئەگەر لەو گاڕانە نەیەنە دەرەوەو بەقووڵیی و بەوردیی نەخوێننەوە، ناتوانن لە سیمبۆڵ و ئایدێنتیتیی زمان و داتاکانی بگەن. هەنووکە کۆمەڵی لەوانەی کوردایەتییەکی زۆر سەقەت دەکەن، لەکوردستانی رۆژهەلاتدا، کە زۆر گومان دەکرێ دەسەلاتی کوردیی لەکوردستانی باشووردا بیکات بەقوڕگیاندا، کەوتوونەتە بوغزبەخشینەوەو تانەلێدان لە پێشنیارەکانی ٥٣ نووسەرەکەی داوای ستاندەردایزی زمانی کوردییان لەدەسەلاتی سیاسیی کرد، ماڵوێرانییەکە لەوەدایە، نووسینەکانی

هەمووبان بگوشیت، فروجاویکی لینگویستیکیان لێ ناچۆڕێتەوە. بەراستیی مرۆڤ بەزەیی بە کوردبوون و سەرگەردانیی ئەو کوردانەدا دیتەود کە بەشەرەشەق خۆیان بەزمانزان لەقەلەم دەدەن.

ئاخر دۆکتەری وا بەدەنگ هاتووە، لە کولەکەی تەریشدا ناوی نەبووە، وتاریکی پڕ لەشیرەشیر و تۆمەتباریی لەسایتەکاندا دەنووسێ و وێنەیەکی خۆیشی لەگەڵدا دادەنێ، کە هەر دەڵێی لەرێی گۆڕستان گەڕاوەتەوە، ئەوەندە پیرو پەککەوتەیە، کەچیی لیمان بووەتە خەمخۆر و زمانزانی! کورد. ئەم نووسینە بەقووڵیی برِوای وایە، کاتێ لەکوردستانی باشووردا پرۆژەیەک دراوە بەدەسەڵاتی سیاسیی ، هەندێ کەس لە کوردەکانی کوردستانی رۆژهەڵات، بەتایبەت ئەوانەی دایاسپۆرا، کێچ کەوتووەتە کەولیانەوە، لەدوو هۆکار زیاتر بۆ ئەو خۆتێکدانەیان، شتێکی تر نادۆزرێتەوە.

١-ئەوانەی لەسەر مەسەلەی زمان، کوردایەتیی! دەفرۆشنەوە خۆیان بەزمانزان دەزانن، گرێکوێرەیەکی کەسایەتیی و دەروونییان هەیە، لای خۆیانەوە ، زۆر خۆیان بەشت دەزانن کەچیی حیسابێکیان بۆ نەکراوە، بۆیە دەیانەوێ بە هەر نرخێک بووە، ببنە ژمارەیەک و ببنە ناو هاوکێشەکانەوە و لە کاری کەسانی تر بدەن و بنکۆڵی بکەن.

٢- ئاگرە سوورە لەخۆم دوورە، لەلایەن دەسەڵاتی سیاسییەوە پێڕۆ دەکرێ، کوردی کوردستانی باشوور نایەنە وەڵام، کوردی شوێنەکانی تر ئاگر لەماڵیان بەربووە. دەسەڵات لەکوردستاندا، ماڵ و سامانی هەموو گەلی کوردستانی لەبەردەستدایەو بەپێی بەرژەوەندییە حیزبیی و ئایدیۆلۆژییەکانی خۆی، پارە تەخشان و پەخشان دەکات. کۆڕی بەقاڵ و دۆنەرفرۆشە زمانەوانەکانی کورد! ئەوەندە زۆرن لەئەورووپا، مەگەر هەر دەسەڵاتی کوردیی خۆی بزانێ چەندین میلیۆن دۆلاریان تێدا خەرج دەکات، ئەم هەڵوێستە نابەرپرسانەی هەندێ نووسەری کوردستانی رۆژهەڵاتیش لەم بەقوڕگداکردنە بەدوور نییە، بەتایبەتیی کارێکتەری زۆرێک لەو زمانزانە زۆربڵێیانە بۆ خەڵکیی ئاشکراو روونە .

گەلۆی نووسەر و ئەکادیمست و دۆکتەری کورد، زمانزانی بارگاویی بەکوردایەتیی!، پێیانوایە مەسەلەی ساغکردنەوەی زمانی ستاندەرد، مەسەلەی دۆینەو دوومەڵان خواردنە، دەبێ کابرایەکی چەمی خوڕخوڕە و میاندواو لە هەموو وشەو دەربڕینێک بگات، ئەگەر وشەو داتایەک، بۆ جووتیارێکی

زەحمەتکێشی کورد نامۆ بوو، ئیتر ئەوە زمانی کوردیی! نییە. چونکە ئەوانەی بازرگانیی بە کوردایەتییەوە دەکەن لەکێلگەی زماندا، بڕوایان بەئەفسانەی سەقەتی زمانی پوخت و پەتیی! هەیە. بەلام بەپێچەوانەی جەهلی ئەم کوردییزانانەوە، لەگەورەترین پانتایی زانیندا کە مەیدانی زمانە. زمان وەک خودی خۆی نەک هەر سیستمێکی پراکتیکیی وشەکان و ڕێسا گراماتیکەکانە، بەلکو سیمبۆلی هێز و دەسەلاتە( Duranti 1997). ئەم سیمبۆلیزمی زمانە، بایەخدانە بە ئەنسرۆپۆلۆجیای زمان و لەبەرچاوگرتنی ڕەهەندە فرە مەوداو داتا جیاوازەکانی، کە یەکێکە لە سەرەکییترین بناغەکانی چێکردنی نەتەوە، بەتایبەت نەتەوەی کورد لەکوردستانی عێراقدا، لە قۆناغێکی زۆر مێژوویدا هەنگاو بەرەو جێکەوتکردنی چەمکێکی گشتگیر و تۆکمەی نەتەوەیی دەنێ.

بێنەدیکت ئەندەرسن، وەک سەرکەوتووترین و ناسراوترین سکۆلار و ئایکۆنی بواری لێکۆڵینەوە لە نەتەوەو ناسیۆنالیزم، پێیوایە لەسەرەتای سەدەی حەڤدەوە، مەسەلەی نەتەوە بووەتە کێشەیەکی سیاسیی و گەشەی کردووە. ئەمەش لە زمانێکدا گەشەی زیاتر کرد کە کەوتە بواری نووسین و چاپەمەنییەوە. ئەو لەکتێبی ( imagined communities )، کە یەکێکە لەسەنگینترین و ئەکادیمییترین توێژینەوە قووڵەکان لەسەر ڕەهەندی نەتەوە- ناسیۆنالیزم لەهەموو مێژوودا کرابێ، بە جوانیی و بەوردیی دەست دەخاتە سەر گرنگیی زمانی چاپ ، زمانی نووسین ئەوەی ئەو پێی دەڵێ ( print language )، پێیوایە کە" زمانی نووسراوی چاپەمەنییەکان بناغەی هێنانە بەرچاوی تەوەرەی نیشتمانییە"(Anderson 1991:44 ). زمانی نووسین و چاپەمەنیی قەڵەمبازێکی زۆر گەورە بوو لەبردنە سەری بیری نەتەوەیی و ناسیۆنالیزمدا، لە گەشەپێدانی چەمکی سەربەخۆیی و سەروەرییە نیشتمانییەکاندا. بەمپێیە لەسەروبەندی دروستبوونی نەتەوەکاندا دایەلێکتە خۆماڵیی و ناوچەییەکان ( vernacular dialects ) ئالوودەی نووسین بوون، بەمەش بوونە زمانی دەسەلات(Anderson 1991:45 ).

لە کوردستاندا، ئەو زمانەی ئێستا پێی دەنووسرێ و بووەتە زمانی ڕۆشنبیریی ، زانست، سیاسەت و توێژینەوەی ئەکادیمیی، هەموو ئەدگارەکانی زمانێکی تێروپڕ و دەوڵەمەندی تێدایە، بۆ ئەوەی بەفەرمیی بەبناغەی زمانی ستاندەردی کوردیی بناسرێ. ئەوە ئەدەبی کوردیی و تێکستی کوردییە کە

خەڵک و میدیاو ئینتیلەجێنسیای کوردیی والێدەکات، "داوای بەرزکردنەوەی بکەن بۆ زمان" ( Anderson 1991:80 ). ئەو زمانەی بەرەنجی شانی هەزاران قەڵەم و سەدان شاعیر و نووسەرو زانای کورد، بەم ئاستە بەرزە گەیشتووە. زمانێکە کە ئەگەر کورد ئاستی هۆشیاریی سیاسیی بڵند بووایە، کوردی ئامەد ، کوردی قامیشلۆ و دهۆک دەبووایە شانازییان پێوەبکردایە. دەبووایە بەموڵکی خۆیان بزانیایەو توند دەستیان پێوەبگرتایەو بەدایەلێکتەکەی خۆیان ئەوەندەی تر بەهێزیان بکردایە. بەهێزکردن لەڕووی واتاسازیی و وشەسازییەوە نەک لەڕووی گرامەر و داڕشتنەوە. نالیی و سالم و کوردیی، هەر موڵکی شارەزوور و سابڵاغ و هەولێر نین، موڵکی نیشتمانیی هەموو کوردن، هەروەک چۆن ئەحمەدی خانیی و شێخ سەعیدی پیران ...تاد موڵکی من و تۆو هەموو کوردێکن لە هەرکوێیەک بن. بەرهەمی قەڵەمەکانی ئەوانیش بەرهەمی هەمووانن ، بەرهەمی مێژووی ئەدەبیی و کولتووریی کوردن.

راستییەکی سیاسیی و دیفاکتۆیەکی کۆست کەوتوو لێرەدا هەیە، دەبێ لەبەرچاوی بگرین و مێشکمان لەئاستیدا کڵۆم نەدەین، دەرفەتێکی سیاسیی و کولتووریی و مێژوویی بۆ کرمانجیی ناوەڕاست خوڵقاوە بۆ کرمانجیی ژووروو نەخوڵقاوە. ئەم دەرفەتە ناکرێ بڕەخسێنرێتەوە بۆ هیچ دایەلێکتێکی لۆکاڵیی تر. ژیان تیژ تێدەپەڕێ، گاڤی گەورە لەهەموو بوارێکدا دەوەشێنرێ. ئەوە ناسیۆنالیزمی تەمەڵ و داوەشاوی کوردە لەکوردستانی عێراقدا نەیتوانیوە ئەم دەرفەتە پراکتیزە و تیۆرایز بکات و بە رووکارە سیاسیی و یاسایی فەرمییەکەیدا بیخاتە بواری جێبەجێکردنەوە. ئەوە ناسیۆنالیزمی داڕزیو و کۆنەپەرست و ناوچەپەرست و تایەفەچیی کوردە لەئاستی هەموو کوردستانەکاندا کە لەبەهای سیاسیی و کولتووریی زمانی ستاندەرد نەگەیشتووە و کاری لەسەر نەکردووە. لێرەدا ئەو مافە دەدرێ بەناسیۆنالیستە کوردەکانی پارچەکانی تری کوردستان، کە هەلومەرجی سەربەخۆیی و سەروکاری دەوڵەت و حکومەت بەڕێوەبردنیان نەبینوە. بەڵام ئەی حکومەتە کوردییەکەی کوردستانی باشوور خۆ لارەشەی نەبووە لە ١٨ ساڵی تەمەنیدا لەچوارچێوەی جیۆگرافیا سیاسییەکەی خۆیدا ئەم هەنگاوە بگرێتە بەر.

## جۆرێ-ستاندەردیی زمان bio standard language

ئەگەر سەرنج بدرێتە، سەرەتای هەلومەرجی ستاندەردایزی زمانی نۆرویژیی Norwegian ، لەگەڵ هەلومەرجی زمانی کوردییدا، کەم تا زۆر لێکچوونی زۆر لێکەوە نزیک هەیە. دوو سەدە لەمەوبەر، گفتوگۆیەکی زۆر توند و شەڕئامێز لەنێوان سکۆلار و نووسەرو بیریارە نۆرویژییەکاندا هەبوو، ئەم باسانە داچۆڕیبووە ناو میدیای ئەو سەردەمەوە، لە نێوان تاک تاکی هاونیشتمانییاندا کڵپەی دەکردو پارلەمان و دەسەڵاتی سیاسییش پێوەی خەریک بوون, بەڵام کاتێ ئەم شەڕە دەستپێکرد، نۆرویژ ( نەرویج) زمانێکی سەقامگیری هەبوو، کە سیمای زمانی دانیشیی ( دانیمارکیی) پێوە بوو( Haugen 1966). بەڵام ڕێک وەک کورد، دوو ستایلی جیاواز لە زمانی نووسین، گیانی یەکزمانیی ئەو وڵاتەی سڕ کردووە. لە هەنووکەدا دوو زمانی دووانەی هەیە، بۆکماڵ و نینۆرسکBokm l and Nynorsk کە هیچیان تەواو سەقامگیر نین(ibid ).

سەرەڕای ئەم دابڕانە زۆرە لە نێوان ئەم دوو ستایلە جیاوازەی نووسیندا. بۆکماڵ نزیکایەتیی زۆری هەیە لەگەڵ زمانی دانیمارکییدا، بەڵام نینۆرسک زمانی لادێییەو تەنها شانازیی بەوەوە دەکات، کە زمانی یاخیبوونە. پاش هەوڵێکی زۆر بۆ یەکخستنەوەی ئەم دوو زمانە، هیچ ئاکامێکی ئەوتۆی نەبوو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی بەپێی ئامارەکان، پتر لە٨٦% ی خەڵکی نۆرویژ بە بۆکماڵیی دەنووسن و منداڵانیان بەم زمانە پەروەردە دەکەن، تەنها کەمتر لە ١٤% ی خەڵکی ئەو وڵاتە نینۆرسک بەکار دەهێنن. ئەمە وێڕای ئەوەی Riksm l وەک زمانی نووسین بۆ لێک نزیکبوونەوەی بۆکماڵ و نینۆرسک هاتە ئاراوە، کەچیی هێشتا لاساریی و چەتوونیی نینۆرسک هەر ملنادات بە ئەدەبی باڵاو تێکستی بەهێز و کولتووری گەشەسەندووی زمانی بۆکماڵیی. زمانی ریکسماڵ لایەنی ڕێزمانیی و سپێل و داڕشتنی بۆکماڵیی لەبەرچاو گرتووەو بە دایەلێکتی نینۆرسکیی بەهێزتر و پانوپۆڕتر کراوە. هەمان دەرد کە کورد پێوەی دەتلێتەوە، ناوچەیەکی بەرتەسک( بادینانی کوردستانی عێراق) لەچاو ناوچەکانی کەرکوک و سلێمانیی و هەولێردا ، ئامادە نییە مل بەرەوایی

ئەو هەموو تێکستە بدات، ئامادەنییە ددان بنێ بەزمانی ئەو هەموو کتێبەدا کە بەزمانی کوردیی لەکوردستانی باشووردا نووسراون، چونکە ئەوان سوورن لەسەر ناونانی بە سۆرانیی، کە مەغزایەکی قوولیی ئایدیۆلۆژیی و شۆڤینیستیی لەپشتەوەیە.

جووتساندەردیی لە ئەرمینیادا، (خۆلکردنە چاو) ەوەیە، کە ئەوسەری دیار نەبێ، لە ئەرمینیادا، یەک زمانی ئۆفیشەڵی نیشتمانیی هەیە، زمانی پەروەردەو خوێندن و دامودەسگاکانە ( بەدامودەسگای سیاسییشەوە). بەلاّم لای کەم سێ فۆرمی جیاوازی زمان لەناو خودی زمانی ئەرمینیادا هەیە . بۆ نموونە، زمانی ئەرمەنیی کلاسیکیی ˝ Grabar ˝ کە زمانی سکۆلارەکانی کڵێسایە، زمانی کۆمیونیتییە ئەرمەنییەکان لە ئەمێریکاو ئەورووپا و رۆژهەلاتی ناڤین، هەروەها بەشی رۆژهەلاتی ئەرمینیا( یان هەندێجار پێی دەگوترێ یەریڤانیی) کە زمانەکەیان زمانی فەرمیی دەوڵەت و خوێندن و پەروەردەی کۆماری ئەرمینیا و ئەرمەنییەکانی ئێران و رووسیایە. لێرەدا جووتساندەردیی وەک مەتەڵی لێ دێت. بەتایبەت، هەموو ئەو سکۆلارو نووسەرو توێژەرەوانەی تا هەنووکە لەسەر ستاندەردایزی زمانی ئەرمەنیی نووسیویانە، مەبەستیان لە زمانی نووسینە، نەک ئاخافتن و ژیانی کۆمەلایەتیی رۆژانەی خەڵک. بەلاّم سەرجەمیان بە ئەلفابێتای ئەرمەنیی دەنووسرێن، بەپێچەوانەی ئەو شێرپەنجەیەی ، بەناوی سکریپتی ˝ لاتینیی-تورکیی˝ لە بەشێک لە زمانی کوردیی داوە.

هەنووکە ئەگەر ئیسلامییە میانڕەو وتوندڕۆکانی تورکیا، توانای دەسەلاّت سەپاندنیان بەسەر سوپاو جەنتای junta تورکیادا هەبێ ، ئەگەر بتوانن هێجەمۆنیی خۆیان بەسەر کولتوور و مێژووی تورکیادا بسەپێننەوە، بێگومان توانای ئەوەیشیان دەبێ کە سکریپتی تورکیی-لاتینیی بگەڕێننەوە بۆ رەچەڵەکەکەی خۆی کە ئارامیی-عەرەبیی بووە. بالاّدەستیی کولتووری ئیسلام لە تورکیادا کەس ناتوانێ نکوڵیی لێبکات و بەردەوامیش لە گەشەدایە. لێرەدا ئەگەر سکریپتی دەوڵەتی تورکیی جارێکی تر گەڕایەوە سەر دۆخە سەرەکییەکەی خۆی، سکریپتی کرمانجیی بەستایڵە تورکیی-لاتینییەکە ، کە کۆپیکراوی بیری کەمالیزمە، چیی بەسەردا دێت؟ گومانی تێدا نییە دەرەتانی لێ دەبڕێ و دەبێ دوای ئەو کۆپییکردنەوەیە بکەوێتەوە، چونکە هەر لەسەرەتاوە

سکریپتی لاتینیی –تورکیی کۆپیکراو و چاولێکەریی بووە، لەزیانیش زیاتر بەزمانی کوردیی و ئەجێندای سیاسیی کورد، شتێکی تری بەرهەم نەهێناوە. لەم روانگەیەوە، زۆر سەقەتییە ئەگەر بیر لە جووتساندەردیی زمان ، لەسەر بناغەی دوو سکریپتی جودا بکرێتەوە. ئەمە ئەگەر ئەو خەونە پانکوردیستییە بهاتایە دی کە کوردستانی گەورە! دروست دەبێ، هێشتا دەکرا بڵێی جووتستاندەردیی یان چەند ستاندەردیی وەک قوناغێک پێڕۆ بکرێ.

## زمانی ئەلبانیی- جووتستاندەرد یان یەک ستاندەرد؟

ئەلبانیی، زمانێکی هیندۆ-ئەوروپییە، دوو دایەلێکتی گەورەی هەیە، دایەلێکتەکان بە ( Gheg and Tosk ) ناسراون، سەردەمانێکی زۆر Gheg بناغەی زمانی ستاندەرد بووە، بەلام بەهۆی ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزم و شەپۆلی ستالینیزمەوە، Tosk لەرێگەی دەسەلاتی سیاسیی توتالیتارییانەی ئەلبانیای سەردەمی کۆمۆنیستییەوە کرا بەبناغەی زمانی ستاندەرد. دوای هەرەسی سۆڤێت و ولاتە توتالیتارییەکانی سیستمی ستالینیی، ئەلبانیای ئازاد، یەکەمین هەڵبژاردنی ئازادی بەخۆیەوە بینی لەسەرەتای نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا. ولات بەرادەیەک گۆڕا، هەموو سیما باوەکانی ستالینیزم و دیکتاتوریی گورەوشار نران، زمانی ولات ، زمانی فەرمیی و نیشتمانییش کەوتە بەر ئەم سەرگەرمییانەوە. دەسەلاتی سیاسیی ئەمجارە خۆی تێهەڵنەقورتاند، بەڵکو زانکۆی بریشتینا، لەتیرانا، ساڵی ١٩٩٥ کۆنفراسێکی ئەکادیمیی و زانستیی گرت، بڕیاری کۆنفراسەکەو زۆرینەی زمانەوانییەکان ئەوە بوو، کەزمانی نیشتمانیی ئەلبانیا لە چێکردن و هەڵبەستنی concoction رژێمی توتالیتاریی پێشوو نەبووەو نییە، بەڵکو گەشەسەندنێکی کولتووریی دووردرێژ بووە و تەنها بناغەکەی بە فەنۆلەجی و مۆرفۆلۆجی phonology and morphology زاراوەی Tosk رۆنراوە و زمان و سیمبۆلی نیشتمانیی و یەکێتیی نیشتمانیی ئەلبانیا دەمێنێتەوە( LLOSHI 1996 ). بەشداربووانی کۆنفرانس پێیان وابوو، زمان، دۆزێکی سیاسیی، کولتووریی و نیشتمانییە و دایەلێکت هەرگیز بۆ زمانی ئەدەبیی ،کولتووریی ، سیاسیی و نیشتمانیی گەشە ناکات، بۆیە پێویستە وەک سیمبۆلی نەتەوەیی، زمانی ستاندەرد دەست پێوەبگیردرێ( ibid ).

سەرەڕای ساغبوونەوەی زمانی ئەلبانیی، بەشێوە سیاسیی و کولتووریی و نیشتمانییەکەی، کەچیی چەتوونگەرایی دایەلێکتی Gheg و سەبدایەلێکتەکانی ، دریژەی هەیە. بەهەمان شێوەی ئەو هەموو سەرکێشییەی سەبدایەلێکتی ( بنزاراوە) بادنیانیی لەمەڕ زمانی پرێستیژی کوردییدا. زمانێک بەڕادەیەکی ئەوەندە سەیر و خێرا، لە سەروو سەد ساڵەوە گەشەی کردووە، کە جێگەی خۆیەتی هەرکەسێک خۆی بەکورد بزانێ وەک زمانی نەتەوەیی و نیشتمانیی و کولتووریی خۆی سەیری بکات. ئەوە دووکەرتبوونی کورد ناگەیەنێ، دەسەلاتی سیاسیی لە کوردستانی باشووردا زمانی کوردیی ستاندەردایز بکات بە بڕیارێکی سیاسیی، کاتێ ئەم زمانە لەهەموو ڕوویەکەوە ستاندەردایز بووە، بەڵکو ئەو بڕیارە سیاسییە بۆ ئەوەیە، دەسەلاتی سیاسیی ڕێگە نەدات تایەفەگەریی و ناوچەگەریی بەناوی پاراستنی دایەلێکت و زمانی ( کە زمان نییە و دایەلێکتە) زگماکەوە، کورد لەناو زمانەکەیەوە کەرت و پارچە بکات.

ئەگەر سەیری ئەکادیمیای کوردیی هەزارەی سێیەم لەهەولێر بکەین و بەراوردی بکەین بە رۆڵی ' ئەکادیمیای زمان- language academy ' ی ئیتاڵیا کە لەسەردەمی ڕێنیسانسی ئیتاڵیادا دامەزراوەو بەسەر تەواوی کولتووری ئەوروپادا کارگوزار بووە. ئەگەر خوایشیان یەک بێت، هەسارەکانیان جیاوازە. نووسەران لە شاری فلۆرێنسی ئیتاڵیا، لەساڵی ١٥٨٢ دا قەناعەتیان بە شازادە کۆسیمۆ Cosimo ی یەکەم کرد، کە ئەکادیمیایەک دابمەزرێنێ بۆ جەڕاندن و بژاردن و خاوێنکردنەوەی زمانی ئیتالیی و داڕشتنی فۆرمێکی تۆکمە بۆ زمانێکی ستاندەرد(( Haugen 1966). بەمشێوەیە، زمانی نووسەران و ئەدیبانی فلۆرێنس ، یاخود ئەوەی بە زاراوەی توسکانیی Tuscan ناسراوە، کرا بە زمانی فەرمیی و ستاندەردی هەموو ئیتاڵیا( ibid).

ئەوە رۆڵی نووسەران و قەلەمی بەهێزی بیریارانی فلۆرێنس بوو، کە دەسەلاتی سیاسییان ناچارکرد، ئەکادیمیای زمان دابمەزرێنێ و کۆتایی بە شەڕە دەنووکی دایەلێکتەکانی ئیتاڵیا بهێنێ. ئەوە کۆسیمۆی بیرتیژو دووربین بوو، کە بناغەی زمانی ئیتاڵیی لەرووی سیاسییەوە داڕشت و کردی بەزمانی هەموو ئیتاڵیا. بەڕاست سەرکردایەتی سیاسیی کورد ئەوەندە حیکمەت و کاریزمای تێدایە، واز لە تایەفەگەریی و ناوچەگەریی بهێنێ و زمانی کوردیی ،

زمانی کەرکوک و هەولێرو سلێمانیی لەهەرێمی کوردستانی عێراقدا ساغبکاتەوەو بەیەکجاریی دەستبەرداریی گێچەڵی لەهجەیی پانبادینانیی بێت.

ئەگەر زمانی ستاندەردی کوردیی لەهەرێمی کوردستاندا، لەلایەن دەسەڵاتی سیاسییەوە و لەڕووی سیاسییەوە وەک زمانی فەرمیی دامودەسگا، حکومیی و پەروەردەییەکان ساغنەکرێتەوە، ئەوە پرۆژەی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردیی، دەبێتە خەونێک و هەرگیز نایاتە دی. یەکێک لەو نموونە زیندووانەی لە دنیای مۆدێرنی ئەمڕۆدا هەیە، زمانی یەکگرتووی نەرویژییە کە پاش هەوڵێکی زۆر بۆ نزیککردنەوەی بۆکماڵیی و نینورسکیی لەیەکتر و تواندنەوەیان لە پرۆژەی زمانێکی ستاندەردی نیشتمانیی یەکگرتوودا کە پێیان دەگوت Samnorsk بەتەواویی هەرەسی هێناو لەساڵی ٢٠٠٢ ەوە ئەو هەموو تەقەلایانەیان بەبادا چوو. بەڵام ئەگەر لە کوردستانی عێراقدا زمانی کوردیی بەفەرمیی نەناسێترێ و لای کەم شێوازی نووسین و بناغەی گرامەرەکەی دەستنیشان نەکرێ، ئەوە چارەنووسی زمانی کوردیی لەنێو راکێش راکێشێ دایەلێکتەکاندا، هەرگیز یەکلانابێتەوە و دەستوپەنجەی ئەو زمانە یەکگرتووە پڕ لە ئەندێشەو فانتەسییە هەرگیز گۆ ناکات. ئەم نووسینە بڕوای وایە، ئەگەر نەک هەرجووتستاندەردیی، بەڵکو دایگلۆسیای زمانی کوردییش بەمشێوەیە درێژە بکێشێ، ئەوە ئەم زمانە کوردییە پرێستیژەی پێی دەنووسین، لە زمانی فارسییەوە نزیکتر دەبێ، وەک لەو کرمانجییەی بەسکریپتی لاتینیی- تورکیی دەنووسرێ. بە پێچەوانەشەوە ئەو کاتە کرمانجیی ژووروو لە تورکییەوە نزیکتر دەبێ وەک لەوەی لەزمانی کوردییەوە نزیکایەتیی هەبێ.

گەورەترین کێشەی نێوەندی رۆشنبیریی کوردیی، فوولەخۆکردن و خۆبەزلزانینە. ئەوانەی ئارگیومێنتی ئەوە دەکەن گوایە دەبێ لەڕووی سیاسیی و مرۆییەوە، مافەکانیان پارێزراو بێت و رێگەیان پێ بدرێت بەدایەلێکتی خۆیان بخوێنن، هەرگیز لەوە تێناگەن، یان نایانەوێ لەوە بگەن، بۆ نەتەوەو چەمکی نیشتمانیی، زمان گرنگە و دایەلێکتەکان هیچ پیرۆزییەکان نییە. ئەوان مافی کولتووریی و یاسایی و سیاسیی دایەلێکتەکەیان، لەگەڵ خودی کارێکتەرەرکانی زماندا تێکەڵ دەکەن. لەکوردستانی عێراقدا دەبێ یەک زمانی فەرمیی نووسین هەبێ. ئەگەر ئەو مافە سیاسیی و ئایدیۆلۆژییە بۆ بادینانیی دابین بکرێ، هۆی چییە بۆ هەورامانیی { گۆرانیی کۆن} و لووڕییەکان دابین ناکرێ؟. ئەگەر

بەقوربانییدان بێت، لووڕییەکان و گەرمیانییەکانی خوارووی زۆرترین قوربانییان داوە، ئەگەر بەژمارەو زۆروبۆریی بن، لە ئاخێوەرانی بادینانییەکان زۆرترن، ئەم تەقدیسکردنەی بادینانیی جیاکاریی و هەلاواردنێکی ئاشکرای سیاسیی لەپشتەوەیە. عەقلییەتێکی کۆنی بەگزادەیی و عەشیرەتیی لەپشتەوەیە، کوردستان ویران بێت، زمانی نووسینی با هەرگیز نەبێ، مەسەلەیەک نییە، بەس دایەلێکتی ناوچەی بادینان وەی نەبینێ.

سەرئەنجام، ئەگەر ئەو بادینانیانەی هەنووکە دژایەتی زمانی پرێستیژ و ستاندەردی کوردیی دەکەن، لە نەتەوەو ئێسنیکێکی جودا بوونایەو کورد نەبوونایە، ئەوە باسێکی تر بوو، ئەوسا لەگەڵ فیشماندا دەمانگووت" توندوتیژیی و شەڕەچەقەی ئێسنۆزمانەوانیی هەرگیز کۆتایی پێنایەت"(Fishman,1999, 453). بەلام بەدبەختییەکە لێرەدایە، کاتێ دێتە سەر کوردبوون، پێمان دەڵێن، ئێمە تاقم و تفەنگی زۆرترمان بەستووە، ئێمە ئایکۆنی بەرخۆدان بووینە، ئێمە رمی شۆڕش بووینە، ئێمە خاوەنی شۆڕش و ڕاپەڕین و قوربانیی و بەرگریی و .............تاد بووینە، بەلام خۆشبەختانە ناتوانن بڵێن خاوەنی تێکستی مەزنن لەچاو زمانی پرێستیژی کوردییدا. کاتێکیش دێتە سەر ئەوەی پێیان دەڵێن گەلۆ خوشک و برایینە، ئێمە هەمووومان هەر کوردین، تەنها زاراوەکانمان جیاوازە، ئێ دەفەرموو ئەو زمانەی کورد بەزمانی فەرمیی و ئیداریی و پەروەردە بناسێنە، دەڵێ نەخێر، نەبووەو نابێ، بنزاراوەکەی خۆم، بە قوربانی هیچ شتێک ناکەم. لەم هەلومەرج و دۆخە پڕ لە مێنتاڵ ناساغییەدا، مرۆڤ تووشی واق- وڕمان دەبێ و ڕوو لە هەرچی دۆکترین و خواو ئاسمان و ئایین هەیە دەیکات و دەڵێ ، بەناشوکریی ناڵێم بۆ کورد بووم؟و ئێسنیکێکی تر نەبووم.

دۆکترینی جووتستاندەردیی، بەئەندازەی سەرەڕۆیی و تاکڕۆیی ئەو کۆنسێپتە زیان لە کورد و زمانەکەی دەدات، کە سکریپتی کۆپییکراوی( تورکیی-لاتینیی) ان بەسەر کوردستانی باکووردا تێپەڕاند. زمانی کوردیی ئەگەر هەنگاو بەرەو ئەندێشەو ئەفسانەی جووتساندەردیی بنێ، بەتەواویی لێک دادەبڕێ و دەبێ بە دوو زمانی سەربەخۆ و تا دێتیش زیاتر لێک دوور دەکەونەوە، بەتایبەت کە سکریپتی نووسینەکانیان جودایە، مەودای دوورکەوتنەوەکە فراوانتر دەبێ. بەپێچەوانەوە ساغکردنەوەی زمانی ستاندەردی کوردیی لەکوردستانی

باشووردا، لەناو دایگلۆسیا و هەریزی دایەلێکتەکاندا، چاکترین و سەقامگیرترین هەنگاوی سیاسیی و کولتووریی و زمانەوانییە بۆ ئەوەی نەتەوەی کورد، چ لەکوردستانی باشووردا لە ناو بۆتەی سیمبۆلیزمی زماندا یەکبخات و چ ئەوەی رایەڵێکی بەهێزی پێکەوەبەستنی کوردەکانی تری پارچەکانی تری کوردستان و دایاسپۆراشە لە ناو ئایدینتیتی زمانێکی پرێستیژ و ستاندەردا.

## References:


1. Bauman, Z 1991 *Modernity and Ambivalence*, London: Polity Press
2. Blommaert J ( ed) 1999, *Language ideological Debates*, Berlin, New York: Mouton de Gruyter.

3. Bourdieu. P, 1990, *the logic of practice*, Stanford University Press.
4. Bourdieu. P, *1991, Language and symbolic power*, Cambridge: Polity Press
5. Caviedes. A, 2003, The Role of Language in Nation-Building within the European Union, *Dialectical Anthropology* 27: 249–268, *Kluwer Academic ,Netherlands*
6. Chomsky. N, 1979 *Language and responsibility*, London: Harvester.
7. Coulmas . F, 1991, "European Integration and the Idea of the National Language," *in ALanguage Policy for the European Community: Prospects and Quandaries*, ed. (New York: Mouton de Gruyter)
8. Duranti. A,1997 *Linguistic Anthropology*, Cambridge: Cambridge University Press.
9. Faulks. K, 2000, *Citizenship*, London and New York: Routledge.
10. Freeland. J and Patrick,. D, 2004, *Language Rights and Language Survival*, in , Freeland. J and Patrick,. D (eds), 2004 Language Rights and Language Survival, UK and MA, St Jerome .
11. Gellner. E, 1994 "On Nationalism," in *Nationalism*, eds. Anthony Smith and John Hutchinson (NY: Oxford University Press).
12. Haugen. E, 1966, *Language Conflict and Language Planning, the Case of Modern Norwegian*, Cambridge and Massachusetts: Harvard University Press.
13. Hegel, G.W.F *1956 the philosophy of history*, New York: Dover Publication.
14. LLOSHI. X, (1996): *Albanian: The Rise of a Language to a National Standard.* In: Sprache und politik: Die Balkansprachen in Vergangenheit und Gegenwart. München
15. May. S, 2001, *Language and Minority Rights: Ethnicity, Nationalism and the Politics of Language*, London: Longman.
16. May. S,2004, *Rethinking Linguistics Human Rights, Answering Questions of Identity, Essentialism and Mobility*, in , Freeland. J and Patrick,. D (eds), 2004 Language Rights and Language Survival, UK and MA, St Jerome .
17. Mühlhäusler.P, 2003, Language Endangerment and Language Revival, *Journal of Sociolinguistics* 7(2):232-245.

18. Walters. K, 1996, *Diglossia, linguistic variation, and language change in Arabic*. In. M. Eid (Ed.), *Perspectives on Arabic linguistics VIII*. Amsterdam & Philadelphia: John Benjamins
19. Webber. M. 1962 *Basic concept in sociology*, Owen.
20. Weinstein, B. 1983, *The Civic Tongue: Political Consequences of Language Choices* , New York: Longman.

(ف)

## بەڕوخسەتی مەزنترین زمانناسی کورد، مەسعود محەمەد:

## بۆ پڕۆ- دووستاندەردەکانی زمانی کوردیی لە هەر کوێیەک بن!

**"زمانی هاوبەش نەک دایەلێکتەکان، نوێنەرایەتیی ئایدێنتیتیی نیشتمانیی دەکات"**

**"جڤاکی نیشتمانیی لە زمانێکی نیشتمانییدایە"**

Thorlac Turville-Petre

## پێشەکییەکی پێویست:

( ئەم باسە، سەرلەبەری رای تایبەتیی خۆمەو هیچ پێوەندییەکی بە رای ئەوانەوە نییە کە بەشداریی کەمپەینی ستاندەردایزی زمانی کوردییان کرد. راستییەکەی ئەو دۆستانە، لەسەر ناوەڕۆکی بابەتەکە یەکدەنگ بوون کە پێویستە لە کوردستانی باشووردا زمانی ستاندەردی کوردیی یەکلاییبکرێتەوە، بەدەر لەوە ناکرێ دەیان کەس بیروباوەڕەکانیان سەد لەسەد وەک یەک بن. دەیان بۆچوونی جیاوازیش لەنێویاندا هەبووە ، بۆیە لایەنگرانی دووستاندەردیی و چەند ستاندەردیی بۆیان نییە چینە لەسەر ئەوە بکەن، هەرکەسێ لەوانەی کەمپەینەکەیان واژۆ کردووە، ئیتر بەناوی هەموویانەوە دەئاخفێ. هەرگیز وانییە. چەندین کەس لەناو ئەوانەدا هەن، لەگەڵ نووسەری ئەم بابەتەدا تەواو

جیاواز بیر دەکەنەوە، جیاوازیی لەوردەکارییەکاندا، بەڵام بەدڵنیاییەوە زۆربەی تەواوی خەڵکی کوردستان لەگەڵ ئەوەدان کە کوردستانی عێراق یەک زمانی ستاندەردو فەرمیی و یەکگرتووی هەبێ)

هەموو وڵاتێکی گەشەسەندوو، یاخود ئەو وڵات و نەتەوانەی لە قۆناغی پێشڤەچووندان ، پێویستیان بە کۆمەڵێ مۆدێلی خەملیو هەیە کە هاوشانی پرۆسیسی گەشەکردنەکە بن. زمان وەک کاتەگۆرییەکی زیندوو، دڵ و دەروونی ئەم مۆدێلی گەشەکردنانەیە. زمانی کوردیی کە تووشی ئەم ژانی ستاندەردایزە بووە، بەشێکی زۆری پێوەندیی بە نەبوونی ئیرادەی سیاسیی و پلانێکی زمانیی ستراتیژییەوە هەیە، چونکە ئەگەر لە سەردەمی زوودا زمان بەسروشتیی دەفراژا و خۆی ساغدەکردەوە و ستاندەردبوونی خۆی تۆکمە دەکرد و بە دیفاکتۆ دەبوو، بەڵام لە ئەڤرۆی زمانی کوردییدا، پێویستی بەبڕیارێکی ئەکادیمیی، سیاسیی و ستراتیژیی هەیە، پێویستی بە نەخشەدانان و پلانی زمانەوانییە، لەبەر هیچ نا، لەبەر ئەوەی زمانی کوردیی هەموو قۆناغە سروشتییەکانی گەشەی لینگویستیکیی بەزاندووە.

بۆ ئەوەی زمانی کوردیی، کارێکتەرەکانی مرۆڤی کورد، نەتەوەی کورد و وڵاتێکی بێ ئایدێنتیتی وەک کوردستان زیندوو بکاتەوەو یەکانگیرییەک دروست بکات، قۆناغی ئەنسرۆپۆمۆفیزم anthropomorphism ی گەرەکە، قۆناغێک کە کارێکتەر و مۆراڵ و سیمبۆلیزمی نیشتمانیی نەتەوەی کورد تێیدا رەنگ بداتەوە. ئەنسرۆپۆمۆفیزەکردنی زمانی کوردیی نوێنەرایەتی مرۆڤی کورد، سیمبۆلی کورد و کارێکتەری مرۆڤێک دەکات، کە خاوەنی زمانێکی بێکەس و کارە، کە زمانی ' کوردیی' پێ دەگوترێ. لەم ئاقارەوە لێکۆڵینەوە و راڤەکردن لەسەر ستاندەردکردنی زمانی کوردیی دەرگیری تایپۆلۆجی( جۆرلۆجی) خودی لق و پۆپەکانی زمانی کوردیی دەبێت. زمانێک تا هەنووکە لەنێوان شارەکان و شێخەکان و خێڵەکاندا بەسەر چەندین زاراوە و بنزاراوەی جیاجیادا دابەشبووە. بۆیە ئەنسرۆپۆمۆفیزەکردنی زمانی کوردیی، واتای زیندووکردنەوەی زمانی کوردیی لە کارێکتەری تاکی کورد و ئایدێنتیتیی نیشتمانییدا دەگەیەنێت.

لەم ئاقارەوە، پاراستنی دایەلێکتە کوردییەکان چ خێروبێرێکی بۆ کورد هەیە، لەکاتێکدا کورد بە خاوەنی زمانێکی فەرمیی و یەکگرتوو نەبێ، لای کەم لەهەرێمی کوردستانی عێراقدا، کە دیفاکتۆیەکی سیاسیی و جیۆگرافیی و

مێژوویی هەیە. پاراستنی دایەلێکتە کوردییەکان و خۆڕنینەوە بۆیان لەژێر چەتری مافی مرۆڤ و دیمۆکراسیی و ئازادییدا، تەڵەکەبازییەکی ئەوەندە گەورەیە، بەس لە کاریکتەر و داوەشاویی و دووڕوویی مرۆڤی رۆژهەڵاتیی و دوالیزمی ئێمەی کورد دەوەشێتەوە. ئاخر هەرگیز نەبووە دۆکترینی کۆمۆنیزم کە ئەوەی بڕوای پێی نەبێ دیمۆکراسیی و پلورالیزم و دەنگە جیاوازەکانە، کەچیی لایەنگرانی دوو ستاندەردیی دوای هەڵای کۆمۆنیستیکی سکۆلار کەوتوونە و وەک دەقی قورئان وتەکانی دەڵێن و دەینووسنەوە.

هەندێ لە کۆمەڵە دێرینەکان( کۆمەڵەی هەردوو دیو)، کۆنەچریکی ئێرانیی و ئاشە دێرینەکان و چەپی دێرین وەک ئەوەی "بەیعەت" بە جووتساندەردیی بدەن، بەهەر شێوەیەک بۆیان کرابێ، دژایەتی ساغکردنەوەی زمانی فەرمیی و ستاندەردی کوردیی دەکەن، چونکە بەهەمان مێنتاڵیتی ئایدیۆلۆژیی و سیاسییەوە لە زانستی زمان دەڕوانن، کە سکۆلاریکی کۆمۆنیستی کورد بانگەوازی بۆ دەکات. لەوەش بگەڕێین کە لۆبییەک لە نێو دەسەڵاتی کوردییدا چۆن کۆمەک بەو هەوڵانە دەکات. ئەم هاوپەیمانییەی دوو ستاندەردەکان، زۆربەیان ئەو پانکوردیست، ناسیۆنالیست، کۆنە تودەو چریک و کۆمۆنیست و چەپانەن کە ناتوانن یەک وتاری ورد و پڕ لەداتا، لەسەر خودی دۆکترینی دوو-ستاندەردیی بنووسن، چونکە زۆربەیان جگە لەخوێندنەوەی بەیاننامەی لوولکراو ژاکاو و دڕاو، ئەویش بەزمانی کوردیی یان زۆر زۆر بەفارسیی، هیچ سەرچاوەیەکی تریان نەخوێندووەتەوە. ئەم نوکتەی نەخوێندنەوەیە هەر هەندێ لە چەپە کۆن و نوێکانی نەگرتووەتەوە، بەڵکوو هەندێ لەپانکوردیستە لیبڕاڵ و ناسیۆنالیستە مۆدێرنەکانیشی گرتووەتەوە.

ئێمە لە زمانی شارەزایانی زمانەوە ئەوە دەزانین، کاتێ زمانێکی لاکەوتە و کەنەفت، دایەلێکتیکی خۆماڵیی، بنزاراوەی هەرێمێک دەخوازێ گوژم بەخۆی بدات و رەپ و راست بێتەوەو ببێ بەزمانی ستاندەرد، نۆرمێکی سەقامگیر و یەکگرتووی لە نووسیندا گەرەکە، پێویستیی بەوە هەیە لای کەم زۆرینەی ئەو هەرێمە گفتوگۆی رۆژانە و کارە فەرمییەکانی پێڕایی بکەن (Haugen ١٩٨١) ، یاخود وەک ئەوەی گارڤین Garvin ناوبێژی دەکات، ئەو زمانەی لەڕێی مێشک و هزرەوە بخەملێنرێ نەک لە ڕێی سۆز و هەڵچوونی دەڤەریی و تیرەگەرییەوە، کە ئەو پێی دەڵێ ئینتێلێکچووەلایزبوون intellectualized ، بە

واتایەکی تر زمانی هزرڤان و رووناکبیران بێ( Garvin ،١٩٦٨ ) ، نەک زمانی زۆروبۆریی کورتەک و شەرواڵ لەبەرەکانی کورد، نەک حەشاماتی دیوەخانەکانی عەشیرەت و تیرەو هۆزو خێڵەکانی کورد لەبەرچاو بگیردرێن.

ئەمڕۆ کرمانجیی ناوەڕاست( بە ئاوێزانبوونی لەگەڵ کرمانجیی خوارووودا) لەکوردستانی باشووردا، زمانێکە ئینتێلێکچووەلایز بووە، زمانی فەرمییە ( بەبێ بڕیارێکی فەرمیی) ، زمانی ستاندەرد و بالاو کەڵەگەتی ئەم هەرێمەیە. زمانی زانستیی و فەلسەفیی و کولتوورییە، زمانی حکومەت و پارلەمان و سەرۆکایەتی هەرێم و مەکتەبی سیاسیی هەموو حیزبەکانی کوردستانە. زمانی باشترین و چاکترین و پڕبەرهەمترین نووسەرانی کوردە، زمانی پایتەختی سیاسیی و ئابووریی هەرێمی کوردستانە. ئەم ستاندەردایزەی جێگەی مشتومڕە، بە روانگەی ئەم بابەتە، ستاندەردایزی ئۆرسۆگرافی (orthography) ی نییە. ستاندەردایزی زمان لە دیدی ئۆرسۆگرافییەوە، زیاتر جەخت لە داڕشتنی رستە ، رۆنانی رستەکان و سپێڵی پەیڤ و میتۆدی دەربڕینەکان دەکاتەوە، ئەمەش پتر کاری شاعیرانە، یان کاری ئەو واعیزە خۆبەزمانزانانەیە بەس بازرگانیی ئۆرسۆگرافیی دەزانن. ئۆرسۆگرافیی راستە کاتەگۆرییەکی زمانناسییە، بەلام ئەم نووسینە جەخت لە رووکارە تیۆریی، زمانناسیی ، کولتووریی، فەلسەفیی، سیاسیی و فەرمییەکەی ستاندەرد، کە سەرمەشقی ستاندەردایزن، دەکاتەوە، نەک خەریکی ئۆرسۆگرافیی و رستە رێکخستن و فڕوفیشاڵی وشە پاشوپێشخستن یان بکەرو فرمان لکاندن بێت.

بەبڕوای ئەم بابەتە، زمانی کوردیی، لەو شوێنەدا زۆر گرنگیی هەیە کە جەخت لە رووکارە زمانەوانیی و سیاسیی و کولتووریی و تیۆرییەکەی ستاندەردایز بکرێتەوە، نەک لە فۆرمە مێژووییەکەی یاخود ئەوەی فیلۆلەجیستەکان (philologist ) بە دیدی زانستی فیلۆلەجی ( تێرمێکی کۆنە بۆ لینگویستەکان بەکار دەهێنرا) لە داتاکانی زمان ، بەهای زمان و قورسایی سیاسیی و کولتووری زمان دەیانڕوانی. زمانی کوردیی دەبێ بەدیدی لینگویستیکیی لە ستراکتور و سروشتی زمان لێی وردبینەوە. راستە لقوپۆپەکانی زمانناسیی ( فۆنەتیک، فەنۆلەجی، مۆرفۆلەجی، سیمانتیک، سینتاکس، ئەنسرۆگرافیی،......تاد) هەموویان پێکەوە تەواوکەری یەک سیستمن کە زمانناسیی پێ دەگوترێ. لێ هەلومەرجی سۆسیۆلینگویستیی و

ئەنسرۆپۆلۆجیای زمان و پراگماتیای زمان، بەها گرنگەکانی زمانی کوردیین. وەک کورد پێویستمان بە دیسکۆرس و پلانی زمانیی هەیە، پێویستمان بەوە هەیە، ستراکتۆری ئەو زمانە ستاندەردەی هەیە مکۆمتر بکەینەوە، لەڕووی سیاسیی و ئیداریی و یاساییەوە یەکلای بکەینەوە.

لەم دیدەوەیەوە، فەوتاندنی دایەلێکتە کوردییەکان یان کاڵبوونەوەیان زیان لەکورد نادەن، بەڵکوو نەبوونی زمانی ستاندەرد زیانی سەرەکیی بەکورد دەگەیەنێت. بەگوێرەی ریپۆرتی یەکەمین کۆنفرێنسی ( کۆنفرانسی) نێونەتەوەیی تۆڕی- وشە( Wordnet ) بێت کە لەساڵی ٢٠٠٢ دا لە سێنترال ئینستیتیوتی زمانە هیندییەکان بەسترا، زۆربەی زمانەکانی جیهان بەرەو داخواران و فەوتاندنی یەکجارەکیی دەڕۆن، ئەم ڕێژەیەیان بە نزیکەی ٩٠% ی زمانە جیهانییەکان قەبڵاندووە. ئەم ریپۆرتە، قسەی زلی کوردایەتیی و نەدانیی ئەو چەپە کلاسیکیی و چریکییانە نییە، کە فریان بە زانستی زمانەوە نییە و لەخۆیانەوە کەفوکوڵی ئایدیۆلۆژیی هەڵدەڕێژن، قسەی ئەو کۆمۆنیستانە نییە، کەئەوەی بڕوایان پێی نەبێ دیمۆکراسیی و مافی مرۆڤە. بەڵکوو بە دەیان توێژینەوەی مەیدانیی و تیۆریی، لە ماوەی دەیان ساڵدا گەیشتوونەتە ئەو دەرەنجامانە. فەوتاندنی ئەم زمانانە لەگەڵ خۆیدا، لێکسیکاڵ، تێکست، بناغە زانینییەکان و ترادیسیۆنەکانیشیان رادەماڵێ.

گەلۆ بۆچیی دەبێ لە سەردەمی گلۆبالیزەیشن و پۆست مۆدێرنیزمدا، تازە بەتازە ، ئێمەی کورد بێین باسی پاراستن و دەستپێوەگرتنی preserved زاراوەو بنزاراوە کوردییەکان بکەین؟ ئەوە چ خێریکە بەکورد و نەتەوەی کورد دەکرێ لەژێر پەرچەم و ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم و کۆمۆنیزمدا، سکۆلاریکی وەک د.حەسەنپوور باسی مافی مرۆڤ و دیمۆکراسیی و خوێندن بە بنزاراوەکان دەکات؟ لەکاتێکدا مافە نەتەوایەتییەکانی گەلی کورد، تاکە شتێکە کە خەمی ئەو نەبووە . ئایا چاوی کاڵی زاراوەو بنزاراوە کوردییەکان لەو ٩٠% یەی زمانەکانی جیهان جوانترو عەگێدترە؟

لە هەلومەرجی کوردستانی باشووردا، دۆکترینی دووستاندەردیی بۆ زمانی کوردیی نەزانییەکی ئەوەندە لینگویستیکانەیە، کە ئاسۆی زمانی کوردیی بەیەکجاریی ژێر پرسیار دەخات. ئەوەی بەزمانی ئاڵمانیی پێی دەگوترێ SPRACHBÜNDسپراخبونت یاخود سپراخبوند و بەئینگلیزیی پێی

دەگوترێ یەکیەتیی زمان ( یەکێتیی زمان- language union)، هاوکات بە ناوچەی زمانەوانیی ( linguistic area ) ش ناسراوە، جەخت لە سێ زمانی رەگەز جیاواز یان زیاتر دەکاتەوە لەڕووی جینێتیکەوە genetic لێک جودابن. لەکوردستانی باشووردا، زمانی کوردیی بەسەر سێ دایەلێکتی سەرەکییدا دابەش دەبێ. ئەوەی پرۆدووستاندەردەکان ، چ بە مەغزای ئایدیۆلۆژیی ، یان بە فاکتەری " شۆڤینیزمی لەهجەیی" یاخود لەجەهل و بەدوای هەلاکەوتندا " سۆرانیی" پێ دەڵێن ، لەگەڵ هەورامانیی و سەبدایەلێکتی بادینانییدا، هەموویان منداڵەوردەکەی زمانێکن کە زمانی کوردییە. هیچیان رەچەڵەکیان جیاواز نییە و سەر بەزمانێکی بیانیی نیین.

لۆژیکی دووستاندەردیی بۆ خۆی سیمبۆلی کەلەگایی و زۆرو بۆریی دایەلێکتێکە کە قورساییەکی سیاسیی و ئابووریی لەپشتەوەیە کە دەسەلاتی کوردیی لۆبییەکی بە نهێنیی وەک دابەستە راگرتووە و دژایەتی یەک ستاندەردییان پێ دەکات. هاوکات لۆژیکێکی عەشایەریی و خێڵەکییە کە پڕ بەپێستی مێنتاڵیتیی میرنشینە کۆنە کوردییەکانە و تێکەو لێکەی کۆنە مارکسیستەکان و پانکوردیستە دواکەوتووەکان نۆژەنی دەکەنەوە. ناکرێ زمانی نەتەوەیەک لەسەر زۆروبۆریی ژمارەی کرمانجەکان" تێرمێکی ناوچەکانی هەولێرە" ساغبکرێتەوە. بەڵکوو لەسەر ئەو زمانە ساغدەکرێتەوە کە بەسروشتیی و بە لێوەشاوەیی خۆی بەم ئاستە گەیشتووە. بیرکردنەوە لە "ناوچەی زمانەوانیی" لەکوردستاندا، کوردستانی باشوور دەکاتە سێ هەرێمی تەواو لێکدابڕاو، ئێمە نە لەسنووری چاینەداین، تا زمانی ڤێتنامیی و تایلەندیی بەهاوشانی چاینیی، ناوچەی زمانەوانیی پێک بهێنن. نە لەباڵکانی ئەورووپاشداین تا سپراخبونتی باڵکانییمان ( ئەلبانیی، رۆمانیی، سلاڤیی، بولگاریی.....) هەبێ. سپراخبونتی کۆمەڵی زمانی جیاوازن لێ لەڕووی زمانەوانییەوە بۆ سەریەک رەگەز و رەچەڵەک دەگەڕێنەوە. بەلام تەواوی لق و پۆپەکانی دایەلێکت و سەبدایەلێکتە کوردییەکان بۆ سەر یەک زمان کە زمانی کوردییە، دەگەڕێنەوە.

کرمانجیی ژووروو و هەورامانیی و کرمانجیی ( ناوەڕاست و خواروو)، سێ زاراوەی کوردیین، هەر یەکەیان کۆمەڵێ بنزاراوەیان هەڵلووشیوە. دیارە هێجەمۆنیی کرمانجیی ناوەڕاست لەڕووی زمانناسییەوە لەهەموویان دەستڕۆیشتووتر و سەقامگیرتر و خاوەن ئەزموونترە. ئەگەر لەکوردستانی

عێراقدا دووستاندەردیی جێکەوت بکرێ، بەسروشتیی ستەمێکی گەورە لە هەورامیی ( هەورامانیی) دەکرێ، بۆچیی دەبێ بادینانیی بخرێتە سەروو هەورامییەوە. خۆناشکرێ سپراخبونتیی کوردیی لەکوردستاندا هەبێ، چونکە خۆبەخۆ پێچەوانەی ئەو چەمکەیە کە لە جێنەتیکەوە لێک جودابن. زاراوە کوردییەکان هەموویان یەک پشتیان هەیە  کە زمانی کوردیی پێ دەگوترێ.

لە رەوشێکدا کە زمانی کوردیی لە قۆناغێکی بلندی دایگلۆسیاییدایە، دەبێت بەئیرادەیەکی سیاسیی و نیشتمانیی گەورەوە بیر لە یەک ستاندەردی سەرتاسەریی بکرێتەوە. دایەلێکەتەکانی تر دەبێ بەرێژەیەکی گونجاو لە پرۆگرامەکانی خوێندندا هەبن، ئەویش لەپێناو خزمەتکردنی زمانی کوردییدا، نەک بۆ سەرئێشەو ئاژاوە نانەوە. سەرتاسەری هەرێمی کوردستان، پێویستە یەک زمانی فەرمیی و ئیداریی هەبێ. مخابن لەهیچ شوێنێکی دنیادا، نەبووە دایەلێکتێکی خۆماڵیی لە هەمبەر زمانی ستاندەردی نیشتمانییدا، لەبەرامبەر زمانی پایتەخت و حکومەتدا لاساریی بکات. کەچیی لە بادینان، تابلۆی سەرەکیی زانکۆی دهۆک بە بنزاراوەکەی خۆیان نووسراوە. ئەم بەرەلاییە لەو وڵاتانەشدا نییە کە بەحیساب جووتستاندەردن. مەگەر ئەوە  نییە نینۆرشکەی ( نینۆرسک) وڵاتی نۆرویژ خەریکە دەچێتەوە کەوڵی خۆی، لەبەرامبەریشدا بۆکماڵیی رۆژ بەرۆژ لەگەشەکردندایە.

دۆکترینی دووستاندەردیی یان چەند ستاندەردیی بۆ زمانی کوردیی، هەمان مێنتاڵیتیی سەرۆک هۆزەکانی کورد، سەرۆک حیزبەکانی کورد، سەرۆک دەڤەرەکانی کوردستانە بەلام بە بیچمێکی ئەکادیمیی و لینگویستیکییەوە لەبازاڕی گەندەڵیی کوردستاندا ساغدەکرێتەوە. هەمان مێنتاڵیتیی یەکێتیی و پارتییە لە سیستمی فیفتیی بەفیتییدا کە دەسەلاتیان قۆرغکرد و لەنێوان خۆیاندا دابەشیانکردەوە. راییکردنی دڵی هەموو ئەو سیاسیی و ئەکادیمیی و رۆشنبیرانەیە، بەبست لە دەواری خێڵ و عەشیرەتگەرایی دوور نەکەوتوونەتەوە. دووستاندەردی بەسروشتیی لە ناو هزری کوردی خێڵەکییدا تەواو دیفاکتۆیە، بەبیانووی پاراستنی زاراوەکانەوە! ( کەنامۆیە بەهەموو پێوەرە لینگویستییەکان) دەیانەوێ لەئاستی سیاسیی و کولتووریی و نەتەوەییشدا بەدیفاکتۆی بکەن. بەبڕوای ئەم نووسینە ئەمە بەشێوەی پراکتیک، سەرەتای کەرتکردنی نەتەوەی کوردە.

بەم تێڕوانینانەوە، زمان و دایەلێکت، سەرئەنجام لەشەڕێکدان و شەڕەکەش هەر دەبێ بکرێ. شەڕەکە لەبەرژەوەندیی نەتەوەیی و نیشتمانیی یەکلایی دەکرێتەوە. سیاسەتوانێکی کاریزمای دەوێ ئەم چەڵەحانییەی زاراوە لاواندنەوەیە کۆتایی پێ بهێنێ. بڕیارێکی سیاسیی خورت و بوێری نیشتمانییانەی گەرەکە. لە ئاستی جیهانیشدا، ئەو ئەڤینداریە لەگەڵ زاراوەکاندا بەسەرچووە. لەمانیفێستۆی نەتەوە یەکگرتووەکاندا UN و لەپێشەکیی preamble و ناوەڕۆکی چارتەرەکاندا، باسی پاراستنی مافی نەتەوەو کەمایەتییەکان و مرۆڤە جیاوازەکان و زمانەکان کراوە، باسی رەگەزی نێرو مێ و جیاوازیی رەنگ-پێستیی...تاد کراوە بەڵام هیچیان توخنی دایەلێکت و سەبدایەلێکتەکان ناکەون. ئەوانەی دەخوازن کورد چەند زمانێکی نووسینی هەبێ ( بەشێوازی رەشبەڵەکی دایەلێکتەکان) و وەک نەتەوەی کوردیش بمێنێتەوە، لە دنیایەکی زۆر فانتەسیی و ئایدیۆلۆژییدا باسکی ئەفسووناویی رادەدەن. باسکێک لە دوورو نزیکەوە بەر یەک گەردێ زمان و زانستی زمانەوانیی ناکەوێ.

یەکێک لە نەخۆشییە دەردەدارەکانی زمانی کوردیی ئەوەیە، کەمترین توێژینەوەی لەسەر کراوە، راستییەکەی کورد لەسەر هیچ شتێک توێژینەوەی تەواوی نییە. لەمەڕ کەرکوک بەملیۆن وتاری سیاسیی پڕ لە دروشمی کوردایەتیی و شۆڕشگێڕیی نووسراوە، لەبەرامبەریشدا بەهەمووی چوار توێژینەوەی ئەکادیمیی ورد نییە. زمانی کوردییش خەریکە وەک هەر بابەتێکی تر بەوتاری سیاسیی و لافیتە نووسین و نارەزایەتیی ئاغاوات و عەشیرەتەکانی کورد بسپێردرێ. خەریکە کۆمەڵی واعیزنووسی خۆبەزمانزان و کۆمەڵی پینەدۆزی بەناو زمانزان خۆیان بەکاپتنی زمانی ستاندەردی کوردیی دەناسێنن. لەکاتێکدا ژمارەی ئەو توێژینەوانەی لەماوەی دوورو نزیکدا لەسەر زمان کراون، ئەوەندە کەمن هەموویان بەیەک رۆژ دەخوێنرێنەوە. بەبڕوای ئەم نووسینە، باشترین چەکێکی هێمنانەو ئاشتییانە کە بۆ ستاندەردایزی زمانی کوردیی بەکاربهێنرێ، ئەوەیە لەسەر زمانی کوردیی وتار و توێژینەوەی ئەکادیمیی و داتابەخش بنووسرێن. تەنها نووسین و توێژینەوەیە، ئارگیومێنتەکان بای باڵیان تێیدا دەدەن و کەسانی پسپۆر و رووناکبیرانی کورد و زمانناسەکان، بە ئەنجامگیریی دەگەن.

ئەوانەی لەڕووی سیاسیی و ئایدیۆلۆژییەوە، لەڕووی مێنتاڵیتیی هۆز و ناوچەگەرییەوە باسی مافی زاراوەکان و بنزاراوەکان و چەوساندنەوەیان دەکەن، بە کڵاولەسەرنانی لینگویستیکیی و فرۆفیشاڵی زمانەوانیی بەخەڵکی کوردستانی دەفرۆشنەوە، بەیەک رستە، قەڵای ورێنە و مۆتیڤەکانیان هەرەس دێنێ. ٘ لە کۆنفراسە جیهانییەکانی زمانناسییدا، باسی کرۆزانەوەی دایەلێکتەکان بەهیچ شێوەیەک ناکرێ ٘. بەڵکوو باسی زمان و مافی پاراستنی زمانی کەمینەکان و جڤاکەکان دەکرێ. لەڕاگەیاندراوی جیهانیی مافە زمانەوانییەکاندا (Universal Declaration of Linguistic Rights) ، کە کۆنفرێنسێکی نێونەتەوەیی بوو، لەسەر زمان و مافەکانی، لەشاری بارسلۆنە ( بەرشلۆنە) لەساڵی ١٩٩٦ دا بەسترا ، بەسەدان جار باسی زمان و مافەکانی بەهەموو جۆرێک کراوە، بەڵام بەهیچ شێوەیەک باسی دایەلێکتەکان و سەبدایەلێکتەکان نەکراوە. بەم دیدە لینگویستیکییەوە، ئەم نووسینە بەرۆحێکی دیکتاتۆریانەی لینگویستیکییەوە داوای ئەوە دەکات، لە کوردستانی باشووردا دەبێ زمانی ستاندەردی کوردیی ساغبکرێتەوە. هاوکات داوای لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندییەکانی تەواوی زاراوەکان بۆ خزمەتی زمانی کوردیی و دەوڵەمەندکردنی لەئاییندەدا دەکات. پێویستە یەک زمانی نووسین هەبێ. زمانی دەوڵەت و دامودەسگا حکومیی و ئیدارییەکان بێت. زمانی پەروەردەو دادگا و یاساکان بێت.

## کێشە ئاوازەکان و زمانناسە خۆتێهەڵقورتێنەکان

لە زۆرینەی ئەو وڵات و نەتەوانەی کە زمانی نووسینی تێدا ساغکراوەتەوە، دایەلێکتێ، یان زمانێ لەسەر حیسابی ئەوانی تر بە بڕیارێکی سیاسیی، ئەکادیمیی، یان بڕیارێکی جەماوەریی و کۆمەڵایەتیی بە زمانی ستاندەرد کراوە. ئێستاش لە هەرێمی کوردستاندا هەمان خەرەک لەئارادایە، هەندێک هەن، پێیان سەختە ددان بەو راستییە لینگیوستیکییەدا بنێن کە زمانی ستاندەرد، لەڕێگەی ساغکردنەوەی زمانێکەوە دەبێ بەسەر زمانەکانی تردا، یاخود لەڕێگەی ساغکردنەوەی دایەلێکتێک دەبێ بەسەر ئەوانی تردا. ئەمە بۆخۆی دوالیزمێکە کورد بەدەستییەوە گیری خواردووە. فاکتەکان و دیفاکتۆکان وەک

رۆژی رووناک دەبینێ، کەچیی لەسەر گۆڕەپانی پراکتیک و نووسیندا، ناوێرێ دان بەڕاستییەکاندا بنێ و خەریکی منگەمنگ و پاساو هێنانەوەی نالۆژیکییە. لەگەڵ ناخی خۆی و نووسینەکانی خۆیشیدا ڕاست ناکات.

ئەوانەی دەخوازن زمانی کوردیی بەدەردی زمانی نۆرویژیی بەرن، ئاخۆ ئاگایان لەوە هەیە کە زمانی نینۆرسک Nynorsk ( زمانەو دایەلێکت نییە ). لەکاتێکدا بەپێی یاسای وڵاتی نۆرویژ، زمانێکی فەرمیی و نیشتمانیشە، کەچیی لەگەڵ ئەوەشدا لەهیچ شارێکی نۆریوژدا زمانی فەرمیی دامودەسگاکان نییە. زمان و ستاندەردایزی زمان کە یەکێکە لە ئەرکە سەرەکییەکانی ناسیۆنالیزمی کوردیی، بەدڵنیاییشەوە زۆر ناسیۆنالیزمێکی گەلحۆ و گەلۆرە، هیچی لەمەڕ زماندا پێناکرێ. ناسیۆنالیزمی کوردیی، لەسیاسەتیشدا گورجوگۆڵ نییە و نابەڵەدە، مەگەر بەپشتداخستنی گەڕانەوەی کەرکوک بۆ سەر هەرێمی کوردستان، لە ماوەی پێنج ساڵی رابردوودا، جگە لە یەکێتیی و پارتیی کە سەرە رمی ناسیۆنالیزمی کۆنەپارێزی کوردیین، کەسیتر و لایەنیتر ئەوەندە لێی بەرپرسیارن.

هەردوو دۆکترینی دووستاندەردیی و هیچستاندەردیی ( سفرستاندەردیی! ئەوانەی داوای ئەوە دەکەن کە زمانی کوردیی، هەلومەرجی سیاسیی و نێودەوڵەتیی رێگەی پێنادات ستاندەردایز بێت و بە ئازادبوونی کوردستانی گەورەوە دەبەستنەوە)، پێچەوانەی بنەما ئەنسرۆپۆلۆجیی و سۆسیۆلینگویستییەکانی چەمکی نەتەوە دروستبوونن. واتە هەردوو دۆکترینی دووستاندەردیی و هیچستاندەردیی ( کە پانکوردیستەکان بانگەشەی بۆ دەکەن)، لەگەڵ هێڵە سەرەکییەکانی بۆچوون و دۆکترینی چێکردنی نەتەوە-دەوڵەت و مۆدێرنیزمدا نەک هەر نایەنەوە، بەڵکوو زۆریش لێوەی دوورن.

بۆچوونەکانی فەیلەسوف و ئەنسرۆپۆلۆجیستی کۆمەلایەتیی ( ئێرنست گێلنەر- Ernest Gellner ) لەسەر ناسیۆنالیزم و رۆڵی ئەو بزوتنەوەیە لە ستاندەردکردنی خودی نەتەوەدا بەمشێوەیەیە ، ئەوە ناسیۆنالیزم و رەهەندە فیکرییەکەیەتی ، نەتەوە و جڤاکەکان بەرهەم دەهێنێن نەک بەپێچەوانەوە (Gellner ،١٩٨٣ ). ئەگەر بەم کرایتێریایە بێ، ناسیۆنالیزمی کورد کە هەنووکە لە کوردستانی باشووردا لە ترۆپکی دەسەلاتدایە ، نەک هەوڵی چێکردنی نەتەوەی کوردی بەهیچ کلۆجێ نەداوە بەڵکوو نەتەوەی کورد، بەسەر کورە

قوزەکانی عەشیرەت و خێڵدا، بەسەر ئەو کەسانەی دەڤەرێکی بەرتەسکی ناوچەکەی خۆیان لەسەروو بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانەوە دادەنێن، تەخشان و پەخشان دەکات.

حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەک بناغەیەکی توندوتۆڵ دەبوایە یەکێک لەبەرنامەکانی بەرنامەی زمانیی بووایە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی زمانی فەرمیی هەرێم، بەپێی ستاندەردە نێودەوڵەتییەکان، چەمکی نەتەوە- دەوڵەت nation-state و داڕشتنەوەی بنەما کولتووریی و زمانەوانییەکانی پێویستە وەک یەکێک لەفاکتەرەکانی تەبایی و خۆڕێکخستنەوەی ناومالّی نەتەوەیی، زمانێکی کۆمۆنی هەبێ. ئەم زمانە کۆمۆنەش دەبێ سەرتاسەری ناوچە جیۆگرافییەکان بگرێتەوە، باشە هۆی چییە هێز نییە بتوانێ کەلّەگایی دایەلێکتێکی کوردیی بنیشێنێتەوە؟ ئایا ئەو لۆبییەی لەپشت ئەمانەوەن کێن و کێ کۆمەکی ماددییان دەکات؟ ئەو لۆبییەی کە توانیویەتی مەلاشووی هەندێ کوردییزانی لاکەوتە و پەخشاننووسی کوردستانی رۆژهەلات لەتاراوگەدا تەڕبکات ، بۆ ئەوەی دژایەتی ستاندەردبوونی زمانی کوردیی لەکوردستانی باشووردا بکەن. لەکاتێکدا کوردستانی رۆژهەلات هەلومەرجی زمانی کوردیی تێیدا زۆر لە کوردستانی باشوورەوە نزیکە. لە ساتەوەختێکدا ستاندەردبوونی زمانی کوردیی لەهەرێمدا گەورەترین دەستکەوتی سیاسیی و کولتووریی دەبێ بۆ نەتەوەی کورد بەگشتیی و کوردستانی رۆژهەلات بەتایبەتیی.

## کێشەی لینگویستیکیی لە کازاخستان و کوردستان

ئەم ئاستەنگی زمان ستاندەردبوونە، هەر دەرگیری کوردستان نەبووە، بگرە ولاتێکی وەک کازاخستان و بیلاروسیاش دەرگیرن. دەکرێ لەسەر تەوەزەلیی و نەزانیی ناسیۆنالیزمی کوردەوە، لەهەمبەر دۆزی زماندا باسی ناسیۆنالیزمێکی تر بکەین، بۆ نموونە لەدوای پێرێسترۆیکاوە perestroika کە هەرەسی سیاسیی و جیۆگرافیی سۆڤیێتی بەدواوە بوو ، یەکەمین ولاتێک کەداوای ستاندەردایزی زمانەکەی خۆی کرد، ولاتی ئیستۆنیا بوو، هەر دوای

کەوتنی دەسەڵاتی سۆڤیێت لە کۆمارەکانی پێشووی سۆڤیێتدا لە ماوەی کەمتر لە ساڵێکدا، تەواوی کۆمارە سەربەخۆکانی تر، هەمان پرۆسێسی ستاندەردایز و ئۆفیشەڵکردنی زمانەکانی خۆیان گرتەبەر. هەنووکە حەڤدە هەژدە ساڵە ناسیۆنالیزمی عەشیرەتیی کورد لەکوردستانی عێراقدا نەیتوانیوە زمانی کوردیی ساغبکاتەوە. لەهەرێمی کوردستاندا، ستاندەردبوونی زمانی کوردیی، بەواتای بەماستەرکردنی هیچ دایەلێکتێک بەسەر ئەوانی تردا نایات. بەڵکوو ئەوە کێڵگەی ئەکادیمیاو ئەدەبی کوردییە کە کرمانجیی ناوەڕاستی بە ماستەرزمان کردووە.

ئەوەی کە گرفتی ستاندەردبوونی زمان لە وڵاتی کازاخستاندا، هاوشێوەی ئەو سەرگەردانییەی کوردستانە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ناسیۆنالیزمی کازاخیی، بەهەمان میتۆدی ناسیۆنالیزمی کوردیی، ناسیۆنالیزمێکی وریا نەبووە، ناسیۆنالیزمێکی داوەشاو بووە، دوای رووداوەکان کەوتووە، نەک پێش رووداوەکان بکەوێ. سەرەڕای ئەوەی پانکازاخییەکانیش بەهەمان مێنتاڵیتیی پانکوردیستەکان لە زمان و فەنکشنەکانی زمان دەگەن. ئەم مۆدێلی سەرگەردانییە، رێک بەسەر ناسیۆنالیزمی کورددا قشت و خشت جێکەوت دەبێ، ناسیۆنالیزمی کوردیی هەمیشە زۆر درەنگ بەخۆ کەوتووە، زیندووترین نموونەش ئەو هەموو هەرایەی لەسەر کەرکوک دەیکەن، پاش ئەوەی پارلەمانی عێراق، بڕیاری دابەشکردنی شارەکەی تێپەڕاند. ئەگەر چارەکی ئەوەیان بکردایە لەپێشتردا و حیزبحیزبێنەیان نەکردایەو گەندەڵیی بەشێوەی خۆرە هەلاهەلای نەکردنایە، هەنووکە کەرکوک لە ئامێزی کوردستاندا دەبوو، زمانی کوردییش، هاوشانی عەرەبیی و تورکمانیی، زمانی سەرەکیی و فەرمیی شاری کەرکوک دەبوو.

زمان بوونی نەتەوەیە، رۆحی نەتەوەیە، دڵی نەتەوەیە، هەروەک چۆن ناسیۆنالیستی ئۆکرانیی مایکۆلا کۆسیڤ دەڵێ" زمان نەبێ، خەڵکیش نییە، خەڵک نەبێ دەوڵەتیش نییە" (kosiv, ١٩٩٤ ). داوەشینە بۆ ناسیۆنالیزمێک داوای گەڕانەوەی کەرکوک بۆ سەر هەرێمی کوردستان بکات ، کەچیی دوو پەروەردەی حیزبیی و ئایدیۆلۆژیی لەو شارەدا شانبەشانی یەک بەسەر زارۆکی کورددا تێدەپەڕێنن. ناسیۆنالیزمێک لەپەروەردەو مەسەلەیەکی هەستیارو پڕ لەداتای وەک زماندا، ئەجێندایەکی هاوبەشی نەبێ، چۆن لە چارەنووسی سیاسیی شارێکدا، کە مێژووی خەباتی نیو سەدەی کوردی تێدا

خەرجکراوە، هاودەنگیی دەبیٚ؟ زۆربەی ئەو ناسیۆنالیزمانەی کە وڵاتیان داگیرکراوە یان لەئۆپۆزیسیۆندا بوونە ، لە زمان و کولتووردا خۆیان ساغکردووەتەوە. بەڵام ناسیۆنالیزمی کوردیی دەستی بۆ ئەمەش نەبردووە.

بەپێی ئامارەکانی کازاخستان بێت، لە سەروبەندی هەڵوەشاندنەوەی کۆمۆنیزم و ستالینیزمدا، کەمتر لە١% خەڵکی ئەو وڵاتە بە تەواویی تونیویانە بە زمانێکی پاراوی کازاخیی بئاخفن. کەچیی بەو دەردەسەرییەشەوە ناسیۆنالیزمی کازاخیی توانیتی زمانی وڵاتەکەی خۆی ستاندەردایز بکات لەرێی پلانێکی سیاسیی و زمانیی بەرنامەرێژکراوەوە، بەزمانی دەوڵەت " State Language" کرا. تەنها پاش یەک ساڵ و بەپلانێکی ستراتیژیی و لینگویستیی، بە زمانی فەرمیی تەواوی دامودەسگا سیاسیی و کولتووریی و ئەکادیمییەکان دانرا. وردە وردە، بە باشترین مۆدێل( Optimal Model) بڕیار درا، پێوەندییە فەرمییەکان تەنها و تەنها بەزمانی کازاخیی بیٚ(Kolst_ ،١٩٩٨).

هەرچەندە زۆرینەی خەڵک زارۆکەکانیان دەنارده ئەو خوێندگایانەی بەزمانی روسیی بوون، بەڵام ئەمە لە پلانی زمانیی و نەخشەدارشتنی ستاندەربوونی زمانی کازاخیی کەمنەکردەوە. وێرای ئەمانەش هێشتا زمانی روسیی زمانێکی باڵادەستەو قورسایی خۆی لەبواری ئابووریيدا بەتەواویی راگرتووە. بەڵام هەرچۆنێک بێت، چارەسەری کێشەی زمان لەکازاخستان، لەچاو کوردستاندا ئازایانە دەستی بۆ بردرا. بایلینگوالیزم bilingualism هەروەک چۆن لە کانەدا و بەلجیکا لە سیستمی سیاسیی فیدراڵییدا جێکەوت کراوە، لە کازاخستانیش دەکریٚ زمانی روسیی و کازاخیی بە دوو زمانی ستاندەرد bilingual Standard جێکەوت بکرێن.

بەڵام بۆچیی ئەم دۆخە ناوازە لە کوردستانێکدا جێکەوت بکریٚ کە زۆرینەی رەهای دانیشتوانەکەی سەر بەیەک ئێسنیکن کە کوردیان پێ دەگوتریٚ؟ بۆچیی دەبیٚ دایەلێکتەکانی کورد، ببرێتە ئاستی جیاوازییەکانی دوو زمانی رەگ جیاوازی وەک ئینگلیزیی و فرانسیی، روسیی و کازاخیی........تاد. ئەوەشمان لەبیر نەچیٚ، سیستمی سیاسیی و جیۆگرافیی لەوڵاتی کانەدا، هێشتا تەواو سەقامگیر نییە، ئەو بەشە دیمۆگرافییەی فرانسیی زمانن، هەمووی چەند ساڵێک لەمەوبەر بوو لەریفەرێندەمێکدا ویستیان لە کانەدای بەشە ئینگلیزییەکە جودا ببنەوە. لەهەر ریفەرێندەمێکی تردا ئەمە بۆیان سەر بگریٚ ، هەردوو بەشە

ئینگلیزیی و فرانسییەکە لەدەوری تەوەرەی یەکستاندەردیی و یەکزمانیی چەق دەبەستنەوە.

هەنووکە پلان و بیرکولیی پانکازاخییەکان لە بواری پراکتیکدا دەردەکەوێ، لە پاش دە ساڵ لە رمانی ستالینیزم ، گەیشتنە ئەو قەناعەتەی ناسیۆنالیزمی کازاخیی هەڵە بوو لە سەپاندنی زمانی کازاخیی بەسەر نەتەوەکانی کازاخییدا، کە زۆر کۆمیونیتی گەورەی روسیی، ئاڵمانیی، کوریایی... تاد تێدایە. زمانی کازاخیی بناغە و کۆڵەکە سەرەکییەکانی خۆی لەدەست دەدات لەبەرامبەریشدا زمانی روسیی پێی قایمتر دەکاتەوە. لە دۆخێکی ئاوادا، لینگویستەکان بیر لە دوو ستاندەردیی دەکەنەوە، واتە دوو زمانی فەرمیی و ستاندەرد ( روسیی و کازاخیی) ، نەک وەک سەرگەردانییەکەی ئێمەی کورد، دوو ستاندەردیی یان چەند ستاندەردیی لە نێوان خودی دایەلێکتە کوردییەکاندا بە زمانناسیی بچوێنین!

لە سییەکانی سەدەی پێشوودا، پتر لەنیو ملیۆن کۆریایی راپێچی ناو کۆمارەکانی سۆڤیێتی جاران کران، هەموویان لەرەگوریشەوە توێنرانەوە، ئێستا تەنها بە خوێن کۆریایین، زمانیان لێ قەدەغەکرا، کولتووریان لێ زەوتکرا، پتر لەسەد هەزار کوریایی هێشتا لە کازاخستاندان ، زمانی سەرەکییان روسییە. کەچیی کۆمۆنیستە زمانناسەکانی کورد ، مەبەست لە د.حەسەنپوور و کۆمۆنیست و چەپە لایەنگرەکانی ئەون، نەک سەرکۆنەی ئەو هەموو سەرکوت و چەوساندنەوەو جینۆسایدە ناکەن کە لەلایەن کۆمۆنیستەکانی روسیاوە دەرهەق بەگەلانی تر کران، بەڵام شەرێکیان ناوەتەوە کە جگە لەشەقوپەقکردنی نەتەوەی کورد هیچ ئەجێندایەکی مرۆیی و زمانەوانیی تری لەپشتەوە نییە. هەندێ نووسەری کوردستانی رۆژهەڵاتیش لەتاراوگەدا، کە زۆربەیان یان کۆنە توودە، کۆنە چریکی چەپ و کۆمۆنیستن، یاخود کوردایەتییەکی زۆر کوێرانە دەکەن، خۆیان تەرخانکردووە بۆ ئەوەی لە دوو ستاندەردیی زمانی کوردیی داکۆکیی بکەن. ستاندەردبوونی کرمانجیی ناوەڕاست لە کوردستانی عێراقدا، بە زوڵم و ستەم دەناسێنن! مۆتیڤی ئایدیۆلۆژییش زۆر کۆنە چەپ و کۆنە کۆمۆنیستی رۆژگاری راستکردەوە و بێ هیچ لۆژیکێک و داتایەکی زمانەوانیی دەستخۆشیی و سەنا بۆ ئەم جۆرە بەلاڕێدابردنانەدا دەنێرن.

ناسیۆنالیزمی کوردیی لەناوخۆی کوردستاندا، لەماوەی دەیان ساڵی رابردوودا نەیتوانیوە لەهیچ پارچەیەکی کوردستان، کەرەسەکان و توخمەکانی بەنەتەوەبوونی کورد مکومتر بکات. زمان وەک یەکێک لە فاکتەرە سەرەکییەکانی هەڵکشانی ناسیۆنالیزم، هێزێکی ئەوتۆی لەخۆ نەگرتووە. ماوەی دوو- سێ دەیەشە کۆمیونیتی کوردیی پەرتەوازەی وڵاتانی رۆژئاوا بوونە و جۆرێک لە جڤاکی دایاسپۆرایان پێک هێناوە. تەنانەت ناسیۆنالیزمی دایاسپۆراش نەیتوانیوە ئەم فەنکشنە سیاسیی و کولتوورییەی بەرنامەی زمانیی لەئەستۆ بگرێ. ئەوەی بێنەدیکت ئەندرسن" ناسیۆنالیزمی دایاسپۆرا" بە" ناسیۆنالیزمی دوورمەودا" دەچوێنێ، ناسیۆنالیزمێکە ئەگەر زایۆنیزمی لێ دەرچێ، نەیتوانیوە فەنکشنە تەواونەکراوەکانی ناوخۆ تەواو بکات(١٩٨٣، Anderson ).

ناسیۆنالیستە کوردەکانی تاراوگە، زمانناسە کوردەکانی دایاسپۆرا، نەیانتوانیوە، بەهیچ شێوەیەک ئەم ئەجێندایە گەشە پێبدەن. لەهەمان ئۆربیتاڵی ناسیۆنالیزمی وڵاتی دایک ( کوردستان )دا دەخولێنەوە. ناسیۆنالیزمی سیاسیی و ناسیۆنالیزمی زمانیی دوو هاوتای یەکترین و زۆرینەی کات دەستلەملانی یەکترین. لە کەیسی ناسیۆنالیزمی کوردییدا بەتەواویی ئەمە بزرە. ناسیۆنالیزمێک هیچ پلانێکی ستراتیژیی و زمانیی نییە بۆ چێکردن یان جێکەوتکردنی زمانێکی فەرمیی و یەکگرتوو، لای کەم لەهەریەک لەپارچەکانی کوردستاندا، هەر حیزب و دەسەڵاتە لای خۆیەوە بەگوێرەی دیمۆگرافیای دەڤەرەکەی خۆی برەو بەو دایەلێکتە دەدات کە زۆرو بۆریی خەڵکەکە پێی دەئاخفن، بۆ ئاوێزانکردنیش، جارجار وەک دیشلەمە زاراوەکەی تری تێکەڵ دەکەن.

لە خودی زانستی کۆمەڵایەتییدا، ناسیۆنالیزم کەمترین وردەکاریی و زۆرترین چەوت و شاشیی هەیە. ناسیۆنالیزم مرۆڤەکان لەسەر ئاستی کولتووریی و ئیسنیکیی دابەش دەکات و بەشوێن پەیداکردنی قەوارەیەکی

سیاسییەوە ویل دەبێت. لەم ئاقارەشدا، گەڕان بەدوای ئایدینتیتییەکدا کە لەزماندا بالادەستتر دەبێتەوە، گولمەزەکە قووڵتر دەکاتەوە. ناسیونالیزمی کوردیی ئەوەندەی دوای دەسەلات و پارە کەوتووە، هەرگیز دوای ساغکردنەوەو ستاندەردکردنی زمانی کوردیی نەکەوتووە، بگرە ئەوەی هەرگیز بەئەندیشەیدا نەڕوات، ساغکردنەوەی زمانی فەرمیی و ستاندەردی کوردییە.

پلاندانان بۆ زمان، لە زاری Wardhaugh ەوە، دەستێوەردانی مرۆییە لە پرۆسەی ساغکردنەوەی زمان و دایەلێکتەکانیدا، دەستێوەردانێکی بەئەنقەستە لە پرۆسەی گۆڕینی زمان و سروشتی زماندا، پلانی زمانیی، جەخت لە ستاتوسی زمان یان گۆڕینی سەروگوێلاکی زمان دەکاتەوە. لە هەنووکەی status کوردستانی عێراقدا، دەسەلاتی سیاسیی و ناسیۆنالیزمی کوردیی، هیچ پێویستیی بەمانە نییە کە بیانکات، بەڵکو تەنها مۆرکردنی ئەو دیفاکتۆیەیە کە زمانی کوردیی بە زاراوەی کرمانجیی ناوەڕاست جێپێی خۆی تێیدا توندوتۆڵ کردووە ( ۲۰۰۲ ، Wardhaugh ).

وەک فێرگەسن Ferguson باسی دایگلۆسیای زمان دەکات، چەندین کارێکتەری سەرەکیی بۆ دایگلۆسیا دەستنیشان دەکات، گرنگترینیان فەنکشن، پرێستیژبوون، میراتی ئەدەبیی، دەستکەوتن( وەرگرتنی زمان)، ستاندەردایز، سەقامگیریی، ڕێزمان، لێکسیکۆن و فەنۆلەجی phonology ن. لەهەلومەرجی دایگلۆسیای زمانی کوردییدا وەک زۆربەی زمانەکانی دنیا، زمانێکی بالا هەیە، زمانێکی نزم هەیە، وەک زمانی ستاندەردی ئالمانیی کە بەزمانی بالا High ناسراوە، لەبەرامبەریشدا ، زمانی ئالمانیی –سویسرایی کە بەزمانی نزم Low ناسراوە. لەهەلومەرجی کوردستانی عێراقیشدا ئەم دایگلۆسیایە بەتەواویی زەقبووەتەوە. لەئاستێکی گشتییدا، سەرەڕای پەرتەوازەبوونی divergent زمانی کوردیی ، بەلام کرمانجیی ناوەڕاست و خواروو، فۆرمێکی گشتگیر و نۆرمێکی ستاندەردیان لەنووسین و ئەدەبیاتی کوردییدا جێکەوت کردووە.

ئەم دایگلۆسیابوونەی زمانی کوردیی، فەنکشنی خۆی زۆر بەجوانیی و ڕێکوپێکیی دەکات و بە سروشتییش بە زمانی پرێستیژی هەرێمی کوردستانی عێراق ناسراوە. بەڕای ئەم نووسینە ئەگەر گرنگترین کارێکتەرەکانی فێرگەسن لەسەر دایگلۆسیای زمانی کوردیی بەراورد بکەین، فەنکشن و پرێستیژبوونە. لەولاشەوە، بنزاراوەی بادینانیی وەک بەشێک لەکرمانجیی سەروو لەهەردوو

کاتەگۆرییە سەرەکییەکەدا، واتە لە فەنکشن و پرێستیژبووندا، کەوتووەتە دواوە و لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا بووەتە زمانی دەڤەرێکی بەرتەسک ، هیچ قورساییەکی ئەوتۆی لەسەر ناوەند و پایتەخت و زمانی پرێستیژی کوردیی نییە، ئەگەر دەسەلاتی کوردیی خۆی تێ هەڵنەقورتێنێ و ژێربەژێر کاری حیزبیی و ئایدیۆلۆژییانەی بۆ نەکات.

یەک راستییەکی لینگویستیکی، مێژوویی و سیاسیی لەهەمبەر زمانی کوردییدا هەیە، خۆبەخۆ زمانێ کوردیی بەدووسەریی و بەدوو کوێخایی هەنگاوی ناوە، بەشێکی پێوەندیی بە جیۆپۆلیتیکی کوردستان و وڵاتە کۆلۆنیالیستەکانەوە هەیە، بەشێکی تریشی پێوەندیی بە تێکست و ئەدەبیاتی ئەم دوو زاراوەیەوە ( کرمانجیی ناوەڕاست و ژووروو) هەیە. وێڕای ئەوەی هەورامییەکانیش ستایلی نووسینی جودایان هەیە. ئەو دوو ستاندەردەی هەندێ کەس باسی دەکەن، نە شتێکی نوێیان داهێناوەو نە نهێنییەکی زمانەوانییان دۆزیوەتەوە. بەواتایەکی تر، هەلومەرجێکی دیفاکتۆ هەیە لە ئاستێکی گشتییدا بەلام نەک لەکوردستانی عێراقدا کە وا دەخوازێ ئەم دوو زاراوەیە شانبەشانی یەکدی ڕێبکەن، ئەم دیفاکتۆیەی زمانی کوردیی ( کوردستانی گەورە ئەگەر یەک قەوارە بێت!!) ئەگەری جێبەجێکردنی بۆ قۆناغێک هەیە، بەلام بەم دابەشبوونەی ئێستای کوردستانەوە، شێتخانەیەکە، نهێنییەکەی بەس لە هاوپەیمانیی جووتستاندەردیی هەندێ لە کۆمۆنیستەکان و پانکوردیستەکاندا دەدۆزرێتەوە .

وێڕای ئەوەی کە کرمانجیی ژووروو نەگەیشتووەتە ئەو ئاستەی کە ستاندەردبوونی خۆی لەناو تێکستی کوردییدا بخەملێنێ، بەواتایەکی تر لەهەلپەی ئەوەدایە کە خۆی ستاندەردایز بکات لەناو کەولی خۆیدا ( نەک لەئاستی ئەدەبی کوردییدا). بەلام ئەم نووسینە بڕوای وایە، کە نابێ ئەم شلەخەجێیە تا سەربێت. دەبێت یەکێکیان لەپێناو بەرژەوەندیی بالای نەتەوەیی و نیشتمانییدا پرێستیژبوونی ئەویدیان بسەلمێنێ و پێکەوە یەک ستاندەردی گشتگیر دروست بکەن. ئەگەر ئەمە روونەدات، ئەوە دوو زمانی تەواو جیاواز دروست دەبێ، ئەم دووزمانییەش لە دوور مەودادا، سەرئەنجام کارەساتی نیشتمانیی و نەتەوەیی لێدەکەوێتەوەو دابڕانێکی زۆر گەورە روو دەدات، کە ئێسنیکبوونی کوردیش دەخاتە ژێر پرسیارەوە. بەلام بۆ بناغەی یەکزمانیی،

باشترین هەلی مێژوویی و کولتووریی لە کوردستانی عێراقدا لەئارادایە، دەکرێ لەهەرێمی کوردستانەوە، بەردی بناغەی ئەم ستاندەربوونە گشتگیرە دابنرێ. ئەم بناغەیەش بۆ یەکدەستی نەتەوەی کورد پێداویستییەکی سەرەکییە. بە دیوێکی تردا زمان و نەتەوە دوو کاتەگۆریی ئەو ئێسنو-نەتەوانەن کە ئێسنیکبوون بناغەی نەتەوەییبوونیانە، نەک هاولاتییبوون لە ولاتیکی فرە نەتەوەو فرە رەگەزدا. چونکە کوردستان ولاتێکی فرە نەتەوە نییە، راستە عەرەب و تورکمان هاوشانی کورد دەژین، بەلام زمانی فەرمیی و سەرتاسەریی دەبێ کوردیی بێ، زمانی عەرەبیی و تورکمانیی ، بەهاوشانی کوردیی زمانی ئەو شوێنانە دەبن کە زۆرینەیان عەرەب و تورکمان بن، یان تێکەلە بن.

## جیاوازییە کولتوورییەکانی دایەلێکت و زمان

نووسەران و خەلکی دەڤەری بادینانی هەرێمی کوردستانی عێراق، دەتوانن یارمەتییدەرێکی باش بن بۆ ئەوەی ئەم پەتپەتێنەی ستاندەربوونی زمانی کوردییە لەئاستی سەرجەم هەرێمی کوردستانی عێراقدا کۆتایی پێبهێنن. ئەگەر کوردبوون و ئایدێنتیتیی نیشتمانیی و نەتەوەیی کوردیان لەئاستی عێراقدا بۆگرنگترە لە تام و چێژی دایەلێکتەکەیان، ئەگەر دەخوازن یەک زمانی فەرمیی کوردیی لەبەغداد لەبەرامبەر زمانی عەرەبییدا هەبێ، ئەگەر دەیانەوێ لەپاڵ خوێندنی زمانی فەرمیی و ستاندەردا، زاراوەکەی خۆیشیان بخوێنن چ لەقۆناغی سەرەتاییدا و بە گوێرەی پسپۆرانی پەروەردەیی، چ لەدەرەوەی دامودەسگا فەرمیی و حکومیی و پەروەردەییەکاندا، گەشەش بەزاراوەکەی خۆیان بدەن، پێویستە ئەجێندای زمانی ستاندەردی کوردیی بخەنە سەروو زاراوە لۆکالییەکەی خۆیانەوە.

بەلام گەرەکە خۆیان ساغبکەنەوە، یان کوردبوون لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستانی عێراقدا، یاخود با بەئاشکرا داوای جیابوونەوەو سەربەخۆیی بکەن. منیش دەنگم دەخەمە پاڵ دەنگی هەموو ئەوانەی دەبێژن: ئەگەر زۆرینەی خەلکی بادینانی هەرێمی کوردستان، لە گەلی کوردی کوردستانی باشوور خۆیان پێ جیاوازترە و خولیای سەربەخۆیی لە مێشکیاندایە، با داوای

سەربەخۆیی بکەن و جودا ببنەوە. لەدلیشەوە پیرۆزباییان لێدەکەم. ئازادیی و مافی مرۆڤ و مافی کەمینەکان لێرەدا بەدەردەکەوێ، نەک لەپەنای دەسەلاتی کوردییەوە ئەم ئاگری جودایی و دووزارییە زیاتر گەش بکرێتەوەو گەورەترین زەبر لە جەستەی نەتەوەی کورد بدات .

ئەوە چ پێوەندییەکی بەمافی مرۆڤ و ستەم و جەوری پەروەردەیی و کولتوورییەوە هەیە، ئەگەر لەکوردستانی عێراقدا، ئەوەی خودی ناسیۆنالیستە عەشایەرو مۆدێرنەکانی کورد ناویان ناوە "چەپکەگوڵ"، ئەگەر لەناو ئەو چەپکەگوڵەدا، گەشترین و جوانترین گوڵیان هەڵبژێردرێ و ئەوانی دیکەش بکرێن بە هۆکاری زیاتر رازاندنەوەو رەونەقدان پێی، چ زیانێکی بۆ زاراوەکان دەبێ؟ ئا لێرەدا شۆڤێنزمی "ناوچەیی، تیرەیی، عەشیرەتیی، شاریی، بەرەبابیی، بنزاراوەیی، حیزبیی و ئایدیۆلۆژیی" و تەنانەت ترادیسیۆنی پۆشاک جیاوازییش زەقدەکرێنەوە. ئەوانەی پاساو بۆ ئەمانە دەهێننەوە، بەشێک لەوانەش دەگرێتەوە کە خۆیان بە ئینتێلەجینسیای نایاب و خەملیو و دنیادیدە ئەژمارد دەکەن. یاخود لە باشترین دۆخدا، سەرکزیی و بێدەنگیی هەڵدەبژێرن لە ئاست بیانووی خوێندن بەزاراوەو بنزاراوەکاندا ، بیانەوێ یان نەیانەوێ، کەمتەرخەمیی دەکەن و خۆیان لەڕاستییەکان دەدزنەوە. بیانەوێ یان نەیانەوێ مامەحەمەیی دەکەن و نایانەوێ دڵی کەسیان لێ برەنجێ. ئەم دڵنەڕەنجان و دڵڕاگرتنی هەموو کەس و هەموو لایەنێک، تایبەتمەندییەکی دوالیزمیی و ساختەکارییەکی رەنگوڕوو گۆڕینە لە سایکۆلۆژیا و مێنتاڵی ئادەمیزادە رۆژهەلاتییەکاندا شەختەی بەستووە.

ئەم ترس و دڵەڕاوکێیەی دایەلێکتە لۆکاڵییەکانی زمانی کوردیی، لە دڵ و دەروونی عەشایەرو ئینتێلەجێنسیاکانیدا، لە سەر مەوداکانی ستاندەردایزی زمانی کوردیی ، وەک ئەو ترسە وایە لە کانیباڵیزمی cannibalism ( خۆخۆریی) مێنتاڵی کوردییدا جێکەوت بووە. ئەم کانیباڵیزمی لینگویستیکییە هەمان ئەو ترسەیە کە کالڤێت Calvet بە گلۆتۆفاجی glottophagy ( زمانکوژیی) ناویدەبات ( Calvet,١٩٧٤). بەلاَم کالڤێت، ئەم گلۆتۆفاجییە بۆ زمانی کۆلۆنیالیستەکان لەهەمبەر زمانی نەتەوە و ولاتە داگیرکراوەکاندا بەکاردەهێنی، نەک وەک ئەو شێتخانەیەی لە هەناوی ئەو ئارگیومێنت و گرمە

وزرمەی لەسەر ددانپێداهێنانێکی فەرمییانەی دەسەڵات، بەزمانی کوردیی ئۆفیشەڵدا هاتوونەتە ئاراوە.

لەکاتێکدا کرمانجیی ناوەڕاست، کە تا هەنووکەش هەندێ ئینتێلەجینسیای کامڵ و سکۆلارو سیاسیی و ئایدیۆلۆژیست، بەدەمیاندا نایات ناوی بە زمانی کوردیی بهێنن و بۆ سووکایەتیی و لێکەمکردنەوەی بە" سۆرانیی" ناوزەدی دەکەن، خۆبەخۆ بووەتە زمانێکی کریۆڵ ( Creole Language)، بەڵام کریۆڵ زمانێکە کە تێکەڵەیەک نییە لەزمانە بێگانەکان، بەڵکو ئاوێتەیەکە combination لە زاراوە کوردییەکانی کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێران، بەتایبەتییش لە هەردوو زاراوەی سەرەکیی کرمانجیی ناوەڕاست و خواروو پێکهاتووە. ئەم کریۆلایزەیشنەی زمانی کوردیی، ئەوەندەی پێوەندیی بە هێجەمۆنی کولتووریی و ئەدەبیی و سیاسییەوە هەیە. ئەوەندە پێوەندیی بە خودی زانستی زماننا‌سییەوە نییە

ئەگەر بە تێڕوانینە کلاسیکییەکەی ئەنسرۆپۆلۆجیستی زمانەوانیی بۆوس Boas یش بێت، کە دەڵێ"زمان پەنجەرەیەکە بەسەر کولتووردا دەکرێتەوە" یاخود " کولتووریش لەزماندا دەبریسکێتەوە" ( Boas ،١٩٨٢ ) . ئەوە کولتووری خێڵ و عەشیرەت و زاراوەو بنزاراوە کوردییەکانە، کە پەنجەرەی زمانی بەسەردا دەکرێتەوەو تێیدا دەبریسکێتەوە، یان کولتووری نەتەوەی کوردە کە رۆڵی ئەو پەنجەرەیە دەبینێ. زمانی کوردیی دەبێ رۆڵی یەک پەنجەرە بلیزێ، هەر کاتێ بوو بەچەند پەنجەرەیەک، بەدڵنیاییەوە چەندین کولتوورو چەندین نەتەوەش( لە دوور مەودادا) دروست دەبن.

## بۆکماڵی و نینۆرسکی

لە ولاتی نۆریوژدا، تەنها دوو زمانی ئۆفیشەڵ نین، بەڵکو کۆمەڵێ زمان هەن، لەوانە: بۆکماڵ، نینۆرسک، سامیی Saami ، سەرەڕای فینلاندیی و سوێدییش... لەساڵی ١٨٢٨ ەوە کە نۆرویژ بە فەرمیی، سەربەخۆیی سیاسیی راگەیاندو دەسەڵاتی دانیمارک کۆتایی پێهات، کۆمەڵێ دایەلێکتی جوداجودایان هەبوو، بەڵام زمانێکی نیشتمانییان نەبوو. لەناو هەموو دایەلێکتەکاندا، دووان مانەوە، سەرەتای بۆکماڵ لەساڵی ١٩٢٨ ەوە دەست پێدەکات، کە لەسەر میراتی زمانی

ریکسماڵ Riksmal کە بە زمانی دەوڵەت ناسرابوو، پێیگرت و خۆی بەدیفاکتۆ کردو بەزمانی کتێبەکان ناسرا.

هەرچیی نینۆرسکە، کە لەسەر زمانی لاندسماڵ Landsmal ەوە پەیدابوو، بەزمانی دەشتەکییەکان (Language of the country) ناسرابوو، زۆر کەشوفشی بە ناسیۆنالیستبوون و رەسەنبوونەوە دەکرد، خۆی بەزمانی نۆرویژیی نوێ ناساند. سەرەڕای هەموو ئەو توندڕۆیی و خۆڕادان و خۆڕاپسکانەی زمانی نینۆرسک، کە بەپێی یاسای نۆریوژیی یەکێکە لە زمانە ئۆفیشەڵەکانی نۆرویژ، کەچیی رۆژبەڕۆژ باکگراوندی خۆی زیاتر لەدەست دەدات و تا ئێستاش بە زمانی ئۆفیشەڵی هیچ شارێکی سەرەکیی نەبووە. تەنانەت شاری Bergen لە ناوەڕاستی ترادیسیۆن و جەرگەی ناوچەکانی نیۆرسکدایە، کەچیی زمانی داموودەسگا فەرمییەکان لەو شارەشدا، هەر بە زمانی بۆکماڵییە. لەبەرامبەریشدا، نینۆرسک تا دێت لە کۆمیونیتی لادێیەکان و جووتیارەکاندا زیاتر قەتیس دەبێت.

## زمانناسیی پاتکۆردیست و کۆمۆنیستە کوردەکان

زۆرکەس لەوانەی رەخنەو سەرنجیان هەبوو لەسەر پێشنیارەکانی ئەو نووسەرانەی داوای ستاندەردایزی زمانی کوردییان لەکوردستانی عیراقدا کردبوو، لەو چەپ و کۆمۆنیستە لاکەوتەو لیبراڵە ئەنتی ئیسلامییانەن، کە پێیانوایە، نەدەبوو ناوی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستانی تێبخرێت!. سەیری ئەم گاڵتەجارییە ئایدیۆلۆژییە بکەن، چونکە ئیسلامیین و بیروباوەڕیان لەسەر بنەما دینییەکان پێڕۆ دەکەن، ئیتر نابێ هیچ حیسابێکیان بۆ بکرێ. پێش هەموو شتێ، بەهۆی ئەو گەندەڵییەی یەکێتیی و پارتیی خستوویانەتەوە، یەکگرتووی ئیسلامیی چ بە چنگەکرێی خۆی بێ، چ بەهۆی کۆمەکی شێخەکانی کەنداو و تەوژمی ئیسلامی سیاسییەوە بێ ، گەیشتووە بەو ئاستەی کە حیسابی هێزێکی گرنگی لەکوردستاندا بۆ بکرێ.

هەنووکە وەک دیفاکتۆ، هێزێکی سیاسیی بەرچاوە، ئەگەریش لەگەڵ خۆماندا سەرراست بین، لە زۆرێک لەو کۆمۆنیست و چەپانە هەڵویستیان بەرامبەر پرسە نیشتمانیی و کوردستانییەکان باشترە، کە نەکەرکوک بەکوردستان

دەزانن و نە بڕوایشیان بەسەربەخۆیی نیشتمانیی و مافی نەتەوایەتی گەلی کورد هەیە. لەم ئاقارەیشەوە، زۆربەی پرۆ دووستاندەردەکان لەکۆمۆنیستەکان و چەپەکانن، چونکە رابەری جووتستاندەردیی ( حەسەنپوور)، باکگراوندە سیاسیی و ئایدیۆلۆژییەکەی کۆمۆنیزمە. لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە، ئایا مێنتالیتیی نووسەر و رۆشنبیری کورد بۆ ئەوەندە وابەستەی ئایدیۆلۆژیای سیاسییە، بەخۆیی چێشتیش لەڕووی ئایدیۆلۆژیی و سیاسییەوە بەو کەسە بگاتەوە، کە قسەی دڵی ئەویش نەکات، هەر دەکەوێتە لایەنگرییکردن. بەخواستن لە بۆوسەوە Boas ،زمان ئەو پەنجەرەیەیە بەسەر هەمووماندا دەکرێتەوە، هەر بیروباوەڕێکی سیاسییمان هەبێ یان نەمان بێ، کەس بۆی نییە تاکێک، لایەنێک بەهۆی ئینتیمای سیاسیی و ئایینییەوە هەڵاوێردێ. پێویستیشە ئەم دیبەیتی زمان ستاندەردبوونە لەهەموو حەزو خولیایەکی ئایدیۆلۆژیی دابماڵرێ و بخرێتەوە سەر ئێسقانە رەق و تەقەکەی کە" زمانناسیی" پێی دەگوترێ .

## ئایا کورد، یەک زمان... یان چەند زمانێکی هەیە ؟

زمانی کوردیی لەکوردستانی باشووردا، فۆرمێکی ستاندەردی وەرگرتووە، ئەم ستاندەردبوونە بە ئازایەتیی خۆی لەبواری مێژوو، نووسین و تێکستی کوردییدا بەرهەم هاتووە، دەسەڵاتی لۆکاڵیی کوردییش لەسەر پشتی ئەم زمانەوە لەنگەری گرتووە. بەپێچەوانەی زۆربەی ناسیۆنالیزمەکانی دنیاوە، زمانی کوردیی خزمەتی بە ناسیۆنالیزمی کوردیی کردووە، نەک بەپێچەوانەوە. هاوکات زمانی یەکگرتووی کوردیی لەکوردستانی عێراقدا نابێ سۆرمانجیی! بێ، بەڵکو دەبێ تایبەتمەندییەکانی سەرجەم دایەلێکتە کوردییەکان لەبەرچاو بگرێ. بۆ ئەوەی زمانی کوردیی لە چەندین ستاندەردی جیاواز رزگار بکەین، پێویستە زۆر راشکاوانە ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین، ئایا بەڕاستیی زاراوە کوردییەکان، زاراوەی یەکزمانن؟ یاخود هەریەکەیان زمانێکی تەواو سەربەخۆن.

ئەم پرسیارە تاسەر ئێسقان مرومۆچە، دەبێ لەڕووی سیاسیی، کولتووریی، لینگویستیکیی، سۆسیۆلۆژیی و ئەنسرۆپۆلۆجییەوە وەڵامی ورد و زانستیی

وەربگرێتـەوە. ئـەم پرسـیارە نـەبـە عـەنتـەریـاتی پـانکوردیزم و ناسیۆنالیستە توندڕۆکان وەڵام دەدرێتـەوە، نـە بـە ئایـدیۆلۆژیای ئـەو مارکسیـست و کۆمۆنیستانەی بڕوایان بەهیچ ئەجێندایەکی نیشتمانیی و نـەتـەوەیی کورد نییە، بەرسڤ نادرێتەوە. ئـەم پرسیارە تـەنها ئـەوانە دەتوانن بەرسڤی بدەنەوە کە زمانناسیی و ئایدیۆلۆژیا تێکەڵ بەیەکدی ناکەن. ئەوانە دەتوانن وەڵامی بدەنەوە کە شۆڤینیزمی ناوچەیی، خێڵچییەتیی ، شارچییەتیی و زاراوە شیرینیی لەلایان سفرە و ئـەجێندا کولتووریی و ئایدێنتیتییـە نیشتمانییەکـانی کـورد لـەسـەروو هەموو مۆتیڤەکانەوە دادەنێن.

بە فاکتی زمانناسیی، زمانی کوردیی پتر لە ٨٠% ی ناوچەکانی کوردستاندا ( هەرێمی کوردستان ) زمـانی فـەرمیی و ستاندەرد و یـەکگرتووە( هـەرسێکیان خۆبـەخۆ) ، میـژووی تێکستی ئـەم زمانـە ( کۆکتێلی کرمـانجیی نـاوەڕاسـت و خـواروو) گـەیاندوویـەتی بـەئاستی زمـانێکی بـاڵا ( H ) ، بـەهـەمـان میتۆدی لینگویستییکیش تەواوی زاراوەو بنزاراوەکانی تری هـەرێمی کوردسـتان زمـانی نزم L ن. لەهیچ شوێنێکی ئەم دنیایەدا نەبووە، لەهـەرێمێکی جیۆگرافیی، یان لە دەوڵەتێکدا، بەبێ یاسـا، بـەرنامـە و ڕێبازی لینگویستیکیی، زاراوەکـان یـاخود بنزاراوەکان بە زمانی پرۆگرامی خوێندن و دامودەسگا فەرمییەکان بن. ئـەمـەی لـەکوردستانی باشووردا ڕوودەدات، بە تێڕوانینی حـەمـەفـەریق حـەسـەن بێت 'مێنتەڵیتی خێڵ' و هەڵنەکردنی کۆمـەڵێ خێڵی ناتـەبایـە نـەک نـەتـەوەی کورد ( حـەسـەن، ٢٠٠٨ ). لـەڕاستییشدا مێنتاڵیتیی ناسیۆنالیزمی خێڵ و ناوچـەگـەریی نـەبێ، فڕی بە ئـەجێندای ناسیۆنالیزمی سیڤیلی کوردییـەوە نییە( ئـەگـەر ئـەو ناسیۆنالیزمە سیڤیلە هەر بوونیشی هەبێ).

## تەپاندنی زمان و مافی دایەلێکتەکان

ئەم دادپەروەرییەی کۆمۆنیستە زمانناسەکانی کورد لەهەمبەر زمانی کوردییدا باسیدەکەن، هەندێکیان داوای دوو ستاندەردیی دەکەن و هـەندێکی تریـان داوای چـەندین ستاندەرد، تـەنانـەت لـە فـەلسـەفـەی لیبرالیزمیشدا ئەم داوایە نـەبووە. لیبراڵیزم کە لەئەنجامی کێشەی ئایینییەوە گەشەی کردووە، داوای دادپەروەریی ، ئازادییە گشتییەکان، ئازادیی تاکەکان، سـەربـەخۆیی مرۆڤـەکان و یـەکسانیی

لەمافەکاندا دەکات. چونکە لە تانوپۆی لیبرالیزمدا دادپەروەریی یەکەمین فەزیلەتی virtue ئینستیتیوتە کۆمەلایەتییەکانە (Rawls, ١٩٧١) .

لێرەوە دەردەکەوێ تەنانەت لە تێروانینی لیبرال-دیمۆکراتییشەوە، زمان ئەو خالە نەبووە کە ببێ بەجێگەی مشتومڕی دادپەروەریی و ستەمکاریی. دیارە ئەم دیدە بۆ سەرەتا یان پێش قۆناغی چێکردنی نەتەوە-دەولەت لە ئەوروپا دەگەڕێتەوە. بەلام بۆ دەبێ ڕەوایی هەبێ لە هەنووکەی کوردستاندا لە نێو گەلێکدا تا ئەم ساتەش زمانێکی ستاندەردو فەرمیی و یەکگرتووی بەشێوازی یاسایی و ئینستیتیوتیی نەبێت، باسی ئەوە بکرێ کە دایەلێکتە کوردییەکان هەریەکەو لای خۆیەوە ببێ بەزمانی ستاندەردی ئەو خێل و شارانەی کە دەیگرێتەوە؟.

دوای دیدی راولیزم ، لیبرالیستەکان ویستویانە کۆنسێپتە دادپەروەرییەکانیان، شۆڕبکەنەوە بۆ زۆر کەنالی تر، بەتایبەتیی بۆ کێشەی ئێسنۆکولتوورییەکان، بەلام دنیای فانتەسیی لە بواری تیۆریی و بواری پراکتیکدا زۆر جودا بووە. بۆ نموونە کاتێ دێتە سەر کێشەی گرووپە کۆمەلایەتیی و ئێسنۆکولتوورییەکان لەلایەک، خۆتێهەلقورتاندنەکانی دەولەتیش لەلایەکی ترەوە، لیبرالیستەکان، لایەنگریی ئەوە بوونە کە حکومەت یان دەولەت دەبێ 'بڕیار بدات کە زمان کامەیەو چییە؟ زمانی دامودەسگا گشتییەکان، زمانی دادگاکان، ناوی شەقام و ڕێگەوبانەکان، بیرۆکراسیی، سوپا، میدیای ئازاد، خوێندنگاکان...تاد دەبێ دەولەت دەستنیشانی بکات و بەیەک زمانی فەرمیی و یەکگرتوو گشتگیر بکرێ. ئەمانە لە لیبرالیزمدا پێیان دەگوترێ' بڕیارگەلە دیفاکتۆکان'.

جادووی ئەم مەتەلە conundrum پڕ لەگرێ کوێرەیە، لە زمانناسیی کوردییدا، کە کەم کەس دەیەوێ خۆی لە قەرەی پەیڤی سەپاندن بدات، لەدیدی لیبرالیزمەوە بەرنامەیەکی زۆر ستراتیژییە. ئەگەر لە نووسەران و ئەکادیمیستانی کورد ورد بینەوە، زۆر کەم دەبینین بوێرن بلێن زمانی کوردیی دەبێ بسەپێنرێ! بەهەزارو یەک بیانوو خۆیانی لێدەدزنەوە، یان ناوێرن بە راشکاویی وبێ پێچوپەنا باسی بکەن. هۆکارەکانی کۆمەلێ کارێکتەری سۆسیۆلۆژییە لە هەناوی هەر تاکێکی کورددا کەم تا زۆر مۆلی بەستووە. ئەم نووسینە نایاتە سەر لایەنە سۆسیۆکولتوورییەکانی ئەم خۆدزینەوەو

شەرمکردن و لەبن لێوەوە قسەکردنانە، بەڵکو دێتە سەر ئەوەی دیدی لیبرالیزم لەسەپاندنی زماندا چییە؟

پێش هەموو شتێ ، ئەو چوارچێوە سەرەکییە دەبێ دەستنیشان بکرێ، سەپاندنی زمان وەک سەپاندنی ئایین ، یان گۆڕینی ئایدێنتیتیی مرۆڤ نییە (Reaume,۲۰۰۰). لە سەپاندنی ئاییندا، مرۆڤەکان ناچار دەکرێن، بڕوا بەخوداکەیان بگۆڕن، شێوازی بیرکردنەوە ئایینیەکانیان بگۆڕن و لە دنیایەکەوە بچنە دنیایەکی ترەوە، یان ئایدێنتیتیی گۆڕینی مرۆڤ وەک ئەوەی کۆمۆنیستە ستالینیستەکان و بەعسییەکان و کەمالیستەکان دەرهەق بە نەتەوە جیاوازەکان کردوویانە. بەڵکو زمان سەپاندن پانوپۆڕکردنەوەی کەناڵی لێکتێگەیشتن و مکۆمکردنەوەی پرسە نیشتمانیی و نەتەوەییەکانە. لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوە بدرێ، سەپاندنی زمانێکی جودا بەسەر نەتەوەیەکی جودادا نا، وەک ئەوەی کۆمۆنیزم کردی لە کۆمارەکانی سۆڤێتی پێشوودا، وەک ئەوەی بەعسییەکان و ئەتاتورکەکان لەسەپاندنی زمانی عەرەبیی و تورکیی بەسەر کورددا کردیان، بەڵکو سەپاندنی زاراوەیەکی پرێستیژی کوردیی بەسەر زاراوەکانی تری کوردییدا، ئەویش تەنها لەکوردستانی عێراقدا. ئەم سەپاندنەش لەبەر دۆزی سیاسیی و نیشتمانیی گەلی کوردە لەکوردستانی باشووردا، نابێ لەبەر دڵی عەشیرەتچییەکان و دەڤەرپەرستەکان و دایەلێکتەکان ئەم سەپاندنە چیتر دوابخرێ.

ئێمە ئارگیومێنتمان لەسەر سەپاندنی زمانێکە لە ناو یەک ئێسنیکدا، لەهەر کوردێکی خوێنگەرم بپرسیی، ئەرێ لالۆ تۆ وەک کورد، ئامادەی زمانی یەکگرتوو، فەرمیی و ستاندەردت بەشێوازە یاساییەکە هەبێ، گومانی تێدا نییە وەڵام ئەرێیە، ئەگەر لێیشی بپرسیت، هەر دایەلێکتێ بێت، دووبارە گومانی تێدا نییە، دەڵێ هەمووی لە لەشی خۆمە، لە بیری خۆمە و لە خاکی خۆمە، گرنگ ئەوەیە خزمەتی ئەجێندای نیشتمانیی بکات. تائێرە لە بواری ئاخافتن و تەکبیردانانداندا لەگەڵتدایە، بەڵام کاتێ دێتە سەر ئەوەی بە کردەوە بڵێی فەرموو ئەوە یەکێ لەزارەکان، بەباشترین پێوەرە زانستیی ولینگویستییەکان بۆ ئەوەی ببێ بەبناغەی زمانی فەرمیی وستاندەردی کوردیی لەکوردستانی باشووردا هەڵبژێردراوە ، نەک هەر بەرپەرچی دەداتەوە، بەڵکو دەمارەکانی دەڤەرچییەتیی و خێڵچییەتیی و شارچییەتیی ڕەپ دەبن و بەهەزارو یەک بیانووەوە دەکەونە

داتاشینی پاساو و بیانووی جۆراوجۆر بۆ ئەوەی هیچ پرۆژەیەکی نیشتمانیی، سەر نەگری.

لێرەدا گومان لە کوردبوونیش دروست دەبێ، ئایا نوکتەیە نەتەوەیەکی چل میلیۆنیی خاوەنی زمانێکی نووسینی هاوبەش نەبێ. لێرەدا دەردەکەوێ بنەماڵەی بەدرخانییەکان، سەرەڕای هەر کارێکی باشیان، چ زیانێکی ستراتیژییان لە یەکبوونی کورد دا، کاتێ سکریپتی تورکیی- لاتینییان پەژراند و سکریپتی ئارامییان ڕەتکردەوە. چونکە ئەم سکریپت جوداییە شێرپەنجەیەکە لە جەستەی کورددا، یان دەبێ دەربهێنرێ، یاخود سەری نەتەوەی کورد لەیەکزمانییدا دەخوات.

لێرەوەیە سەپاندنی زمانی کوردیی لەکوردستانی عێراقدا، دەقاودەق ساغکردنەوەی ئەو زمانە دەکات کە سەرمایەی کولتووریی کوردیی پێ نووسراوەتەوە، کە تێکستی کوردیی پێ نووسراوەو پێ دەنووسرێ و لەرێگەی حکومەتی هەرێم و پارلەمان و ئینستیتوتە ئەکادیمییەکانەوە بەرجەستە بووەتەوە. ئەم سەپاندنی زمانە، هێرش نییە بۆ سەر هیچ گرووپ و •جڤاکێکی کوردیی، بەڵکوو پێوەندییە سیاسیی و کولتووریی و کۆمەڵایەتییەکان بەهێزتر دەکات و کۆدەنگییەکی نیشتمانییش دروست دەکات. ئەوە ناسیۆنالیزمی کوردییە دەبێت زمانێکی یەکانگیر و ستاندەردو فەرمیی ساغبکاتەوە( بسەپێنێ) تا ڕەوایی بە حوکمی سیاسیی خۆی بدات، کاتێک دەیەوێ نوێنەرایەتی گەلی کورد بکات، نەک ئەوەی نوێنەرایەتی کۆمەڵە خێڵێکی تەرتەو وەرتە(Baubock٢٠٠٠) بکات. لەم ڕوانگەیەوە زۆر بەپڕچەکییەوە دەتوانین بڵێین، ئەو تێڕوانینە جیاوازانەی لەمەڕ زمان سەپاندن و منگەمنگی ساغکردنەوەی زمانی کوردییدا خۆی دەردەخات، لەڕاستییدا جیاوازیی ئایدیۆلۆژیی، سیاسیی و ناوچەییە بە ستایلێکی زۆر خێڵەکییانە.

هەندێ لەو ئەکادیمست و ئینتێلەجینسیایانەی لە ئەورووپاو ڕۆژئاوادا، چەندین ساڵە بزربوونە و لەتاراوگەدا یەقیان کردووەتەوە، کەچیی لەگەڵ باسوخواسی ستاندەردایزی زمانی کوردییدا، کەوتوونەتە نووسینی وتاری سیاسیی و دروشمدان و سەربەیەکەوەنان، دژی هەموو ئەو دەنگانەن کە داوای کۆتایی هێنان بەگێرمەوکێشەی بێزمانیی دەکەن. ئەفسانەی ئەکادیمیی و فشەی لینگویستیکیی و بوختانی ئینتێلەجینسیایی نەما نەیکەن، لەوانە ساغکردنەوەی

زمانی کوردیی لەهەریمی کوردستاندا، بە پرۆژەکانی بەعس و ئەتاتورک و پانئیرانییەکان دەچوێنن، بە دۆکترینی دەوڵەت- نەتەوە دروستکردنەکەی ستالین و ئەوروپای رۆژهەلاتی دەچوێنن. کرمانجەکانی پێ دەترسێنن و تۆوی رق و کینەو دووبەرەکیی دەچێنن. ئەم بەلارێدابردنی ئاراستەی ئارگیومێنتانە، تەنها بەمەبەستی سیاسیی و ئایدیۆلۆژییەوە دەکرێن.

## نانەکان و چەواشەکارییەکان

پرۆ-جووتستاندەردەکان، مافی مرۆڤ، کوردایەتیی، کۆمۆنیزم ، دادی کۆمەلایەتیی، پانکوردیزم، ناسیۆنالیزمی کوردیی و ئایدیۆلۆژیاکانیان وەک چێشتی مجێور تێکەڵ دەکەن. بەجۆرێک مەگەر بەس لە مێنیوی Menu چێشتخانەی ئەم جۆرە سیاسییە لینگویستییکانەدا هەبێ. یاخود لەسەقەتترین بەراوردکردن و تێکەڵکردنی کارتەکاندا بوونی هەبێ. بۆ چەواشەکاریی، دۆخی چەند زمانیی و چەند ستاندەردیی لە هەریەکە لە ولاتانی کانەدا و بەلجیکاو سویسرا بە کوردستانێک دەقەبلێنن، جگە لەخاوەنی چەند دایەلێکتێک، هێشتا خاوەنی یەک دانە ستاندەردیش نییە! کۆمەڵێ زمانی جیاواز لە رەگوریشەوە، لەگەڵ کۆمەڵێ زاراوەو بنزاراوەی زمانی کوردییدا تێکەڵ دەکەن و سیاسییانەو ئایدیۆلۆژیایانە خەڵکی پێ چەواشە دەکەن.

ئەم نووسینە، ئەو مافە بەخۆی نادات کە بوختان و قسەی هەڵبەستراو بۆ کەس دروست بکات. بەلام گومان دروست دەکات و گومانێکی زۆر قووڵی لەوە هەیە، ئایا کەسانێک وەک ئاردی ناو درک لە رۆژئاوادا، چەندین ساڵە لەنووسین چوونەتەوە، چۆنە لەپرێکدا زۆربەیان پێکەوە راستبوونەتەوە و کەوتوونەتە ساتیرنووسین و پەخشان و دارشتن نووسین. ئایا ئەمانە لەگەندەڵییەکانی دەسەلاتی کوردیی و حکومەتی کوردیی سوودمەند نین؟ گەلۆ ئەمانە لۆبیی ئەو دەسەلاتە خێڵەکییە کوردییە نین لە رۆژئاوادا نوێنەرایەتی لۆبیی دایەلێکتی کوردیی و چەند ستاندەردیی بکەن؟ ئایا بۆ دەبێ نووسەرانێکی کوردستانی رۆژهەلات کە لەشارێکی کوردستانی باشوور لەپەنای دەسەلاتی کوردییەوە، خوێندنی زانکۆیان تەواو کردبێ، ئێستا

دەقاودەق ئایدیۆلۆژیا و بیرکردنەوە زمانناسییەکەیان وەک دەسەڵاتەکەی ئەو شارە کوردییەی کوردستانی باشوور، جووت و فیت بێ کە باچلەر یان ماستەرنامەکەیان تێدا وەرگرتووە؟

ئایا هەموو ئەمانە ڕێکەوتە و گەزۆ بارینی وەرزییە! نا گومانی ئەم نووسینە لەوەدایە کە هەموویان لە ڕێگەی حیزبێکەوە، دەسگایەکەوە، ئینستیتیوتێکەوە سەرئەنجام هەر دەڕژێنەوە ناو کەڵلەسەری بەشێک لەدەسەڵاتی گەندەڵی کوردیی لەکوردستانی باشوور، کە بەئاشکراو بە نهێنیی، لایەنگریی خوێندنە بە دوو زار ، بەدوو پەروەردە، بەدوو سیستم و بەدوو جۆر کوردایەتیی! . ئایا ئەوەی باپیری ، نەنکی بەجۆرێک لەجۆرەکان لەقارەمانەکانی شۆڕشی کۆن و خێروبەرەکەتی شۆڕش و دەسەڵاتی کوردییەوە نزیک بێ، هۆی چییە وا گریان گرتووەو لەمپەر دروست دەکەن، لەوەی گەلی کورد لەهەرێمی کوردستانی عێراقدا، نەتوانێ بەخاوەنی زمانێکی فەرمیی وستاندەرد بێ ؟

زمانی نیشتمانیی ئەو میکانیزمە پڕ لەبەهایەیە، کە هەموو سنوورێکی ناوچەگەریی، خێڵایەتیی، شارچییەتیی و ڕیزبەندیی لابەلا دەپەڕێنێت، یەکڕیزبەندیی سەرتاسەریی و نیشتمانیی دروست دەکات. سیمبۆلیزمی نەتەوەیی و ئایدێنتیتیی نیشتمانیی و هاوپشتیی سەرتاسەریی و مێژووی هاوبەش تۆکمەتر دەکات. بەپێچەوانەوە دایەلێکتبازیی و گەمەی چەند ستاندەردیی، گیانی سیاسیی و مێژوویی کورد هەلاهەلا دەکات، جومگەکانی یەک نەتەوەیی و یەک نیشتمانییش لە دوورمەودادا شلوشاو دەکاتەوەو مەترسیی پەیدابوونی شەقڵی گەورەی بەدواوە دەبێ. ئەگەر لەڕۆژگاری کۆندا ئەمانە روویان نەداوە، هەنووکە دنیا گۆڕاوەو زمانیش وەک دیاردەیەکی کۆمەلایەتیی لەگۆڕاندایە، ئەگەر دایەلێکتەکان بەجودا بفراژێن و لەگۆڕاندا بن، ئەوە زۆر بەیەقینەوە، کورد هەرگیزاو هەرگیز نابێ بەخاوەنی یەک زمانی ستاندەردو فەرمیی و یەکگرتوو ( لەڕووە سیاسیی و یاسایی و ئینستیتیوتییەکەوە).

چاوەڕێکردن و رۆژگار بەڕێکردن و پشتگوێخستی پرسی زمانی ستاندەردی کوردیی لەکوردستانی عێراقدا، زەنگێکی مەترسییدارە، بەپلەی یەکەمیش دەسەڵاتی کوردیی بەگشتیی و سەرۆکی هەرێمی کوردستان، مەسعود بارزانیی، بەتایبەتیی لێی بەرپرسیارە. ئەوە زمانێکی یەکگرتووە، نەک

جوکەجوکی دایەلیکتەکان کە تاکی کورد وەفاداریی loyalty و ئایدینتیتی خۆی پیوە گرێ دەدات. هەروەک میڵ Mill باسی وەفاداریی و ئایدینتیتیی نیشتمانیی و متمانەی نێوان گرووپ و جڤاکەکان دەکات، پێیوایە "دیمۆکراسیی پێویستیی بە کودەنگییەکی لینگویستیکیی هەیە، ئەگەر ئەمە نەبێ، ئینستیتیوتیی ئازاد، بوونی ئەستەمە" (Mill, 1972,230 ). لەهەرشوێنێکیش ئینستیتیوتی ئازاد و سەربەخۆ نەبێ، هەموو بەهاکانی مافی مرۆڤ و دیمۆکراسیی دەکەونە ژێر پرسیارەوە.

ئەو ئایدیۆلۆژیستە کوردانەی، خەمی نازونوزی دایەلێکتە کوردییەکانیانە، لەژێر پەرچەمی زمانناسییدا، پێویستە خەمی پاراستنی زمانی کەمینە نەتەوەکانی تریان لە بیردا بووایە، لە سبەی رۆژی دەستنیشانکردنی زمانی فەرمیی کوردستاندا، چ لە هەنووکەدا بە بێ کەرکوک و ناوچە تەعریبکراوەکانی تر، چ لە سبەینێی هەرێمی کوردستاندا بەهەموو خاکەکەیەوە، پاراستنی زمانی عەرەبیی، تورکمانیی، کەلدانیی و ئاشوورییەکان، دەبێتە فەنکشنی سەرەکیی، نەک دایەلێکت و سەبدایەلێکتە کوردییەکان. مافی پاراستنی زمانەکان ئەرکی مرۆیی و دیمۆکراسیی و لیرالیزمە، نەک گورنەتەڵەیی دایەلێکتە کوردییە جۆراوجۆرەکان. ئەم چەواشەکاریی و سەرلێشواندنانەی بە ناوی پاراستنی زمانەوە لە کاتەگۆریی دایەلێکتەکاندا دەکرێن، ئاژاوەنانەوەیەکی زۆر ئایدیۆلۆژیستانەو خێڵەکییانەیە.

## کوردستانی پاشوو و کوردستانی گەورە!

لە کاتی سەپاندنی زمانی کوردیی بەسەر تەواوی هەرێمی کوردستاندا، کوردێکی هەورامان، شارباژێر، پشدەر، بادینان، دەشتی قەراج و گەرمیان هیچ شتێکی پیرۆز لەدەست نادەن، بەپێچەوانەوە شانازییەکی نیشتمانیی و سیمبۆلێکی سەرتاسەریی دەبێتە ئایکۆنی ئایدینتیتیە نیشتمانییەکەیان لە بواری لینگویستیکییدا رەنگ دەداتەوە. ئەمە بەو واتایە نییە، تەواوی زاراوەو بنزاراوەکان بفەوتێنرێن، ئەمە لەتوانای هیچ جەبەرووتێکدا نییە، هاوکات فەوتاندنیشیان بەقازانجی کەس نییە، چونکە بەرنامە و رێبازی ( planning

and policy) زمانناسیی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ پێویستیی پێیان دەبێت. ڕاستییەکی جیۆپۆلیتیکی هەیە، کە کوردستانەکان بەدابەشکراویی بۆ ماوەیەکی زۆر دەمێننەوە( ئەوە ئەگەر هەر یەکیش بگرنەوە) ، ئەم نووسینە لەوبڕوایەدایە، هەرگیزاوهەرگیز کوردستانی گەورە دروست نابێ، لەبەر هیچ نا ، لەبەر ئەوەی مێنتالّیتیی تاکی کورد، خێڵی کورد، ئینتیلەجێنسیای کورد هەرگیز بەو ئاستە ناگات.

تەنانەت ئەگەر تەواوی هاوکێشە هەرێمیی و پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان لەداهاتوودا ئەم هەلە بۆ یەکگگرتنەوەی کوردستانەکان! بڕەخسێنن. بەلاّم ئێمە لەهەنووکەداین و کوردستانی عێراق دیفاکتۆیەکەو دەبێ لەگەڵیدا مامەڵە بکەین، کەواتە لەدوورمەودادا، کاڵبوونەوەی دایەلێکتە کوردییەکان هیچ زیانێکی بۆ زمانی کوردیی نییە، بەڵکوو بەپێچەوانەوە گوژمێکی کولتووریی گەورە بەزمانی ستاندەردو ئۆفیشەڵ و یەکگرتووی هەرێمی کوردستان دەدات. ئەوسا ئەم زمانە یەکگرتووەی هەرێمی کوردستان لەگەڵ زمانی کوردیی کوردستانی تورکیا( کە گومانی تێدا نییە کرمانجیی سەروو دەبێت)، مامەڵە دەکات بۆ پێکەوەنانی زمانێکی یەکگرتووتر( بەدڵنیاییەوە بەتێکەڵکردن نا، بە ڕێژەی زۆروبۆریی کرمانجەکان نا، بەڵکوو بەپێی پرێستیژبوون و قورسایی فەنکشن و مێژووی تێکست....تاد).

تا ئەو ساتەش پێویستە کرمانجیی ژووروو سوود لە زمانی ستاندەردی کوردستانی باشوور ببینێ و زیاتر خۆی لێ نزیک بکاتەوە لە هەموو کاتەگۆرییە لینگویستییەکاندا. بەلاّم بەداخەوە ئەوەی ئێستا دیفاکتۆیەو دەیبینین، پێچەوانەی ئەم بۆچوونەیە. فەرموون لەهەموو ئەو کەناڵە ئاسمانییانەی پەخشی تەلەفزیۆنیی دەکەن بە زاراوەی کرمانجیی ژووروو، تەواوی تێکستەکانیان بە کرمانجیی ژووروەوە، بۆ دانسقەش تێکستی کوردیی بە سکریپتی ئارامیی- عەرەبیی نانووسرێن. ئەمە لەلایەکەوە ئەژمارنەکردنە بۆ هەست و بیری کوردی کوردستانی ڕۆژهەلاّت و باشوور، حیسابنەکردنە بۆ خەرمانی تێکستی کوردیی کە بە سکریپتی ئارامیی- عەرەبیی نووسراوە، لەلایەکی تریشەوە، شۆڤینیزمی لەهجەیی و دایەلێکتپەرستیی ئەو کەسایەتیی و ناوەندو لایەنانە دەگەیەنێ کە لەپشت ئەو کەناڵە کرمانجییانەوە وەستاون.

وەک جەختکردنەوە، لەوڕێنەش بەولاوە ترە، لەهەنووکەو داهاتوویەکی نزیکیشدا، بیر لە زمانێکی ستاندەردی یەکگرتوو بۆ سەرتاسەری پارچەکانی کوردستان بکرێتەوە. زمانی کوردیی لەکوردستانی عێراقەوە دروست بووە و دەبێ ئەم راستییە تاڵە بپەژرێنین. دەشبێ لەم هەرێمی کوردستانەوە ساغبکرێتەوەو فۆرومی Forum سەرەکیی ئەو پلان و رێبازە زمانەوانییانە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکی کوردستانەکانی تردا دەستنیشان بکرێ. گومانێکی ئەوتۆ هەڵناگرێ، کوردستانی رۆژهەلات، بەشێوەیەکی سروشتیی و ئۆتۆماتیکیی دەکەوێتە ژێر هێجەمۆنیی ئەم زمانەی هەرێمی کوردستانەوە، کوردستانی سووریاش کەم و زۆر دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەکانی، لای کەم لەبەر ئەوەی سکریپتی نووسینەکەیان ئارامییە.

کاتێکیش زمانناسەکانی داهاتوو، نەوەی نوێ، لەدوور مەودادا دێنە سەرئەوەی کە زمانی کوردیی یەکبخەن لەئاستی کوردستانی گەورەدا!، ئەوسا بەکردەوە رووبەرووی ئەوە دەبنەوە کە ئەو ئاوەی جەلادەتی بەدرخان رشتی بۆ پەژراندنی سکریپتی تورکیی- لاتینیی چ زیانێکی قەبارە گەورەی لەسەرتاسەری مێژووی کورد، کولتووری کوردیی ، زمان و ئەدەبی کوردیی و تێکستی کوردیی داوە. تێگەیشتن لەم مەترسییە، حیکمەت و وردبینیی و کاتێکی زۆری دەوێ. تەنها تێپەڕبوونی کاتە، کە کورد بەئاگا دەهێنێتەوە، کورد بەشێوەیەکی گشتیی کاتێ تێدەگات، رۆژگارێک بەچاولێکەریی و نەزانیی و مێنتاڵی خێڵەکیی و کوێخایەتیی، چ کوتەکێک دراوە لەکەمەری تێکستی کوردیی و کولتووریی کوردیی و ئەجێندای سیاسیی کورد و بۆ هەتاهەتایە دابەشی کرد.

ئا لێرەوەیە، کە شتێکە لەئەستەم دەچێ، سکریپتی نووسینی نەتەوەیەک! یەک نەبێ، باسی ئەفسانەی زمانی یەکگرتووی کوردییش لەئاستی کوردستانی گەورەدا! بکرێ. زۆر گرنگە ، سەر لەخۆمان نەشێوێنین و راستییە سیاسیی و جیۆگرافییەکان هەرسبکەین و لەچوارچێوەی کوردستانی عێراقدا بیر لەزمانی یەکگرتوو بکەینەوە. بەپێی هەموو یاسا نێودەوڵەتییەکانیش، هیچ کۆسپێ نییە کە گەلی کورد لەکوردستانی عێراقدا، زمانی فەرمیی خۆی ساغبکاتەوە و چیتر چاوەڕێی خەون وخەیاڵی پانکوردیستەکان، سکۆلارە کۆمۆنیستەکان، ئێسنۆزمانناسەکان، ناسیۆنالیستە سەرسەختەکان و مێنتاڵی زۆرو بۆریی نەبین.

کورد لەهەریمی کوردستانی عیراقدا، ئەزموونگەلێکی زۆر زیندوو، نزیک و پڕ زانیاریی لەبەردەستدایە، ئەزموونەکانی تەواوی ئەو کۆمارانەی لەیەکێتیی سۆڤیەتەوە لەدایک بوون، ئەو وڵاتە نوێیانەی باڵکان لەدەیەی رابردوودا دروست بوون، گوژمێکی زۆر باشە کە بیر لەستاندەردایزی زمانی کوردیی هەرێمی کوردستان بکرێتەوەو یەکلایی بکرێتەوە. بەلام پرسیارێکی سیاسیی و سۆسیۆکولتووریی یەخەی هەمووومان دەگرێتەوە ئایا گەلی کورد لەکوردستانی عیراقدا، ئەجیندای بڵندی نیشتمانیی، یان ئەجیندای خێڵ و عەشیرەت و شارو دەڤەرەکەیان؟ بەلاوە گرنگترە. لە زمانناسییدا ئەوە والا بوودتەوە، هەر گەل و نەتەوەو ئێسنیکێک بیەوێ لە دەوری تەورەی زمان خۆی یەکبخات ( integration) ، پێویستە خاوەنی ئایدێنتیتی و بەهای بەرزی نیشتمانیی بێت.

بەپێچەوانە ئەگەر کەچە ئایدێنتیتی و بەهای نزمی نیشتمانیی هەبێ، حەز بە سەرخواردن و بەتواندنەوە ( assimilation) ی خۆی ، لەناو نەتەوەو ئێسنیکی تردا دەکات. ئەم دیبەیتەی لەکوردستانی عیراقدا لەئارادایە، تا رادەیەکی زۆر ئەم مێنتالیتییەی لەخۆگرتووە. ئەو کەڵەگاییەی زمانی عەرەبیی بەسنگێکی فراوانەوە لەبادینان لەسەردەمی بەعسدا ، بەسەر زمانی کوردییدا پەژرێنرا کە ئێنتێلەجێنسیاکانی ئەوسا و هەنووکەش بە" سۆرانیی" ناوی دەبەن، نموونەیەکی گەشەو ئامادەنین بۆ لقێک لە زمانەکەی خۆیان بیپەژرێنن. لەروانگەی ئەسرۆپۆلۆجیای زمانەوە هەمیشە دایەلێکتەکان بەیەکدا دەشاخێن. بەلام سنووردانان بۆ ئەم بەهەڵداشاخانە زۆر ئاسانە، تەنها کاریزمایی و وردبینیی سیاسییەکان و لینگویستیکەکانی دەوێ.

## گرفتی تێرمۆنۆلۆجییە زمانەوانییەکانی زمانی کوردیی

جگە لەگرفتی دایەلێکت جیاوازیی، کۆمەڵی وردەکاریی و تێرمۆنۆلۆجیی زمانناسیی تر هەیە، هەر دەڵێی خشت بەبالای زمانی کوردیی بڕدراون. لەوانە ئایسەگلۆس isogloss ، ئێسنۆلێکت ethnolect .....تاد. بەدەر لەوەی لە هەرێمی کوردستانی عیراقدا ئەو زمانە کوردییەی رەگوریشەیەکی پتەوی هەیە، ستاتۆسێکی سۆسیۆلێکت sociolect ی وەرگرتووە. لەزمانناسییدا،

سۆسیۆلیێکت بەو زمانە یان زمانانە دەگوترێ کە کاریکتەرەکانی لە باکگراوندێکی کۆمەڵایەتیی بەهێزەوە پەلوپۆیان هاویشتووە. هەر ئەم سۆسیۆلێکتبوونەی زمانی کوردیی هەرێمی کوردستانە، کە لەچەند دایەلێکتێکەوە ( بەتایبەت کرمانجیی ناوەڕاست و خواروو ) بووە بە زمانی بالای ناوچەیەکی بەرفراوان و ئەدەب و تێکست و مێژوویەکی زۆری گەلی کوردی پێ نووسراوەتەوە. هەر ئەم تایبەتمەندییە پرێستیژبوونەیشە کە رۆلی لینگوافرانکایەکی بناغە ئەستووری داوەتێ.

هاوکات لەنێو گرفت و وردەکارییەکانی تری زمانی کوردییدا، راستییەکی جیۆگرافیی و سنووردابڕانی زمانیی هەیە پێویستە لەبەرچاو بگیردرێ، لەزمانناسییدا بەم دابڕانە سنووریی و کەرتبوونە جیۆگرافییانە دەگوترێ ئایسەگلۆس . ئەم هەلومەرجە ئایسەگلۆسییە تەنانەت لە سەردەمی کۆلۆنیالیزەکردنی کوردستان و دابەشکردنەوەی کوردستانیشدا لەلایەن هێزە دەرەکییەکانەوە لەبەرچاوگیردراوە. لە کوردستانی عێراقیشدا، جێپەنجەی دیارە، ئەم دەردی ئایسەگلۆسییەیە شەڕی مەلایی و جەلالییشی زیاتر گەشکردەوە، تێرمی "سۆرانیی" و "بادینیی"شی زیاتر لەیەک سویوە. لە ئاست کێشەکانی زمانی کوردییشدا، ئایسەگلۆسیی بەلایەکی مەترسییدارە بۆ سەر فۆرمێکی گشتگیر و یەکدەستی زمانی کوردیی لە کوردستانی عێراقدا. دیارە لەناو ئایسەگلۆسیای زمانی کوردییدا، جیاوازیی رێزمان بەگشتیی و راناوەکان بەتایبەتیی سەرگەردانییەکی ترە.

سەبارەت بە ئێسنۆلێکتیی زمانی کوردیی، کە لەناو خودی ئێسنیکی کوردییەوە سەری هەڵداوە، هەنووکە کرمانجیی ناوەڕاست خۆبەخۆی لە دوو پارچەی کوردستاندا بە لینگوا فرانکا بووە. هەرچەندە لینگوافرانکایەک نییە بەشێوازیی یاسایی( دەستووریی) و سیاسیی ، بەڵام بە گەشەی سروشتیی لەڕووی کولتوورییە ئەم مافەی وەرگرتووە. هەروەک فیشمان Fishman لە سۆسیۆلینگویستیکدا باسیدەکات و دەڵێ" خودی مۆدێرنیزە رنەی لەزمان و ئێسنیکبوون داوە و بەئاستێکی گرنگ لەهۆشیاریی گەیاندوونە" (لا٢٣٠، ١٩٧٠ ، Fishman ). ئەم رنەلێدانە لەزمانی کوردیی لەلایەن مۆدێرنیزمەوە راستییەکی تێدایە، کە گەیاندوویەتی بەو ئاستە پرێستیژەی کە تێیدایە، بەڵام

سەبارەت بە ئیسنیكبوونی كورد، ئاستی هۆشیارییەكەی لەهەمبەر گرنگیی زماندا، لەئەوپەڕی خراپییدایە.

## لە کوێوە دەست پێبکرێ؟

ستاندەردایزی زمانی كوردیی لەكوردستانی عێراقدا، دەكرێ بە بۆچوونەكانی هاوگن Haugen دەستی بۆ ببردێ، كە پێیوایە لەپێناو زمانێكی نیشتمانیی یان هەرێمییدا، لەباری سیاسیی و كۆمەلایەتییەوە گرنگییەكەی لەبەرچاو بگیردرێ(١٩٧٣ ، Haugen ) . لەدۆخێكی وەك كوردستانی عێراقدا كە هۆمۆجینییەسێكی homogeneous زمانیی نییە، دەكرێ كۆددانان( كۆدیفیكەیشن) لەسەر نۆرمی ئۆرسۆگرافیی، ڕێزمان و فەرهەنگی زمانی كوردیی بكرێتە بناغەی ستاندەردبوونێكی هەمەلایەنە( ibid ) . زیندووترین نموونەی زمانەكانی جیهانیش لەم بوارەدا، زمانی ڕۆمانییە، كەبەم قۆناغانەدا تێپەڕێندراوە.

سەبارەت بەدووستاندەردیی زمانی كوردیی لەئاستی كوردستانی عێراقدا، جگە لەوەی عەقلییەتێكی عەشایەریی و خێڵەكییە و هەندێ كۆمۆنیستی كورد كاپێتی ئەم بزوتنەوەیەن، بەلام لەبەرگێكی سكۆلاریی و ئەكادیمییدا خۆی رادەگەیەنێت. ئاخر ئەو شێتخانەیە چۆن دەبێ، لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق، ئەنجوومەنی هەرێمی كوردستان و حكومەتی هەرێمی كوردستان، لەسەر دراو و پاسپۆرتی عێراقیی، دەستووری عێراق، یاسا و دادگاكانی هەرێم و پایتەخت، بەهەردووكیان بنووسرێ. وەك ڕەفیق سابیر ئاماژەی پێدەكات، ئاخر هەر "خۆسووكردنیشە" لەلای نەتەوەی سەردەست و داگیركارانی عێراق ( ئەمێریكا وبریتانیا)، لەبەغداد، شەڕ لەسەر كام زمانی كوردیی بكەین( سابیر، ٢٠٠٨ ). خۆ گاڵتەجاڕیی ئەم دووستاندەردییە وەك بە چەوریی و گریسی ئایدیۆلۆژیا بە عەقڵی هەندێ ئەكادیمیست و لینگویستیكی كورددا چووە، بە عەقڵی نەتەوەكانی تری عێراق و زۆرینەی ڕەهای كوردی كوردستانی عێراقدا ناچێ، كە بەكام زمان لەو دووستاندەردە بێت! لەكاتێكدا كرمانجیی لەباری لینگویستیكییەوە هەر توانای بوون بەزمانی ستاندەردی نییە. ئەم هەموو

فرۆفیل و نموونە هێنانەوەی زمانەکانی دنیا و بەراورد کردنیان بە دایەلێکتە لۆکالییەکانی زمانی کوردیی، سەرسەختییەکی ئایدیۆلۆژیی و نەسەلماندنی دیفاکتۆیەکی زمانەوانیی هەرێمی کوردستان نەبێ، ئەی چیترە؟

بەدبەختیی کورد، هەر لەسیاسەتدا نییە ،کە سیاسەتوانانی یان مێنتالێتیی خێڵەکیی و حیزبیی و ئایدیۆلۆژییان هەیە، یاخود پسپۆری بازرگانیی و پارەکەڵەکەکردنن و پرسە نیشتمانییە چارەنووسسازەکانیش هەر ئەمڕۆ و سبەینێیان پێکردووە. بەڵکوو لە زۆربەی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتییدا، کورد هەمان گرفتی هەیە. لە کێشەی زمانی کوردییدا، ساغکردنەوەی ئەم زمانە لە کوردستانی عێراقدا، لایەنگرانی جووتستاندەردیی زۆر بەوریایی و ئاگایانەوە لەقە لە بنەماکانی ستاندەردایزی زمان دەدەن. مەسەلەی زمانی کوردیی لەکوردستانی عێراقدا، تێکەڵ بە زۆروبۆریی ژمارەی کرمانجەکان و پارچەکانی تری کوردستان دەکەن. دواتر هیچ جیاکارییەک بۆ هەلومەرجی سیاسیی و جیۆگرافیی و مێژوویی کوردستانی عێراق ناکەن، هەموو چارەسەرییەکان لە پاکیجێکدا ( جووتستاندەردیی) بۆ ئاستی گشت پارچەکانی کوردستان باس دەکەن.

چونکە بەشێوەیەکی گشتیی لە ئایدیۆلۆژیای سیاسیی و تێڕوانینی سیاسیی ئەواندا، هەمیشە لەگرفتە چینایەتییەکانەوە دەچنە ژوورەوە، مەسەلەی زمانیشیان تێکەڵ کردووە بەم مەودا سیاسیی و ئایدیۆلۆژییانە. بەدەر لەوەی خاوەنی ئەو دووستاندەردییە، لینگویستیکییە یان نا، زمانناسییەکەی لەسەر زمانی کوردیی، ئەجێندای سیاسیی و ئایدیۆلۆژیی لەپشتەوەیە یان نا، بەڵام ئەو ددانپێنانەی بە دیفاکتۆی زمانی کوردیی لەکوردستانی عێراق و شێوازی میتۆدۆلۆجیی زمانناسییەکەی ، بۆ خۆی بەهەندوەرنەگرتنی ئاگایی کۆمەڵایەتیی و لاوازیی هەستکردن و بەرپرسیارییەتییە لە ئەجێندای نیشتمانیی و لە زمانناسییبوونیدا. ئەمانەش کاتێ لەلایەن سکۆلارەکانەوە دەکرێن، ئاگایی و بەلارێدابردنێکی زۆر زیرەکانەی تێدا بەکاردەهێنرێ و لە چەمکە بنەڕەتییەکانی زمانناسیی دووردەکەوینەوەو حەماسی ئایدیۆلۆژیی، مێشک و هزر و قەڵەمیان کۆنترۆڵ دەکات(١٩٨٢، Hutton ). هەروەک حەماسی کۆمۆنیزم و پانکوردیزم مێشک و قەڵەمی کۆمۆنیستە کوردەکان و پانکوردیستە جاهیلەکانی کۆنترۆڵ کردووە.

# ئەنجامگیری

وەک ئەنجامگیریی و کۆمکردنی ئەم نووسینە، حکومەتی هەرێمی کوردستان، پێویستە بە ئەجێندایەکی نیشتمانیی کورتمەودا بۆ هەنووکە و دوورمەودا بۆ داهاتووی نزیک و دوور، لە پرسی زمان وردبێتەوە. زمانناسان و هەموو ئەو دڵسۆزانەی خەمی زمانی فەرمیی، ستاندەردو یەکگرتووی کوردییان لە ئەستۆ گرتووە، یان بەخەمی خۆیانی دەزانن، پێویستە زیاتر لەسەر کێشەکانی زمانی کوردیی بنووسن و ئەم دیبەیتە بەرفراوانتر بکەنەوە. زمانی کوردیی لەکوردستانی باشووردا، پێویستییەکی وردی بە بەرنامەڕێژیی زمان (language plan) و ڕێبازی زمان language policy و یاسای زمان language law هەیە. هەموو ئەم میکانیزمانەش پێویستیی بە تێکەڵکردنی هەموو هەوڵەکان هەیە، تەواوی پرۆ ئارگیومێنت و ئەنتی ئارگیومێنتەکان دەبێ لەبەرچاو بگیردرێن. لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە، زمانی کوردیی پێویستە توێژینەوەی لەسەر بکرێ، لە دروشمی سیاسیی و ئایدیۆلۆژیی دووربخرێتەوە.
پوختەی ئەم نووسینە لەو بڕوایەدایە، نابێ بەهیچ بیانوویەک، زمانی ( ستاندەرد و فەرمیی و یەکگرتوو) ی هەرێمی کوردستانی عێراق دیزەبەدەرخۆنە بکرێ و بە ڕێککەوتنی حیزبیی و سیاسیی دەڵەمە بکرێ. جووتساندەردیی، هیچستاندەردیی و چەند ستاندەردیی زمانی کوردیی، خۆرەیەکە فۆرم و نۆرمی زمانی کوردیی ( هەرێمی کوردستان) دەخواتەوە. سەرەڕای دیفاکتۆی چەند دایەلێکتیی زمانی کوردیی لەئاستی پارچەکانی کوردستاندا، بەڵام لەکوردستانی باشوورەوە کورد بەرەو دابەشبوونێکی جیۆگرافیی و سیاسیی قووڵ دەبات.
دەسەڵاتی سیاسیی کورد و حکومەتی هەرێم و ئەو حیزب و کەسایەتییانەی لەپشت ئەم بۆچوونانەوەن، هەمان مێنتاڵیتیی شەڕی "سۆرانیی" و "بارزانیی –

بادینانییەکان ی شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی رابردوویان هەیە و ناوی سکۆلارو ئەکادیمیست و ئینستیتیوتیان لەخۆیان ناوە. دوو پەروەردەیی و دوو جۆر خویندن و دوو جۆر ستایلی زمان لەهەریمی کوردستاندا، دریژەدانە بە باکگراوندی حیزب و خیل و بنەمالە، دریژەدانە بە ئایدیۆلۆژیای میلیشیا جەلالیی و مەلاییەکان، دەستگرتنە بەهەمان کۆنسیپتی پەنجا بەپەنجای دەسەلاتی دوو حیزبەکەوە. بەردەوامییەکە لەو جووت میرنیشینییەی کە لە نەوەدەکانەوە لە ئاکامی شەری نیوان ئەو دووزلحیزبە و پاشکۆکانیانەوە سازاندیان و بەمەش رۆح و میشکی کۆی هاوولاتییان و نووسەرانی دەڤەری سۆران و بادینانیان بە نەخۆشیی دووبەرەکیی گۆشکرد. دریژەدانیش بە دیبەیتەکان لەسەر ستاندەردکردنی زمانی کوردیی تاکە زامنی هەلبژاردنی ریگەیەکی زانستییە بۆ ساغکردنەوە و ئەنسرۆپۆمۆفیزەکردنی زمانی کوردیی لە هەریمی کوردستانی عیراقدا.

لە کۆتاییشدا پیویستە جەخت لەوە بکریتەوە، بۆچوونی جووتستاندەردیی نەک هەر زیانبەخشە بەئاسۆی سیاسیی و زمانەوانیی زمانی ستاندەردی کوردیی، بەلکوو لەرووی لینگویستیکیی و ناسیۆنالیزم و زانستیشەوە زۆر پیچەوانەی بۆچوونە سەرەکییەکانی بینەدیکت ئەندەرسن و ئەنتونی سمیسە، لە پیوەند بە نەتەوە، زمان، زمانی نەتەوەیی و زمانی نیشتمانییدا بەتەواویی بەیەکدا هەلدەشاخین.. ئەگەر کۆمۆنیستیک ، نووسراوەکانی مارکس و ئەنگلسی نەخوێندبیتەوە ناتوانێ لە دۆکترینی کۆمۆنیزم و مارکسیزم بگات، مەرج نییە بروای پیی هەبێ، بەلام مەرجە کەسیک کۆمۆنیست بیت، لای کەم بروای بە مانیفیستۆی کومۆنیستیی هەبێ.بۆیە مەرج نییە هەرچیی کومۆنیست بوو ئیتر گرامشی بیت. بەهەمان میتۆدیش دەکرێ کەلک لە بیروبۆچوونەکانی سکۆلارو فەیلەسووفەکانی بواری ناسیونالیزم، لیبرالیزم و مۆدیرنیزم وەربگرین، نەک دوای بۆچوونی هەندێ چەپی کلاسیکیی و پانکوردیستیی شۆڤینیست بکەوین، کە ورینەی ئایدیۆلۆژیی لە زمانی ستاندەردی کوردییدا ساغبکەنەوە. بۆیە زۆر پر مەترسییە، ریگە بدرێ کوکتیلی ئایدیۆلۆژیا و زماناسیی دەرخواردی گەلی کورد بدرێ.

دواجاریش راستییەکی زۆر تال هەیە، کە ناتوانین خۆمانی لێ دەرباز بکەین، زمانی کوردیی بۆ نەتەوەی کورد لەسەرتاسەری کوردستاندا، لەهەنووکەو

داهاتوویەکی نزیکدا شتێکی ئەستەمە. ناکرێ هەلومەرجێکی دیفاکتۆی سیاسیی و کولتووریی کە لەکوردستانی عێراقدا هەیە لەدەستی بدەین. بناغەی زمانی ستاندەردی کوردیی، لەدایگلۆسیای زمانی کوردییدا، لەکوردستانی عێراقەوە ڕۆدەنرێ. پاش کەڵکوەرگرتن لەتەواوی دایەلێکت و سەبدایەلێکتە کوردییەکانی کوردستان، ئەم زمانە پانوپۆڕترو ستاندەردتر دەکرێتەوە. بەشێوازێکی ئۆتۆماتیکیی بەهۆی ئەوەی سکریپتی ئەم زمانە ئارامییە، قورسایی کولتووریی و زمانەوانیی و سیاسییشی بۆسەر هەردوو کوردستانی ڕۆژهەلات و کوردستانی سوریا دەبێ. تێکهەڵکێشە زمانەوانیی و کولتوورییەکان گەشە دەکەن و هەموو دایەلێکتەکان بەگشتیی و هەردوو دایەلێکتی هەورامانیی و کرمانجیی ژووروو بەتایبەتیی، قورسایی خۆیان لە رووی کولتووریی و لێکسیۆگرافییەوە زیاتر تێیدا تۆکمەتر دەکەن.

ئەگەر بڕیارە وەک نەتەوەی کورد لە تێکستی یەکتر بگەین، ئەگەر بڕیارە زمان کۆکەرەوەی ئەو سیمبۆلیزمە نیشتمانیی و جڤاکییە بێت، دەبێت هەموو تاکێکی کورد بیر لە یەک ستایلی ستاندەردی زمان بکەنەوە. ئەگەر ئەمە نەکرێ، هەرگیزاو هەرگیز کورد بەیەکپارچەیی بە یەک نەتەوە نابێ. ئەو بۆچوونە باوە زۆر دووبارە دەکرێتەوە کە هەموو کەس حەزدەکات، نووسینەکانی چۆن لە هەولێر و بانە دەخوێنرێنەوە، بەهەمان شێوەش لە حەسەکە و ئامەدیش بخوێنرێنەوە. بەڵام ئایا بەربەستی سەرەکیی لێرەدا چییە؟

کورد بە کردەوە دوو سکریپتی ( ئارامیی- عەرەبیی و لاتینیی- تورکیی) هەیە. کردنی ئەم دوو سکریپتە بەیەک ستایل، زۆر سەخت و دژوارە. بەڵام ئەگەر ئیرادەی سیاسیی و کولتووریی و زمانەوانیی لە تاکی کورد و دەسەلاتی سیاسیی کورد و ئینستیتیوتە کوردییەکاندا هەبێ، دەکرێ لە پرۆسەیەکی دوورودرێژدا کاری بۆبکرێ. بۆ نموونە کوردەکانی کوردستانی باشوورو ڕۆژهەلات و کوردستانی سوریا، بە حوکمی ئەوەی سکریپتی ئارامیی- عەرەبیی بەکار دەهێنن، هاوکاتیش سکریپتی زمانی ئینگلیزیی کەم تازۆر بۆیان نامۆ نییە، دەکرێ بەپلانی زمانیی و ڕێبازیی زمانیی و پەروەردە، گەشە بەهەردوو ستایلی نووسینەکە بدەن. هاوکاتیش زمانناسەکان و ڕووناکبیرانی کوردستانی باکوور، دەبێ هەوڵی جدیی بدەن بۆ دوو کاتەگۆریی پێوەندار لە رەوشی زمانی کوردییدا.

١- هەوڵبدەن کەلک لەو زمانە ستاندەردەی کوردستانی باشوور وەربگرن و شانازیی پێوە بکەن و بەمولکی هەموو نەتەوەی کوردی بزانن. ئەوان دەتوانن ئەم زمانەی هەرێمی کوردستان بەشێوەیەکی ئەوەندە خێرا بە لێکسیکاڵی کرمانجیی ژووروو بەهێز بکەن، بەتایبەت لەمیدیاکانی خۆیاندا، لەماوەی چەند ساڵێکدا بەتەواویی بۆن و بەرامەی بەلای کرمانجیی ژووروودا بگۆڕێ. بەواتایەکی سادەتر، وشەو دەستەواژەو دەربڕینەکانی دایەلێکتەکەی ئەوان بەشی زۆری زمانی ستاندەردی کوردیی پێک بهێنێ.

٢- هاوکات، خۆیان فێری نووسین بە سکریپتی ئارامیی- عەرەبیی بکەن. لەبەر هیچ نا، لەبەر ئەوەی رۆحی تێکستی کوردیی، ئەدەب و کولتووری کوردیی بەم سکریپتە نووسراوە. ئەحمەدی خانیی و مەلای جزیریی و ....تاد بەم سکریپتە شاکارەکانیان نووسیوە. ناکرێ لەسیستمی تۆتالیتاریی دەوڵەتی تورکیادا، ئەم سکریپتە فێر ببن، بەڵام چینی رووناکبیر و خەڵکانی دایاسپۆرا بەئاسانیی دەتوانن ئەمە بکەن.

بە جێبەجێکردنی لای کەمی ئەو دوو خاڵە ، نزیکایەتییەکی زۆر دروست دەبێت لەنێوان ئەم دوو بەرەییەدا. راستە زۆری پێدەچێ بەڵام ئاسۆیەکی گەشە بۆئەوەی لەداهاتوودا، فۆرمی زمانێکی ستاندەردی سەرتاسەریی جێکەوت بکرێ. بەڵام بەهیچ جۆرێک ئەمە سەرناگرێ ئەگەر ئەلفبێی نووسینەکان یەکنەخرێن. بۆ چارەسەری ئەم ئاریشە گەورەیە، دەکرێ پێڕۆی ئەم خاڵانە بکرێ.

* حکومەتی هەرێمی کوردستان، زانکۆ و ئینستیتیوتە کوردییەکان، بەپلان و بەرنامە گەشە بە سکریپتی لاتینیی بدەن ، بەڵام زۆر گرنگە دوای ئەو نەزانیی و لاساییکردنەوەیەی زمانی تورکیی نەکەوین، واتە ئەو سکریپتە لاتینییە تورکییەی هەنووکە، بەدەردی زمانی کوردیی ناخوات. چەندین تیپی وەک ( ع، ح، ق، غ.....تاد) بۆ هەتاهەتایە لەکیس دەچن و دەفەوتێن. واتە ئەوەی پێی دەڵێن بیرازکردن، یان دەبێ بیرازبکرێ، یاخود سەرلەنوێ سکریپتی لاتینیی لەسەر شێوازی زمانی ئینگلیزیی دابڕێژرێتەوە.

* رووناکبیرانی کوردستانی باکووریش، بەتایبەت ئەوانەی تاراوگە، دەکرێ بەتەواویی خۆیان فێری سکریپتی ئارامیی بکەن و ئاشنایی بە تێکستی کوردیی پەیدا بکەن و لەم رێگەیەشەوە دەکرێ لەزمانی ستاندەردی هەرێمی کوردستان

نزیکتر ببنەوە. دووستاندەردیی لەسکریپتدا دەکرێ درێژە بکێشێ و هەر بشمێنێتەوە، بەڵام بەهۆی شارەزاییبوون و تێکەڵبوونی دایەلێکتەکانەوە، واتە بەهۆی جێکەوتکردنی یەک فۆرمی ستاندەردی نووسینەوە، دوو سکریپتیی ئەو زیانەی نییە کە هەنووکە دوو زمانیی و چەند زمانیی هەیەتی.

هەموو ئەوانەی سەرەوە ئیرادەی سیاسیی زۆر بەهێز و کاریزماییەکی وردی دەوێ. بەڵام ئەم نووسینە بەتەواویی بڕوای وایە، کە سکریپتی ئارامیی-عەرەبیی ئەگەر کەمێک کەموکوڕیی بۆ زمانی هەنووکەی کوردیی هەبێ ، ئەوە سکرپیتی چەوتوچێڵی تورکیی-لاتینیی ئەوەندە دەردەدارە، کە ڕۆحی زمانی کوردیی ( کرمانجیی ژووروو) تەواو جەڕاندووە و لەقاڵبی داوە. لەڕاستییدا گەڕانەوەی کوردستانی تورکیا بۆ سەر سکریپتی ئارامیی گەڕانەوەیەکی لۆژیکیی ترە، تا ئەوەی سێ پارچەی کوردستان دوای جەهل و نەزانیی ئەوانە بکەون، کە دوای لیبراڵیزمەکەی کەمال ئەتاتورک کەوتن و بەلاساییکردنەوەیەکی کۆلۆنیالیستییانە سکریپتی کوردییان لەو بەشەدا گۆڕی. لە هەموو بارودۆخێکدا، ستاندەردایزی زمانی کوردیی بە رووە یاسایی و دەستووریی و سیاسییەکەی لەکوردستانی باشووردا، دەستکەوتێکی نەتەوەیی، سیاسیی و کولتووریی مەزنە، دەبێ ببێتە جێگەی شانازیی هەموو تاکێکی کورد لەهەر کوێیەکی ئەم جیهانەدا بێت. ئەم پرۆسەی ستاندەردایزە، سەرەتایەکی باشە بۆ ئەوەی خزمەت بە ستاندەردایزی زمانی کوردیی لەئاستی گشت پارچەکانی دیدا بکرێ. لە یەک رستەدا، ستاندەردبوونی زمانی کوردیی لەکوردستانی باشووردا، ئەجێندایەکی بەرزی نیشتمانییەو لەهەرشتێکی دی پێویستترە.

References:

1. Anderson, B. 1983, *Imagined Communities: Reflections on the Origin and Spread of Nationalism*. London: Verso
2. Baubock, Rainer 2000 "Why Stay Together? A Pluralist Approach to Secession and Federation". In Will Kymlicka and Wayne Norman (eds.) *Citizenship in Diverse Societies*. Oxford: Oxford University Press, pp.366–394.
3. Boas Franz 1982, Race, language and Culture, University of Chicago press, USA.
4. CALWT, L.J. 1974. Lmguistique et colonialisme: Petit traite de glottophagie ( translation)
5. FERGUSON, C.A. 1959. Diglossia. Word 15:325-340
6. Fishman, Joshua, 1970. *Sociolinguistics: a brief introduction*. Rowley, Mass.: Newbury House.
7. Garvin, Paul L.; and Madeleine Mathiot. (1955), reprinted 1968. The urbanization of the Guarani language: a problem in language and culture. In Joshua A. Fishman (ed.), Readings in the sociology of language, 365-74. The Hague and Paris: Mouton
8. Gellner, Ernest. 1983. *Nations and Nationalism*. Ithaca: Cornell University Press
9. Haugen, Einar 1973 "Language Planning: Commentary". Session on Language Planning at the Eighth World Congress of Sociology, Toronto, 1974.
10. Haugen, Einar; J.D. McClure; and D. Thomson، 1981. *Minority languages today* , eds. Edinburgh: Edinburgh University Press
11. Hutton, Christopher M. 1998. *Linguistics and the Third Reich: Mother-tongue fascism, race and the science of language*. London: Routledge

12. Kolstø Pål 1998, 'Anticipating Demographic Superiority. Kazak Thinking On Integration And Nation Building,' *Europe-Asia Studies*, vol. 50, pp. 51-68.
13. Kosiv Mykola,1994 'Bez movy, nemae narodu, bez narodu, nemae derzhavy', *Holos Ukrainy*, 16 September ( translation)
14. Mill, John Stuart 1972 , *Utilitarianism, Liberty, Representative Government,* edited by H. B. Acton. London: J.M. Dent.
15. Rawls, John 1971, *A Theory of Justice*. London: Oxford University Pres
16. Reaume, Denise G. 2000 "Official-Language Rights: Intrinsic Value and the Protection of Difference". In Will Kymlicka and Wayne Norman (eds.) *Citizenship in Diverse Societies*. Oxford: Oxford University Press, pp.245–27
17. Turville-Petre, Thorlac 1996, England the Nation: Language, Literature, and National Identity, Oxford, Clarendon Press
18. Wardhaugh, Ronald 2002, *An Introduction to Sociolinguistics*. Fourth Edition. Oxford: Blackwell.

١٩- حەسەن، حەمە فەریق ٢٠٠٨، گۆڤاری نێوەند، ژمارە ٥٣

٢٠- سابیر، رەفیق ٢٠٠٨ ، رەخنەی چاودێر( پاشکۆ)، ژمارە ١٢٧ ، سلێمانی

(٦)

## (( فاشیزمی نیۆ-عەشیرەتچییەتیی
## بۆ کوێ کورد دەڕەتێنێ؟ ))

بابەتی زمانی کوردیی و ستاندەردکردنی ئەم زمانە لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، زۆرکەس یان لەسەریان نووسی، یاخود بەجۆرێک لەجۆرەکان بۆچوونیان ئاشکرا کردووە. بەشێک لەوانەی کە لەگەڵ ئەو بابەتەدا ناکۆک بوون هەر بەوە نەوەستان کە راستەوخۆ لایەنگرانی ستاندەردکردنی زمانی کوردیی و نووسەری ئەم نووسینە بە "فاشیست"، "سەدامیی" و ئەو قسە فرێدراوانە تۆمەتبار بکەن، بەڵکوو هەوڵیاندا فایلی ساختەش بۆ واژۆکارانی ئەو داخوازینامەی ٥٣ کەسە دروست بکەن و بە" نەوشیروان"ییەکان بیانناسێنن. ئەو نیۆ-عەشیرەتچییانە، ئەو ئینتێلیکچوەلایزە مێنتاڵ خێڵەکییانە دەخوازن بە هێنانە گۆڕێی حیکایەتی نەوشێروان مستەفاوە، کە گوایە ئەو "دنە"ی هەموو ئەوانە دەدات کە خەمی ستاندەردبوونی زمانی کوردیی دەخۆن. لەمەشدا مەبەستیان ئەوەیە کە بە ورووژاندنی ئەو هەستە خێڵەکییەی کە هۆشی حیزبەکان و بەشێکی زۆر لە نەیارانی زمانی ستاندەرد ئاراستە دەکا، پیلانی گەلەکۆمەکێی عەشایەریی و حیزبیی و دەڤەرگەرایی بە دژی لایەنگرانی زمانی ستاندەرد خۆشبکەن.

ئەو نووسەرە کۆنە (چەپ و شیوعیی، توودە و چریکی ئێرانیی، کۆمەڵەی هەردوو دیو) و نیۆ-عەشیرەتچییانە چونکە لە ئارگیۆمێنت و گفتوگۆیەکی کراوەدا بێن تەنگن، بۆیە دەیانەوێ بە قسەگەلی وەک مافی مرۆڤ و زاراوەکان و فرە زمانییەوە، سامێکی دەروونیی بۆ لایەنگرانی زمانی ستاندەرد نیشانبدەن. دیارە نووسین بەهەرشێوەیەک بێت، لەباری مۆراڵیی و مرۆییەوە، پێویستە رێز لە نووسەرەکەی بگیردرێ، لەبەر هیچ نا، لەبەرئەوەی ئازادیی سنوورێکی نییە و کەسیش ناتوانێ رێ لەکەس بگرێ. بەڵام لەنێو لێکدانەوەکاندا لەسەر ئازادیی، جۆرەها بیرکردنەوەی جیاواز دروست دەبێ. لێرەدا ئەوە بڵێم جوانترین شتێک لەئازادییدا ئەوەیە، بەقەڵەم وەڵام بدەیتەوە، بەڵام بوختان و بەلارێدابردن و چەواشەکاریی بەدواوە نەبێ.

بابەتێکی هەستیارو زۆر قووڵی وەک "زمان" و وردەکارییە کولتوورییەکانی، مرۆڤی وای هێنایە جۆش و خرۆشی نووسین، لەدوورو نزیکەوە پێوەندییەکی بەم باسەوە نەبووەو نییە. وەک ئازادیی، هەموو کەس مافی هەیە هەرچییەک بنووسێ و هەرچییەک بڵێ، بەڵام منیش وەک ئازادیی مافی خۆمە ئەو وردەکارییانە تەتەڵە بکەم، کە هەندێ پێنەدۆزی زمان و وەعزدەری کوردایەتیی و ئینتێلەجێنسیای عەشیرەتیی لێرەو لەوێ رایدەگەیەنن.

بەچاوێکی وردو بێلایەنانەوە، ئەگەر سەیری زۆرینەی رەهای رۆژنامەنووسیی و ئەدەبی کوردیی بکەین، بەتایبەتیی لەدوای راپەرینی جەماوەریی ساڵی ١٩٩١ هوە ، هەست دەکەین ئەوانەی بوونە بەنووسەر و رۆژنامەنووس و وتارنووس و ....تاد ، لە باکگراوندی ئەو سیاسییانەی ناو حیزبە جۆراوجۆرەکانی کوردستانەوە هاتوون. واتە لەسیاسەتدا کارێکی ئەوتۆی پێنەکراوەو بە رێکەوت کاری نووسەری بەدەستهێناوە. لە سیاسەتدا فاشیل بووە و رووی لە تێکست نووسین کردووە. کەواتە زۆرینەی ئەمانە کە هەنووکە بوونە بە رۆژنامەنووس و وتارنووسی زۆر پرۆفیشناڵ، فاشیلی سیاسیین. بەشێکی دی لەوانەی لەسەر زمان وەگاڵە هاتوون لەو کوردانەی پارچەکانی تر، کۆنە چەپ و هەلپەرستی تازەن، دەیانەوێ لە پاڵ حیزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستانی باشووردا بە هەمان ئایدیۆلۆژیی چەپی وابەستەی ئێران و تورکیا و سوریاوە، بەڵام بە بەرگی کوردایەتییەکی

خێڵەکییەوە بەدروشمی سەر لافیتەو مافی مرۆڤەوە، خۆیان بە دەمڕاستی زمانی کوردیی و خەمخۆریی زاراوەکان بناسێنن.

ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە، ئێمەی کورد ، دەبێ لەهەموو بوارێکدا بنووسین. کابرا زمانی ئاخافتنی ڕەوانە، ئیدی پێیوایە زمانناسێکی زۆر بلیمەت و شارەزایە، زاراوەی شارەکەی خۆیشی لەهەموو ئاقارێکدا پێ ماستەرزمانە. کابرا کۆمۆنیستی دێرینە، توودەی ئێرانە، کۆمەڵەی دێرینە، ئاشی دێرینە، لایەنگری کۆنی حشع بووە، هەنووکە هاتووە ماستەرپلانی زمانناسیی دادەڕێژێ. من تێناگەم دۆکترینی کۆمۆنیزم، دۆکترینێکی زۆر تۆتالیتارییانەیە، بۆ پاراستنی دەسەلاتی سیاسیی بڕوای بەدیکتاتۆریی چینی کرێکار هەیە. کەچیی هەندێ لەلایەنگرانی ئەم دۆکترینە، بەناوی پاراستنی دایەلێکتە کوردییەکانەوە هاتوونە دژایەتی ئەو بۆچوونە دەکەن کە پێیانوایە، لە کوردستانی عێراقدا ، زمانی ( ستاندەردی نووسین ) ساغبکرێتەوە.

هەندێ لە کۆمۆنیستە خوێنگەرمە نوێخوازەکان، ڕەنگە بڵێن، ئەو دیکتاتۆریی و زەبروزەنگە، دۆکترینی ستالینزمەو هیچ پێوەندییەکی بەمارکسیزم و کۆمۆنیزمەوە نییە. بەهەموو جۆرێکیش لەو هەموو مەرگەساتەی بەسەر گەلانی سۆڤێتی کۆن و نەتەوەکانی تردا هات، لینینی لێ دەردەکەن. دیارە ئیسلامییە میانڕەوەکانیش، یاخود ئەو ئیسلامییانەی چوارمشقیی دانیشتوون، هەمیشە دەڵێن، ئەلقاعیدە، ئیخوانلموسلمین، جەماعەی ئیسلامیی، حەماس، ویلایەتی فەقیهی ئێران، شێخەکانی خەلیج، تاڵیبان و جوندوئیسسلامەکەی کورد لە چوارچێوەی دەق وباسەکانی قورئان و ئیسلام دەرچوونە. بەلام یەک دیفاکتۆیەکی زۆر بەرچاو هەیە، دۆکترینی کۆمۆنیستیی و دۆکترینی ئیسلامی سیاسیی بەشێوەیەکی گشتیی دۆکترینێکی شمولییە و هەرچیی ئازادیی بێت تێیاندا نییە. کەچیی هەندێ لەو کۆنە کۆمۆنیستانە هاتوونە بۆونە بە زمانزان و زمانناسی کورد، بۆ زاراوە کوردییەکان لەخۆیان دەدەن و خۆیان دەڕننەوە. بەهەمەحاڵ، ئایا ئەمانە ( قودرەتی قادر) بۆ گەلی کورد ( نازڵ) ی کردوون. کۆنە شیوعیی و کۆمۆنیستی دێرین و چەپی کلاسیکیی و لاکەوتەی ڕۆژگار ، ڕاست دەبنەوەو لەپڕێکدا خۆیان بەزمانناس دەناسێنن!

لەنێو ئەو بوختانانەی دەرهەق بەمن کراوە، لەمەڕ پێداگریی لەزمانی ستاندەردی کوردیی، گوایە من بە خەڵکی بادینانم گوتووە " گاڕان"

،"گایەل"،"میگەل" و .....تاد. لەڕاستیدا، ئەمانە جگە لە چەواشەکاریی و بەلاڕیدابردنی ئارگیومێنتەکان، هیچ مەبەستێکی زمانەوانیی لەپشتەوە نییە. هەرگیز ڕێگە بەخۆم نادەم بێمە ئەو ئاستە نزمە بەهاوڵاتییەک، بەهاونەتەوەکەی خۆم ، بەهیچ مرۆڤێ ئەو قسانە بڵێم. لەکاتێکدا ڕووی نووسینەکانی من لەو مێنتاڵیتییە خێڵەکییەیە کە دەیەوێ گەلی کورد بەسەر تیرەو هۆزو ناوچەکاندا دابەش بکات. بەڵام ئەوانەی ئەو بوختانانە دەچنن، دەیانەوێ بە وورووژاندنی هەستی خێڵەکیی، سیاسەتی نیو-عەشیرەتچییەکەیان برەو پێبدەن.

من گوتوومە و دەیشیڵێمەوە، ئەو مێنتاڵیتییە حیزبیی و ئایدۆلۆژییەی کە ئارگیومێنتەکان چەواشە دەکەن و تۆوی دووبەرەکیی و ئاژاوە دەچێنن و بەمەبەستی سیاسیی ڕووت و قووت ، بەبەرنامەوە چەواشەکارییەکان دەکەن، ئەوانە مێنتاڵی " گایەل" و "گاران" یان هەیە، خاوەنی خۆیان نین و بەمەبەستی سیاسییەوە دەیکەن. ئەوانە نەدانی ئەدەبی کوردیین و خۆیشیان بە زماننناس و زمانزانی پرۆفێشناڵ دەناسێنن. بەڕاستیی زۆر داوەشێنە، مرۆڤ کاتێ نەتوانێ دژایەتی بۆچوونێک، ئایدیایەک، ئارگیومێنتێک بکات، پەنا بەرێ بۆ ئەو جۆرە بوختان و بەلاڕێدابردنانە. چونکە دەزانێ هیچ جۆرە داتایەکی زمانناسیی پێ نییە، تا خوێنەر بە بۆچوونەکانی قایل بکات. بۆیە هەوڵدەدا، پەنا بەرێت بۆ سووککردن و لێکەمکردنەوەی هەستیارترین پرس لەهەنووکەی کوردستانی عێراقدا ، کە پرسی زمانی کوردیی و ساغکردنەوەو ستاندەردکردنییەتی.

ئەو هەموو بوختان و جوێنە جوانانە بە زۆربەی ئەوانە درا، کە داکۆکیی لە ساغکردنەوەی زمانی کوردیی لەهەرێمی کوردستاندا دەکەن، بە " بەعسیی، شۆڤێنیستی تورک، سەدامیی، کەمالیست و .......تاد " ناسێنران، کەسێک نەبوو بڵێ ئەوانە سووکایەتییە! بەڵام بە من و چەندین کەسی دی، دەیان ناو و ناتۆرەی ناشیرین، بەچەندین ناوی نهێنیی و ئاشکراوە گوترا. هەرچیی بەمنەوە پێوەندە، لای خۆمەوە گەردنیان ئازاد بێ، بەڵام ئەوە ئیفلاسییە کاتێ هیچ ئارگیومێنتیکت بۆ دژایەتی زمانی ستاندەرد پێ نەمێنێ ، زیاتر هانی ئەو بەرەلایی و هەرکەس بۆخۆیەی دایەلێکتە کوردییەکان بدەی. بەڕاستیی "مەسخەرەیە"، شۆڤێنزمی ( ناوچەیی، عەشیرەتیی، لەهجەیی ......تاد ) قوڵپ دەدات، گەورەترین هەرەشەیان بۆسەر یەکدەستی نەتەوەی کورد دروستکردووە، کەچیی سەلاح ئەحمەد کە ڕیزبەندی ژمارە ٢٨ ی هەبوو

لەلیستی ناوەکانی کەمپەینی ستانده‌ردایزی زمانی کوردییدا، بە وتاریکی پڕ لەدروشمی سیاسیی و لافیتە نووسینەوە، لە "هاولاتی" ژمارە ٤٤٣ دا لە هەڵویستی پیشووتری خۆی پەشیمان دەبیتەوە، ریزو کەرامەتی قەڵەمەکەی خۆیشی ناگری، دەکەویتە سەرکوتانەوەی " فاشیزمی سۆرانیی"!!، بەلام بەرامبەر بە بە فاشیزمی ( لەهجەیی و دەڤەرچییەتیی )، بەرامبەر بە شۆڤینیزمی عەشیرەتچییەتی و مینتالیتی ئینتیلەجینسیا عەشایەرەکانی کورد، قرتەی لیوە نایات.

راستییەکەی، خەتای من بوو ئەو کاک سەلاحەم هینایە ناو باسەکەوە، چونکە لەبنەرەتدا بەهەڵەو بەریکەوت کەوتە ناو باسەکەوە. ئەو کە خۆی بەسیایی و بەکۆمۆنیست و چەپ دەزانی، نزیکایەتییەکی لەگەڵ پرسی کولتووریی و زمانەوانییدا نییە. وەک هەرسیاسیی و ئایدیۆلۆژیستیکی تریش ئازادە لەسەر پرسە سیاسییەکان رۆژانە رای خۆی بگۆڕی. بەلام سەیرە، مرۆڤیک لەسەروو ١٨ ساڵەوە بیت، نووسراویک بخوینیتەوە، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە رەزامەندی دەرببڕی، یەک دیڕ چییە لە نووسراوەکە نەگۆڕدری، چوار مانگ لەدوای ئەو باسانەوە، ١٨٠ پلە بادەداتەوە. باشە ئەی ریزی قەڵەم و خوینەر، ئەی ئەو کریدتەی کە خوینەر دەیدا بەنووسەر چیی بەسەرد دی؟ وەک عەلی سەعید بۆی چووە، راستییەکەی کاک سەلاح، جگە لەکۆپییکردنەوەی وتە و دەربڕینی لایەنگرانی جووتساندەردیی، یەک دانە دەربڕینیش چییە هیی خۆی نییە. تەنانەت دەتوانم بڵیم، هەر دەڵیی بۆیان نووسیوەو ناوی خۆی لیداوە. خۆشییەکەی لەوەدایە، بەناوی ئینتیلەجینسیای کوردەوە، خەریکە خاپەرۆی مینتاڵیتیی عەشیرەتە کوردییەکانی ٢٠٠-٣٠٠ ساڵ لەمەوبەر بەسەرماندا ساغدەکاتەوە.

ئەگەر هەر رای خۆیشم دەگۆڕم، ئیتر پیویستم بەو هەموو سەفسەتە سیاسییە چییە، بۆچوونی خەڵکانی تر بە تیڕوانینی خۆم بەخوینەر بگەیەنم. ئاخر بۆ دەبی چاوم کویر بی، کەڕولاڵ بم، لەئاست شۆڤینیزمی ناوچەیی و لەهجەییدا کە نیازیانە کورد بکەن بە دوو نەتەوەی جیاواز، کەچیی بیم بەخەڵکیی بڵیم " فاشیزمی سۆرانی راوەستە". ئەوە چ رۆشنبیرییەکە، جیاوازی مافی زمان و مافی دایەلیکت لەیەکدی جودا نەکەمەوە. ئەو فەلسەفە سەقەت و بازاڕیی و عەشیرەتییەم لەگیرفانی کیدا دۆزیتەوە، کە لەهەریمی کوردستاندا،

٥-٦ ملیـۆن کـوردی تێـدا دەژی، بــە ( هــەورامیــی، ســۆرانیی، بادینــانیی، لوڕیی....نازانم چیی و چیتر) بخوێنن. بەهەمەحاڵ لە دۆخێکی وادا لەسواربوون و دابەزیندا، تەنها سەلماندم کامڵ نیم و خاوەنی رای خۆم نیم، کە پەشیمانیشم دەکەنەوە و وەک سیاسییەکـان "تـەسلیم" دەبمـەوە ، دەکـەومـە سـەفسـەتـەی سیاسیی و ئەفسانە تاشین بەدیدی کۆمۆنیستێکی رادیکاڵ ومیلیتانتێکی چەپی حەفتاکانی سەدەی رابردووەوە.

ئــەو مێنتاڵیتییــەی بــەنــاوی ئــەکادیمیــستبوون و نووســەربــوون و تێکۆشەربوونەوە، داکۆکیی لە رەشبەڵەکی زاراوە کوردییەکان دەکات و پێیوایە کە زاراوە کوردییـەکـان بـەیـەکـەوە جـوانن و کۆلکـەزێڕینـەی زمـانی کـوردیین، یاخود ئەوانەی لەگەڵ زمـانی ستاندەرددان، بـەلام دەڵێن نـابێ هـیچ زاراوەیـەک وەک بناغـە دابنـرێ، مێنتاڵیتیـەکی ئاژەوەچیی، بەلاڕێدابـەر و سـەرلێشێوێنە. مێنتاڵیتییەکە بەناوی زلزلی مۆدێرنیزمـەوە، هـەمـان مێنتـاڵیتی شێخ و دەرەبـەگە کوردییەکانیان هەیە کە سەدان ساڵ لەمەوبـەر ژیاون. ئەوانیش جەبـەرووت و شانازیی قەڵەمڕەوییەکەی خۆیان بۆ هـیچ میرنشین و دەرەبـەگ و شـێخێکی تر لار نەکردووەتەوە، بەلام هەموویشیان بۆ ئاغا سەفـەویی ( لـەفارس و عـەرەب) و ئەربابە عوسمانییەکان ( لەتورک و عەرەب) ملیان لە موو باریکتر بووە.

هەنووکە هەمان مێنتاڵیتیی سەدان ساڵ لەمەبەری عەشیرەتچییەتیی، هـەندێ کــەس لــەژێــر پــەرچــەمــی کۆمۆنیــستبوون، لیبراڵیــزم ، پانکوردیــستیی و کوردایەتییەکی بێبەرنامەدا ، لەژێر ناوی سکۆلاربوون و خوێندکاری ماستـەر و پینەدۆزی زماندا، بە ناوی پاراستن و دەستپێوەگرتنی زاراوەکانـەوە' بـەگـەلێکی بێ ئایدێنتیتیی وەک کورد دەفرۆشنەوە. بیانووی ئـەوە دەهێننـەوە، تـا هـەنووکـە کورد زمانی ستاندەردی نەبووە و هـەر ماویشـەو نـەفـەوتـاوە! پـرۆژەی زمـان و نەتەوە هیی سەدەی رابردووە! کوردستان و کانەداو سویسرا بەیـەک دەچوێنن. بەلام ئەوە لێک نادەنەوە، دنیا گۆڕاوە، لە هەموو بوارێکدا، سـەردەم سـەردەمـی لێکتێگەیشتن و ستاندەردبوونە. کورد بـەمشێوەیـەی ئێستا بچێتـە پێشەوە. هـیچ گومانێکم نییە ئەدەبی کوردیی دەبێت بەچەندین ئەدەبەوەو لـە دوور مـەوداشـدا، قەوارەی کولتووریی کورد ئاڵوگۆڕی ریشـەیی بـەسـەردا دێت، لـەدۆخێکی وادا، لای کـەم نـەتـەوەی کورد بـەسـەر [ هـەورامیی، کرمـانجیی، زازایی، کرمـانجیی

ناوەڕاست ( وەک کاکڵەی کورد دەمێنێتەوە) ] و چەندین تیرە و هۆزی تردا دابەش دەبێ.

ئەم وتارە بەتەواویی بڕوای بەوەیە، کە ئەگەر نەتەوەیەک یەک سکریپتی نووسینی ( ئەلفبێی) نەبێ، زۆر ئەستەمە زمانی نووسینی، زمانێکی ستاندەردی یەکپارچە بێ. بەتەواویش بڕوای وایە، سکریپتی تورکیی-لاتینیی سکریپتێکی چەوت و سەقەتە و بەنەزانیی و تاکڕۆیی و چاولێکەریی کەمالیزم بەسەرکورددا سەپێنراوە. سەپاندنەکەش کولتووری نەتەوەی باڵادەست ( تورک ) سەپاندوویەتی، ئەگینا خۆ وەک زۆر نووسەر و زمانناسی کورد پێشتر ئاماژەیان پێکردووە، لە سەرجەم کوردستانی تورکیادا، بیست کەس نییە لە زمانی شیعرەکانی ئەحمەدی خانیی و جەزیریی ....تاد تێبگەن. لەو ١٠-١٥ میلیۆن کوردە ، ١٥ کەس لەسکریپتی کوردیی ئارامیی تێنەگات، چاوەڕێی چیی بکەین. چۆن بە خاوەنی زمانێکی ستاندەردی یەکگرتوو لەئاستی کوردستانی گەورەدا ببین.

بەکورتیی و بەپوختیی، زمانی ستاندەردی کوردیی، دەبێ لەکوردستانی عێراقەوە هێجەمۆنی خۆی ساغبکاتەوە. بەشەکانی تری کوردستان، دەتوانن سوودێکی باش لە زمانی ستاندەردی هەرێمی کوردستان وەربگرن، وشەو چەمکە ئەدەبییەکانی خۆیان دەتوانن بەسەر ئەم زمانە ستاندەردەدا جێگیر بکەن. ئەو بیرکردنەوانەی پێیانوایە، جووتستاندەرد و سێ ستاندەرد و چوار ستاندەرد.....تاد بۆ زمانی کوردیی پێویستە، هەمان ئاغا و دەرەبەگ و شێخەکانی زوون، لە زەمانێکی دیدا دەژین. بۆیە ئەوەندەی بۆم بکرێ، لەمەودوا هەوڵدەدەم بەقەڵەم و توێژینەوە ، نەک بەبوختان و موهاتەرات ، نەک بە قسەی بازاریی، شیعاری سیاسیی و لافیتەی سیاسییەوە ستاندەردبوونی زمانی کوردیی لەکوردستانی عێراقدا شرۆڤە بکەم، زۆر گرنگە بۆ بنیاتنانی نەتەوەیەک، لە قەڵەمی یەکتر بگەین، لە نووسینی یەکتر بگەین، ئەمەش تەنها بەستاندەربوونی زمانەکەمانەوە بەستراوە.

چ میر جەلادەتی بەدرخان و چ تۆفیق وەهبی بەگ، جەختیان لەسەر یەکگرتوویی یەک سکریپتیی بۆ نەتەوەی کورد کردووەتەوە. بەبڕوای من سکریپتە لاتینییەکەی تۆفیق وەهبیی زۆر وردتر بووە. سکریپتە پێشنیارکراوەکەی وەهبیی، نزیکایەتیی لەگەڵ تیپە ئینگلیزییەکاندا هەبوو، بەڵام

ئەوەی بەدرخان، دەقاودەق هەمان سکریپتی کەمالیستەکانە، بە بۆن و بەرامەیەکی فرانسییەوە. ئەو دوو کەسایەتییە، هەردووکیان بەئاشکرا و بەنووسین بۆچوونیان ئەوە بووە کە نەتەوەی کورد لەرێی زمانێکی یەکگرتووەوە دەخەملێ و زمانی یەکگرتووش لەرێی سکریپتێکی یەکگرتووەوە بەرهەم دێت.

رۆژگار هات و چوو، بۆچوونەکان و هەڵوێستە تاکرۆییەکانی بەدرخان، گەورەترین زیانی سیاسیی لە بونیادی نەتەوەی کورد دا. ئەگەر پێویستی کرد رۆژێ لەرۆژان کوردی کوردستانی عێراق و ئێران سوریا سکریپتی نووسینەکانیان لەئارامییەوە بۆ رۆمانیی بگۆرن، لەهەموو کات پێویستترە بە جدیی بیر لەو سکریپتە بکرێتەوە کە توفیق وەهبی پێشنیاری کردبوو. سکریپتێک کە تیپە کوردییەکان لەگەڵ شێوازی زمانی ئینگلیزییدا زیاتر دەگونجێن. بەتایبەت کە زمانی ئینگلیزیی بووەتە ماستەرزمان لەهەموو بوارێکدا. لەراستییدا ئەم کارە ( گۆرینی سکریپتی ئارامیی بۆ رۆمانیی ) ئەگەر بشکرێ، بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو هەڵە سیاسیی، مێژوویی، زمانەوانیی و کولتوورییە دەگەرێتەوە کە بەدرخان کردیە جەستەی زمانی کوردییەوە. ئەگینا زمانی کوردیی بەم سکریپتە ئارامییەی هەنووکەوە کێماسییەکی زۆر کەمی هەیە و چاککردنیشیان نەکردە نییە. بەپێچەوانەوە ئەگەر سنوورێکی زمانەوانیی و زانستیی بۆ ئەم سەرکێشیی لەهجەییە دانەنرێ، سەری نەتەوەی کورد دەخوات. کەللەسەری ئەم گەلی کوردە بەشێوەیەک دەپژێ، هەر پارچەی لەشوێنێک دەگیرسێتەوە.

بەم پێودانگانە بێت، پرۆ دووستاندەردەکانی زمانی کوردیی، گەورەترین ماڵوێرانیی بەسەر داهاتووی سیاسیی کورددا دەهێنن. هەموو ئەوانەی پێشتر کەسانی تر گوتویانە لەسەر زمانی ستاندەردی کوردیی و منیش بەپێی توانای خۆم پاڵێکم بە ئارگیومێنتەکانیانەوە ناوە، جەخت لە گرنگیی ئەم ستاندەربوونە دەکەنەوە. بەلام پێ لەئاسمان نا، بەڵکو لەسەر زەویی، لەسەر هەلومەرجێکی سیاسیی و جیۆگرافیی تەواو دیفاکتۆ( هەرێمی کوردستان) کە لەهەموو شتێ گرنگترە زمانێکی فەرمیی و ستاندەردو یەکگرتووی هەبێ.

چەق و قورسایی ئارگیومێنتەکان زۆر ئاشکران، ئایا کورد نەتەوەیە، یان خێڵێکی گەورەیە و کۆمەڵێ سەرهۆزی درندەو لەهجەچیی، کۆمەڵێ

ئینتێلەجێنسیای عەشایەر سەرکردایەتی هۆزەکانی ناو ئەم خێڵە گەورەیە دەکەن؟ ئایا لەپێناوی ئارمانجە دوورو بڵندەکاندا، لەپێناوی دروستکردنی نەتەوەیەکدا، تا چەند پێویستییمان بەزمانێکی ستاندەرد و یەکگرتوو هەیە؟ ئایا لەکوێوە دەست پێبکەین و کۆددانانی ئەم زمانەو پلانی زمانییمان بۆ زمانی ستاندەرد چیین؟ ئەم پرسیارانەو دەیانی تر، یەخەیان بە نیۆعەشیرەتچییەتیی Neo-Tribalism ، نیۆلیبرالیزمی کوردایەتیی و مێنتاڵیتیی پانکوردیزم و پانکۆمۆنیستیی دەگیردرێ. لەڕاستییشدا ئەم شەڕە( شەڕی ستاندەردکرنی زمانی کوردیی ) ، شەڕێکی مەودا فراوانە، دەیان لقوپۆپی لێدەبێتەوە، بەڵام مێنتاڵیتیی خێڵ و نیۆعەشیرەتچییەتیی، بەرژەوەندیی سیاسیی و ئایدیۆلۆژیی مەترسییترین ئەو بەرەنگارییانەن کە دێنە پێشەوە.

دواجار، بەس بەناوی خۆمەوە دەئاخفم، داوای لێبووردن لەهەر کەسێک دەکەم، کە لەڕێی ئایدیۆلۆژیست و پیاوەکانی حیزبی کوردییەوە وا تێگەیەنراون، کە سووکایەتییم بە زاراوەیەکی کوردیی و ئاخێوەرانی کردبێ. ئەو زمانەم دەبرم کە ئەگەر بەهەڵەش دەربڕینێکی وام لەدەم بێتە دەر. بەڵام زۆر بە بینێکی درێژەوە، دژایەتی ئەو مێنتاڵە عەشیرەتییە دەکەم، کە خۆیان بەسکۆلارو ئەکادیمیست و نووسەر و پێنەدۆزی زمانی کوردیی دەزانن. دژایەتییان بە ئارگیومێنت دەکەم، نەک لەباری مرۆیی و مۆراڵییەوە سووکایەتییان پێ بکەم ، ناچم فایلی ساختەیان بۆ دروست بکەم ، ناچم بوختانیان بۆ چێبکەم، دەچم قەڵەم لەمێنتاڵیتیی " مێگەل" ئاسایان هەڵدەدەم. پێیان دەسەلمێنم کە ئێوەی ئینتێلەجێنسیای عەشیرەتیی، نەدانن و چەمکی زمان و نەتەوە زۆر لەوە قووڵترە، کە ئێوە بە وەعزی کوردایەتیی و ئیفلاسی سیاسیی دێرینتانەوە، پێنەدۆزیی زمان بکەن و گرنگیی زمانی ستاندەردی کوردیی پەی پێ بەرن. پێیان دەسەلمێنم کە ئەوان گەلی کورد بۆ سەردەمی عەشیرەتە خۆخۆرەکان و میرە ناکۆکەکانی کورد دەڕەتێننەوە.

( ٧ )

## (( دایەلێکتە ناوچەییەکانە شێوەجەی زمانی ستاندەردی کوردییە ))

ئەم وتوویژە لەگەڵ ژۆرنالی کوردناسیی دا ئەنجام دراوە. لە یەکەمین ژمارەی ئەو ژۆرناڵە بەهەردوو زمانی فارسیی و کوردیی لەکۆتایی ۲۰۰۸ دا بڵاوبووەوە. ئەم ژۆرناڵە لە ئێدیتەی ( ئێدیتور Editor) شەهرامی حاتەمیی بوو، بەقەبارەی نزیکەی ۸۰۰ لاپەڕە دەرچوو. تا هەنووکە بەچاپ نەگەیشتووە، بەڵام وەک دۆکیومێنتێکی زمانەوانیی، لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بوونی پارێزراوە.

کوردناسی: لەسەر زمانی کوردیی، کۆمەڵێ بۆچوونی جیاواز هەیە، تەنانەت پێناسەیەکی ئەکادیمیی و ورد بۆ زمان لە ئەدەبی کوردییدا کەمتر دەبینرێ. ئایا خوێندنەوەی ئێوە بۆ زمان چییە؟

کامیار سابیر: سەرەتا با لەوێوە دەست پێبکەم، من حەز بە بواری زمان زیاتر دەکەم، ئەویش لە بواری ئەنسرۆپۆلۆجیای زماندا وەک لقوپۆپێکی زانستی زمان ، نەک لەو دیدە ئەبستراکت و ڕووتوقووتەی زۆر کەس زمان لەچەند چەمکێکی لۆکاڵییدا قەتیس دەکەن، ڕاستە لەهەردوو بوارەکەدا( زمان و وەرگێڕان ) بەپێی توانای خۆم کارمکردووە و بەردەوامیشم، بەڵام زیاتر حەزم بە بواری زمانە، ئەویش ، نەک وەک ئەو خاڵییکردنەوەیەی زمان لە هەموو داتا کولتووریی و سیاسییەکانی، کە هەندێ کەس دەستیان داوەتێ، ئەم وشەیە وا نانووسرێ ،ئەو دەربڕینە نادروستەو ئەو کۆمایە لەوێ نابێ ، ئەم خاڵە لەوێ دەبێ و ئەم بکەرو فرمانە دەبێ پاشوپێش بخرێن ..............تاد. ئەوانەی لەم بوارەدا کاردەکەن، گەڕ بەزمانی کوردیی و زمانەوانیی دەکەن.

رووانینی من بۆ زمان لە بەهای زمان وەک ئایدێنتیتیی ، رەگەزێکی کولتووریی و رەنگدانەوەی هزرو ئەندێشەی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێ، نەک لایەنی ڕێزمانیی بەتەنها ، نەک وشکەکەڵەکی ئەو گاڕانە لەو زمانزانانەی خەریکی ڕاستکردنەوەو چەوتکردنەوەی ئەم دەربڕین و ئەو پارەگرافی فلان و فیسار نووسەرن.

## گرنگایی زمان چییە؟

کامیار سابیر: لە رووالەتدا پرسیارێکی ئاسانە، بەلام هیچ تیرمێک لەم دنیایەدا ئەوەندەی زمان مشتومڕی لێنەکەوتووەتەوە. زۆربەی فیلۆسیفەرەکانی (فەیلەسووفەکانی) بواری تیۆریی و کولتووریی، کەم و زۆر لەسەر زمان راماون و راڤەی جۆراوجۆریان لەسەر کردووە. بەسەدان هەزار کتێب لەسەر زمان نووسراوە، بە ملیۆن وتاری ژۆرنالّ و شیکاریی لەسەر زمان و وردەکاریی و لقوپۆپەکانی نووسراوە. ئێمەی کورد تازە بەتازە گفوگالّ لە سەر زانستی زمان دەکەین. بەکورتییەکەی کورد کەمترین تێکستی لەسەر زانستی زمان هەیە و زۆربەی ئەوانەی خۆیان بە زمانناس و زمانەوان دەزانن لە وتاری ١-٢ لاپەڕەیی زیاتر شتێکی تریان نییە. بەلام بەو واتایەش نا، کە هەر هیچمان نەبێ. بەبڕوای من گرنگیی زمان لە رووی فەلسەفیی و کولتوورییەوە زۆر بایەخدارە ئەگەر شرۆڤە بکرێ. لە بواری کولتوورییشدا، بەشی ئایدێنتیتیی( ناسنامە) لەزماندا، یاخود زمان وەک ئایدێنتیتی و بەشێک لەئایدێنتیتیی نیشتمانیی زۆر گرنگە سەیر بکرێ و شیکردنەوەی لەسەر ئەنجام بدرێ .

لای من پێناسەی زمان، ئەو پێناسە گشتییە ئەبستراکتە نییە کە وەک سیستەمێکی پێوەندیی تاک و کۆمیونیتییەکان بەکار دەهێنرێ، بەڵکو زمان بوونی منە، وەک کورد بوونی ئایدێنتیتییەکەمە ، دیارە بۆ هەموو مرۆڤەکانی دنیا وانییە. بەلام زمان بۆ کورد، وەک کاریکتەرێکی ئایدێنتیتیی، سیستەمی نووسین و کاریکتەرێکی سیمبۆلیی گرنگیی زیاتری هەیە، چونکە ئێمە هێشتا خۆمان لەرووی سیاسییەوە زمانی ستاندەردمان نەپەژراندووە. گرنگترین دەربڕین لای من تایتڵی ئەو کتێبەی John Honey یە کە دەڵێ " زمان هێزە" ، یان ئەو

نووسینەی بێرنارد شۆو Bernard Show کە دەڵێ ' ئینگلاند و ئەمیریکا دوو وڵاتن، زمانێکی هاوبەش جودای کردوونەتەوە'. هەروەها ئەوەی Spolsky کە دەڵێ' زمان سێنترالی ئەدگاری ئایدێنتیتیی مرۆڤە' یاخود دەڵێ ' زمان سیمبۆلێکی بەهێزی نیشتمانیی و ئایدێنتیتیی ئێسنیکییە'.

زمان لەبواری خوێندندا زۆر گرنگە، سەدانی وەک Carolyn Temple Signithia ئەنسرۆپۆلۆجیست MARY BUCHOLTZ ، Adger Fordham و پرۆفیسەری بواری سوسیۆسیاسیی و سۆسیۆکولتووریی Kelleen Toohey، فیلۆسیفەر ( فەیلەسووف) و سۆسیۆلۆجیست و زمانناسی فرانسیی Pierre Bourdieu لەسەر گرنگیی زمان، ئایدێنتیتیی ، سیمبۆلیزمی زمان و رۆڵی خوێندن و پەروەردە توێژینەوەی زۆریان کردووە. وەک کورد تا لە گرنگیی بواری پەروەردەو بەهای ئایدێنتیتیی زمان و سیمبۆلیزمی نیشتمانیی و نەتەوەیی زمان تێنەگەین، ناتوانین تەنانەت پێناسەیەکی ئەکادیمییانەی زمانیش بکەین. بۆیە لەیەک رستەدا دەکرێ بگوترێ ، بەبێ زمان، کورد بوونێکی سیاسیی و کولتووریی نییە، بەبێ زمان، نە ئایدێنتیتیی ئێسنیکیی و نە ئایدێنتیتیی نیشتمانیی بەتەواویی هەیە.

کوردناسی: ماوەیەکە نووسین و چاوپێکەوتن و توێژینەوە و مێزگرد لەسەر زمان بەگشتیی و زمانی ستاندەردی کوردیی پەرەی سەندووە. هۆکاری ئەمانە چییەو بۆچیی لەرابردوودا کەمتر ئەمانە هەبووە.

کامیار سابیر: ئەم پرسیارە بۆ نەتەوەکانی تر کەمتر وایە، بەڵکو کاکڵەی ئەم پرسیارە زیاتر پێوەندیی بەدۆخی سیاسیی و کولتووریی کوردەوە هەیە. راستە بابەتی زمان لە سەدەی بیستەوە تا ئەمرۆ زۆر روانگەی تیۆریی و دیدی فەلسەفەیی و جۆاکیی ... لێ بەرهەمهاتووە. بەڵام لای کورد لەم ساڵانەی دواییدا قسەی رۆژنامەوانیی نەک توێژینەوەی تیۆریی، لەسەر دەکرێ . ئەوە کوردە لەزمانناسییدا لەدواوەیە، ئەوە کوردە عەقڵی بەوە نەشکاوە لە ئاستێکی گشتییدا کە دەنگێکی پڕ لەگوشار دروست بکات و دەستی دەسەڵاتی سیاسیی بگرێ و چاوساغیی بۆ بکات و قەڵەمێکی بداتێ و واژۆی ئەو هەزاران داوایە بکات کە خەڵکانی دڵسۆزی زمانی کوردیی، داوای ستاندەردبوونی زمانی کوردییان کردووە. خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە لەسەر زمانە جیهانییەکان هەر هەبووەو بەردەوامیشە. راستە چەند ئایکۆنێکی جیهانیی لەم چەند دەیەیەی دواییدا لەسەر

زانستی زمان، دەیان و سەدان توێژینەوەی بایەخداریان کردووەو لەئاستی زانکۆکانیشدا، رشتەی زمانەوانیی گەشەیکردووە. بەڵام لەئاستی کورددا، ئەوە ئێمەین لەدواوەین و شتەکان بە دووربینێکی ژەنگاویی و کۆن دەبینین.

بەڵاکە لەوەدایە، زۆر لە ئەوانەی بەخۆیان دەڵێن زماناس و زمانەوان، جارێ زۆربەیان لەکوردیی بترازێ، زمانێکی تر نازانن، یان لەباشترین دۆخدا، زمانی عەرەبیی و فارسیی دەزانن. بە واتایەکی بەرینتر، چوار کتێب و ژۆرناڵی زمانەوانییان بەزمانە رۆژئاواییەکان نەخوێندووەتەوە، یان تەنانەت وەرگێڕانەکانیشیان نەدیوە، لە دۆخێکی بەمشێوەیەدا، دادەبڕێیت و ئاوەکیی دەکەویت. وەک ئەو شاعیرە کوردەت لێدێت ، سەری لووتی خۆت رەش بکەیت و بکەویتە کەژ و بەسروشتدا بشیعرێنی و بڵێی باشترین شاعیری سەر ئەم هەسارەیەم. سوێندت لەسەرم نییە، زۆرینەی رەهای ئەوانەی لەبن دووگی دەسەلاتی کوردییدا دەلەوەڕێن و دەخەون، بەخۆیان دەڵێن زمانزان و زماناس و زمانەوان و........تاد، هەموو زانیارییەکانیان لەسەر زمان، لە چەند ستوونێکی رۆژنامە و وتاری ئاگراویی لەچەشنی ( کورد و زمانەکەی، زیندووە و نامرێ ) ی سایتە کوردییە بێکەڵکەکانی ئینتەرنێت زیاتر، شتێکی تریان پێ نییە. تراژیدیا ئەوەیە، ئەمانە کۆڕو سیمیناڕو دیبەیت و چاوپێکەوتنیش لەسەر زمانی کوردیی و ستاندەردایزی زمانی کوردیی دەکەن.

لەرۆژئاوادا، گرنگییدان بەزمان، لە قوتابخانەکانەوە دەست پێدەکات تا دەگات بە نیوەندەکانی لێکۆڵینەوە. واتە خوێندکارێک بۆ بناغەو ستراکتۆری سەرجەم زانیارییەکانی پڕچەک دەکرێ بە زمان و لە بەرزترین ئاستی ئەکادیمییشدا توێژینەوەی لەسەر دەکرێ. کەچیی بەداخێکی کەمەرشکێنەوە، کورد لەسەروبەندی چێکردنی نەتەوەیەکی یەکانگیردایە، کەچیی نەک زمانێکی ستاندەردی بەفۆرمە سیاسییەکە نییە، بەڵکو ئەو زمانە ستاندەردەی بەهۆی مێژووی تێکستەوە لەبەردەستماندایە، خەریکە دەیان دوژمنی لەزاراوەکان بۆ قیت دەکەینەوە. کە دەڵێم دوژمن، بەڕاستییش وایە، زمانی ستاندەردو زاراوەی لۆکاڵیی ناتوانن پێکەوە هەڵبکەن، ناکرێ هەردووکیان زمانی خوێندن بن، دەبێ سەرجەم زاراوەکان بە کرمانجیی ناوەڕاستیشەوە (سۆرانیی)، ملکەچیی بۆ زمانی ستاندەردی کوردیی بکەن. تەواوی زاراوەو بنزاراوەکان، هەوای

شۆڤینیزم لە کەللەی داون و بەئاشکرا دژایەتی زمانی ستاندەردی کوردیی دەکەن.

کوردناسی: لە تایبەتمەندییەکانی جیهانی مۆدێرن، لەرشتەی زمانەوانییدا، لەناو کورددا کورتکردنەوەی وشەکان و بەکارهێنانی وشەگەلی ئینگلیزیی بەخۆیەوە دیوە. چ جیاوازییەک دەبینین لەنێوان گفتوگۆ گشتییەکانی رۆژانەی نێوان لاوان و بەساڵاچوواندا.

کامیار سابیر: کورتکردنەوەی وشە و دەربڕینەکان، پێداویستییەکانی زانست و تەکنەلۆژیای مۆدێرنە. هەرچەندە ئەم کورتکردنەوانە زۆرجار بەزیانی زمانەوانیی دەشکێتەوە. هەر ئێستا نەوەی لاو، نەوەی نوێ لە رۆژئاوا ، بەهۆی گۆرانیی و مۆبایل و ئیمەیڵەوە زمانێکی ئەوەندە سەروگوێلاک شکاو و تێکست لاواز بەکار دەهێنن، ترسێکی گەورەی لە بواری پەروەردەدا دروستکردووە. سەبارەت بەکورد و بەکارهێنانی وشەی ئینگلیزیی لە زمانی نووسیندا، ئەمە دیاردەیەکە، لە دوو دەیەی رابردوودا بەتەواوی هێجەمۆنیی پەیداکردووە. من بۆخۆم لەگەڵ ئەوەدام کە وشەگەلێکی نوێ دەهێنرێنە نێو زمانی کوردییەوە، رێنووسی نووسینەکەیان وەک زمانە سەرەکییەکە بنووسرێتەوە. بۆ نموونە ئەگەر ئۆڵتێرنەتیڤ alternative دەهێنینە ناو زمانی کوردییەوە، نەچین بەسەقەتیی بنووسین ئەڵتەرناتیڤ ( یان ئەڵتەرناتیف)، چونکە خوێندنەوەکە سەقەت بێ، رێنووسەکەیش سەقەت دەردەچێ.

بۆیە پێویست ناکات بگەڕێینەوە بۆ فرانسییەکەی alternatif ، بەڵکو هەوڵ بدرێ لەمەوداو تەنها جەخت لەیەکزمان بکەینەوە کە وشەو تێرمۆنۆلۆجییەکانی لێوە وەرگرین ، ئەویش زمانی ئینگلیزییە. نموونە زۆرن لەم بوارەدا، ریفەرێندەم Referendum دەچین بەهەڵە بە ریفراندۆم دەینووسین، تەنها لەیەک دۆخدا دەکرێ بگەڕێینەوە بۆ زمانە رەچەڵەکەی لێوەی وەرگیراوە، بەتایبەت ناوەکان، کاتێ ناوی زانا، سکۆلار، بیریارێکی فرانسیی، ئاڵمانیی وەردەگرین، هەوڵ بدەین رێنووسەکەی لە فۆنەتیکی ئەو زمانەوە نزیک بێ. بۆ نموونە ناکرێ بە فورات ، بەکوردیی و عەرەبیی و فارسیی بڵێین یوفرەیتز Euphrates، چونکە ئینگلیز لە گریک و عەرەبەوە وەریگرتووە، پێویست ناکات ئێمە بچین لەئینگلیزەوە بەسەقەتیی وەریبگرینەوە. ئەو وشانەی بەهۆی بالادەستیی زمانی فرانسیی ، لە کولتوور و دیپلۆماسییدا بەسەر تەواوی زمانە

بیانییەکاندا رەنگی داوەتەوە، پێویست ناکات بچین بیکەینەوە بە ئینگلیزیی، بۆ نموونە ناسیۆنالیزم، پێویست ناکات بیکەینەوە بە ناشنالیزم، کولتوور ( لە لاتینی و فرانسییەکەوە ) بکەینەوە بە کەلچەر، یاخوود ئایدیۆلۆژیی ( لەفرانسییەوە ) بکەینەوە بە ئایدیۆلۆجیی ( ئینگلیزیی).

جیاوازیی لەنێوان گفتوگۆی گەنجان و پیرەکاندا، لەهەموو نەتەوەکاندا هەیەو ئەو گرنگیی و بایەخەی نییە، ئەوە زمانە گەشە دەکات و نەوە بەنەوەش شێوازی دەربڕینەکان دەگۆڕێن، ئەگەر سەیری فیلمە ئینگلیزییەکانی سالانی چلەکان و پەنجاکان و شەستاکانی سەدەی رابردوو بکەین ، لەگەڵ ئەو زمانەی ئینگلیزییەی هەنووکەدا بە ئاشکرا جیاوازییەکانیان لەڕووی زمانەوە هەست پێدەکەین. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت ئەمیان دروستەو ئەویان نادروستە، بەڵکو ئەوە دەگەیەنێ، زمان لەگەشەی بەردەوامدایە. بۆ کوردییش هەروایە. زمانی نووسینی چل پەنجا ساڵ لەمەوبەر، لەگەڵ ستایلی نووسینی هەنووکەدا، ئاسمان و رێسمانی نێوانە.

کوردناسی: زمانی کوردیی دەرگیری کۆمەڵێ گرفتی ناوخۆیی و لاوەکیی بووە، ئایا چارەسەر چییە بۆ دەربازکردنی زمانی کوردیی لەم نێوەندەدا.

کامیار سابیر: ئەم پرسیارە، دەکرێ بە دەیان جۆری جیاواز وەڵام بدرێتەوە، بەلام لە راستییدا، ئەوە دەسەلاتی سیاسیی کورد و عەقلییەتی عەشیرەتگەریی و هۆزگەرایی و دەڤەرچییەتیی دەسەلاتی سیاسیی و حیزبە کوردییە خێڵەکییەکان و هەندێ نووسەری ناوچەپەرستە کە گرفتی دەرەکیی و ناوەکیی بۆ زمانی کوردیی چێدەکەن. ئەو حیزب و لایەن و دەسەلات و نووسەرانەن، کە عەقلییەتی سیاسیی و کولتوورییان، ناتوانێ سنوورەکانی خێڵ، دەوار ،میرنشین، حیزب، زاراوە و ناوچە ببەزێنێ و بۆ ئەجێندا نیشتمانیی و کۆلێکتیڤەکان بپەڕێتەوە. ئەو ئەجێندا نیشتمانییانەی کە نەباوک و دایکی تۆیە، نە هیی منە، نە هیی ئەوانیشە، بەڵکو موڵکی سەرجەم نەتەوەی کوردە و دەربڕی ئایدێنتیتییەکی نیشتمانیی کۆلێکتیڤە. بۆ نموونە هەندێ لە دۆستانی بادینان، بەهەڵە باس لەمافی زاراوەکەی خۆیان دەکەن و بەهەڵەو سەقەتیی بیرۆکەکەیان وەرگرتووە. لە هیچ شوێنێکی ئەم دنیایەدا شتی وانییە، باسی مافی زاراوەیەک بکرێ، باسی کەمینە دەکرێ، باسی زمان دەکرێ ، بەس باسی دایەلێکتی زمانێک ناکرێ کە ستەمی لێ بکرێ. دیارە میدیای کوردییش خۆی ساغنەکردووەتەوە لەئاستێکی

گشتییدا، که بۆچیی بەگرنگییەوە بەزمانی ستاندەردی کوردیی نانووسن. بۆ کوردستانی باشوور و کوردستانی ڕۆژهەلات ئەمە یەکلاییبووەتەوە. ئێستا ئەرکی دۆستانی کوردستانی باکوورە، کەڵک لەو زمانە ستاندەردەی کوردیی وەربگرن و دایەلێکتەکەی خۆیان لە زمانە ستاندەردەکە نزیک بکەنەوە. ئەگەر ئەم کارە نەکەن، سەرئەنجام کورد بەرەو دابڕانێکی کولتووریی و زمانەوانەیی دەڕوات کە ئەوسەری دیار نەبێ.

کوردناسی: زمانناس و زمانزانەکانی کورد ڕوانگەیان لەسەر ستاندەردایزی زمانی کوردیی جیاوازە. ئایا کورد توانیویەتی لە داتای زمان وەک چەمکێکی کولتووریی گرنگ تێبگات.

کامیار سابیر: من پێموایە، کورد زمانناس و زمانەوانی کەمە، ئەوەی پێی دەڵێن کوردییزان، بەڵی کوردییزانی زۆر باشی هەیە، هەڵەبڕی زۆرباشی هەیە، بەسەدان کەسمان هەیە کەوکوژیی دانیشتوە بە تفەنگی زمانەوە تەقە لەم و لەو دەکات و بنکۆلی وشەو ڕستەو پارەگرافەکانی نووسەران دەکات. بەلام ناتوانن یەک دێڕ لەڕووی زمانەوانییەوە بنووسن. ناتوانن یەک پارەگراف لەسەر تێڕوانینی فەلسەفیی و کولتووریی زمان بنووسن.

پێموایە، مەسعود محەمەد، یەکەمین کەسە لەکورددا، لەڕووی فەلسەفییەوە سەیری زمانی کوردیی کردووە، هەر لەوێشەوە ئەو پیاوە مەزنە، مەزن بەفشە نا، مەزن بەتێکستە مەزنەکانی، مەزن بە بیردۆزە مەزنەکانی، مەزن بەبۆچوونە مەزنەکانی، زمانی کوردیی و گرنگیی زمانی ستاندەردی کوردیی شرۆڤە کردووەو دەسەلاتی سیاسیی خستووەتە ژێر پرسیارگەلێکی قورسەوە. ئەو پیاوە لەڕووی فەلسەفیی و کولتوورییەوە وردەکارییەکانی ستاندەردایزی زمانی کوردیی داوەتە بەر لێکۆڵینەوە. پیاوێک لەسەردەمێکی کۆندا ژیاوە بەلام بەبیرێکی زۆر مۆدێرنانەوە ، زۆر پێشکەوتووانەو زانستییانەوە لە زمانی ڕووانیوە. خوێنەر دەتوانێ کتێب و وتارگەلێکی مەسعود (زاراوەسازی پێوانە)، (دەستەودامانی نالی) لە دووتوێی کتێبەکەی "حاجی قادری کۆیی" و دەیان وتاری زمانەوانیی و دیدی فەلسەفیی ئەو لە گۆڤاری "کۆڕی زانیاری کورد، کاروان و ڕۆشنبیری" بەڕوونیی ببینێ و بزانێ ئەو سەربازە ونەی زمانی کوردیی کێیە؟

بۆ من یەک شتی زۆر زۆر گرنگە، زمان لە رووی و کولتووریی و فەلسەفییەوە شیبکرێتەوە، زمانی کوردیی کە ئەوەندە بێکەس و بێنازە، بەشێکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەپێی پێویست لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیی و مەیدانیی لەسەر نەکراوە. بەشێک لەسکۆلارە زماناسەکانی کورد، زمانەوانەکانی کورد، هەر خەریکی فاڵ گرتنەوەن، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی سیاسیی بەزەیی بەهەوڵەکانیاندا بێتەوەو زمانی ستاندەردی کوردیی لە بواری پەروەردەو فێرکردندا، لە دامودەسگا دەوڵەتییەکاندا بیسەلێمێنێ و بیسەپێنێت. خەریکی ئەوەن بچنە خزمەتی سەرۆک حیزبەکان و دەست بەسنگیانەوە بگرن و بۆیان بنوشتێنەوە بۆ ئەوەی زمانی ستاندەرد بپەژرێنێ یان بپەژرێنن. لەکاتێکدا دەبووایە، ئەمانە گوشاریان بخستایەتە سەر دەسەڵاتی کوردیی بۆ ئەوەی زمانی نووسینی کوردیی جێکەوت بکرێ.

زمان لەرووی فیلۆسۆفییەوە، چوار گرفتی سێنترالیی هەیە، ئەو گرفتانەش { سروشتی داتاکانی زمان، بەکارهێنانەکانی زمان ، دەرککردن cognition بەزمان و پێوەندیی نێوان زمان و راستیی} ن . ئەم چوار کاتەگۆرییە لە نێو زمانەوانە کوردەکاندا زۆر بەکەمیی دەستی بۆ براوەو شیکراونەتەوە. لەهەموویشیان گرنگتر دەرککردن بەزمانە کە بناغەی ئایدێنتیتیی نیشتمانیی و بوونی نەتەوەی کوردە. شەڕی بەشێک لەوانەی خۆیان بەزماناسی کورد دەزانن، خەریکی سمپارەلێدان لەم وشەو ئەو وشەن. بەشێکیان، ئەوەندە سەیر وشەی بیانیی دەهێننە زمانی کوردییەوە و بەهەڵە چەمک و داتای ئەو وشانە بەکار دەهێنن، خوێنەر یەقی دەبێتەوە. بەشێکی تریان هەوای ئایدیۆلۆژیی سەرمەستی کردوون و بۆچوونە سیاسیی و ئایدیۆلۆژییەکانیان لە کێڵگەی زماندا ساغدەکەنەوە.

کوردناسیی: هێزە سیاسیی و ئایدیۆلۆژییەکانی کوردستان( ئیسلامیی،مارکسیی،ناسیۆنالیستیی و لیبرالەکان) هەر لایەنەو بەپێی توانای خۆی رۆڵیان بەسەر زمانی کوردییەوە هەبووە. ئایا رۆڵی ئەم دیدە جیاوازانە لەسەر زمانی کوردیی چۆنە؟

کامیار سابیر: ئیسلامییەکان و مارکسیستەکان، یاخود حیزبە فەناتیکە مەزهەبییەکان و کۆمۆنیستەکان وەک یەک، هیچ سوودێکیان بۆ زمانی کوردیی نەبووە. ئەوەی گرفتی ئەوان نەبێ، زمانە. بۆ ئیسلامییەکان، زمانی عەرەبیی

هەموو شتێکەو هیچ شتێکی تر ڕێزو بەهایەکی نییە، جگە لەو خودایەی بەزمانی عەرەبیی تێکستی بۆ پێغەمبەر ناردووە، هیچ شتێکی تر جگە لەو قورئانەی کە بەزمانی عەرەبیی نووسراوەتەوە قودسییەتی نییە . بەهەمان شێوەش بۆ مارکسیست و کۆمۆنیستەکان، ئەوەی گرنگ نەبێ زمانە، بۆیشە زمانی نووسینەکانیان زۆر لاوازە. مرۆڤ بێزی لە خوێندنەوەی تێکستەکانیشیان دەبێتەوە.

کۆمۆنیستەکان دوای ئەو ئەفسانەیە کەوتوون، کە زمان تەنها هۆکاری تێگەیشتنە، ئەوان بەشوێن خەباتی چینایەتیی و ئینتەرناسیۆنالییەوەن، بۆیە پێیانوایە، باشترە لەبری زمانی کوردیی، زمانی نەتەوەی سەردەست، زمانە ڕۆژئاواییەکان بەکاربهێنن. هەندێکیان ئەوەندە دواکەوتوو، نەزان و نەخوێندەوارن، دەڵێن زمانی کوردیی هیچ پیرۆزییەکی نییە، چونکە زمانی ئاغاو شێخ و دەرەبەگەکانە. هەندێک لەم چەپە کلاسیکیانە بڕوانامەی بەرزبەرزیشیان هەیە، لەڕۆژئاواش دەژین، بەڵام توانایان بەسەر زمانی زگماکی خۆیاندا ناشکێ، ئیتر دەبێ ئینگلیزییەکەیان چۆن بێت، کەچیی سەرسەختانە دوای مەرجەعێک کەوتوون، کە ئایدیۆلۆژییانە نەک زمانناسییانە، داوای فرە ستاندەردیی بۆ زمانی کوردیی دەکات. هۆکاری سەرەکییش ئەوەیە، هەردوولایان واتە ئیسلامییەکان و کۆمۆنیستەکان، ئایدیۆلۆژیا کۆنترۆڵی کردوون و ئاوەزی خۆیان بەدەست ئایدیۆلۆژیای ئاسمانیی و بیرێکی دۆگماوە گرێدراوە. ئەگەر قسەیەک بۆ دزیش بکەین، تێکستی ئیسلامییەکان لەڕووی زانستی زمان و گراماتیکەوە لە تێکستی کۆمۆنیستەکان باشترە.

پانکوردیستەکانیش بەنۆرەی خۆیان، ئەوەندەی خزمەتیان بەزمانی کوردیی کردووە، ئەوەندەش زیانیان لێداوە. وشەگەلێک بەکار دەهێنن، ئەگەر بۆ ئینگلیزیی وەریانبگێڕیت ، شتگەلێکی زۆر نائاوەز و سەقەت دەردەچن. لە زمان و تێرمۆنۆلۆجییەکانیاندا لاسایی هەمان کولتووری پانعەرەبیزمی سەرەتاو ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوو دەکەنەوە. هەموو ئەم جۆرە ئایدیۆلۆژیایانە، زیانیان بۆ زمانی کوردیی، لە قازانج زۆر زیاتر بووە. زمان دەبێ لەدەست ئایدیۆلۆژیا دەربهێنرێ و بکرێتەوە بەکاری کۆمەڵی سکۆلارو توێژەرو زمانناس و زمانەوانی دانسقە، کۆمەڵی کەسانی تایبەت بەم بوارە. هەموو ئەو وشانەی ئەو جۆرە ئایدیۆلۆژیایانە هێناویانەتە نێو زمانی کوردییەوە، خەریکە قڕیان

تیدەکەوێ، ئەو هەلومەرجە ئازاد وکراوەیەی بەرووی زمانەکانی تردا هەیە، خەریکە ریتمی خۆی وەردەگرێ و ئایدیۆلۆژیا بەتەواویی کەنار دەخات.

کوردناسی: زمانی ستاندەردی کوردیی چیی دەگەیەنێ؟ ئایا کورد زمانی ستاندەردی هەیە. بۆچیی جەخت لەوە دەکەنەوە کە کورد زمانی ستاندەردی هەیە، لەکاتێکدا بەفەرمیی ددانی پێدانەنراوە.

کامیار سابیر: ئەم پرسیارەم پێشتر لەو نووسینانەدا وەلام داوەتەوە کە لەسەر زمان نووسیومن، بەلام زمانی ستاندەرد و تایبەتمەندییەکانی بەشێوەیەکی گشتیی دەکرێ لەم خالانەدا کورت بکرێنەوە:

١- زمانێکی دەوڵەمەند بێ لە نووسیندا، واتا تێکستی زۆری پێ نووسرابێ

٢- خاوەنی فەرهەنگی پانوپۆڕ و هەمەجۆر بێ

٣- زمانی ئێلیتی نووسەران ، شاکارنووسان، ئەدەبدۆستان و شاعیران و بیریارانی ئەو نەتەوەو گەلە بێ.

٤- زمانی خوێندن و میدیا بێ

٥- زمانی یاسایی و ئەکادیمیی و سیاسیی و کولتووریی بێ

٦- زمانی پایتەختی سیاسیی و ئابووریی و رۆشنبیریی بێ

٧- خاوەن رێساگەلێکی تۆکمەی رێزمانیی بێ

رێزمان و دارشتنەکانی لەسەر رێساو سروشتی زمانی کوردیی بێ، نەک لاساییکردنەوەو بیرازکردن.

ئەم لیستە دەکرێ درێژتر بکرێتەوە، بەلام بەکورتیی ، ئەوانەی ئاماژەم پێکردن، کرایتێریا سەرەکییەکانی زمانی ستاندەردن. ئەوانە قسەی گیرفانی من نییە، توێژینەوەی سەدان زمانناسی زمانە جیهانییەکانە. بەشی دووەمی ئەو پرسیارە، پێموایە زمانی کوردیی تایبەتمەندییەکانی زمانێکی ستاندەردی تێدا هەیە، ئەگەر هەیە بۆچیی؟ دەکرێ بەمشێوەیە وەلام بدرێتەوە.

بەڵی زمانی ستاندەردی کوردیی پێشوەخت هەیە، دەیان ساڵە بەباشیی فەنکشن دەکات و خاوەنی خەزێنەیەکی گەورەیە لەتێکستی کوردیی. کورد ئەگەر تێکستی هەبێ، ئەوا بەم زمانە ستاندەردە نووسراوە کە هەنووکە من و تۆ قسەی پێدەکەین و پێی دەنووسین. بەلام ئەوەمان لەبیر نەچێ، زمانی ستاندەرد هەرگیزاو هەرگیز وەک نیڵ سمیس پێیوایە، زمانی ئاخافتن نابێ، بەڵکو زمانی نووسین دەبێ. بۆ نموونە تۆ خەڵکی کوردستانی رۆژهەلاتی، من

خەڵکی کوردستانی باشوورم، دوو زاراوەی جیاوازمان هەیە لەئاخافتندا، بەڵام هەردووکمان بەم زمانە ستاندەردە دەنووسین کە لەهەردوو کوردستانی باشوور و کوردستانی رۆژهەڵاتدا ( نەک باشووری کوردستان و رۆژهەڵاتی کوردستان)، زمانێکی گشتگیرو باڵادەستەو لە هەندەرانیش هەر ئەم زمانە قورسایی خۆی سەپاندووە.

ئەو زمانەی پێی دەنووسین هەموو تایبەتمەندییەکانی زمانی ستاندەردی کوردیی بەتەواویی تێدایە، دەستکاریی ناوێ، تەنها مشتومالکردن و دەستپێداهێنانی لەسەرەوە دەوێ. بەهۆی دایەلێکتەکانی ترەوە بەهێز بکرێ، دەکرێ دایەلێکتی کرمانجیی و هەورامیی رۆڵی سەرەکییان لەم بەهێزکردنەدا هەبێ، چونکە دوو زاراوەن، لە وشەدا زۆر دەوڵەمەندن. بۆچیی؟ چونکە ناکرێ کورد دوای ئەو بەدبەختییە بکەوێ و جارێکی تر بیر لە بناغەی زمانێکی تر بکاتەوە. ئەگەر بیر لەشتێکی وا بکرێتەوە، ئەوە کورد دەیسەلمێنێ کەبەخۆڕایی نییە گەورەترین گەلی سەر ئەم هەسارەیەیین ، تا هەنووکە نەسەربەخۆییمان بەدەست هێناوەو نە عەقڵیشمان ( سیاسییەکانمان ) بە بەهاو گرنگیی زمانی ستاندەردی نیشتمانیی دەشکێ. هاوکات ناکرێ لەپاڵ زمانی ستاندەردی کوردییدا کە تەنها بناغەکەی سۆرانییە، زاراوەیەکی تر قوت بکرێتەوە. ئەوە جگە لەوەی سۆرانیی لەبناغەدا، تێرمێکە شۆڤێنزمی ناوچەیی کردوویەتی بە تێرمۆنۆلۆجییەک بەسەر زمان و کولتووریی کوردییەوە، ئەگینا، پانتایی جیۆگرافیی شار و ناوچەکانی سابڵاغ و سنە و مەریوان و سلێمانیی و کەرکوک و هەولێر گەرمیان کەی پێوەندییان بە سۆرانییەوە هەیە، تازە ئەم زمانە کوردییە لەوە دەرچووە پێی بگوترێ سۆرانیی؟ زمانی ستاندەردی کوردیی تەنها بناغەکەی ( تێکەڵەیەکە لە کرمانجیی ناوەڕاست و خواروو، کە بەمەغزای شۆڤێنییەوە، سۆرانیی پێ دەگوترێ) کرمانجیی ناوەڕاستە. سەرەڕای ئەمانەش، زمانی ستاندەردو زاراوە پێکەوە هەڵناکەن ؤ تەواوی بیردۆزە زمانەوانییەکان جەخت لەوە دەکەنەوە زاراوەو زمانی ستاندەرد، پێچەوانەی یەکترن و زاراوەکان دەبێ لەپێناو بەرژەوەندی گشتیی و ئایدێنتیتیی نیشتمانییدا خۆیان بخەنە خزمەتی زمانی ستاندەردی کوردییەوە.

کوردناسی: لە ئەگەری گۆڕینی سکریپتی زمانی کوردیی لە ئارامییەوە بۆ لاتینیی، ئایا بۆ فێربوونی زمانە رۆژئاواییەکان باشتر نییە؟ ئایا پلانی گۆڕینی سکریپتی تێکستی کوردیی بۆ سکریپتی لاتینیی، سەردەگرێ؟

کامیار سابیر: ئەم پرسیارەم لە نووسیندا، بەشێوازی جۆراوجۆر وەڵام داوەتەوە. بەڵام بەکورتیی، سکریپتی لاتینیی، لەبەلایەک زیاتر بۆ زمانی کوردیی هیچ دیارییەکی تری نەهێناوە. ئێمەی کورد، ناکرێ نکۆلیی لەرابردوو ، لەمێژووی خۆمان بکەین، ئێمە گەلێکی رەگ ئێرانیین، مەبەستم لە ئێرانی کۆنە. گەلی فارس و کورد، ئەوەندە لێک نزیکن لە کولتوور و زماندا، مەگەر فرانسیی و ئینگلیزیی ئەوەندەیان بەسەریەکەوە هەبێ. ئەوەی بچین خەریکی سکریپتی لاتینیی بین، کە خودی لاتین زمانێکی مردووە، شێتخانەیەکە ئەوسەری دیار نەبێ. سکریپت نیشانەی پێشکەوتن نییە، ئەگەر وابووایە، دەبوو، ژاپۆنییەکان و چینییەکان و هیندییەکان و رووسەکان لەدوای هەموو گەلانی دنیاوە بوونایە، چونکە وەک لەکوردییدا دەگوترێ، سکریپتی ژاپۆنیی و ئاسیاییەکان لە دەرگا و پەنجەرە و خەتخەتۆکێ دەچن. کەچیی ئەوەتا ژاپۆن، دووەم وڵاتی دنیایە لەرووی ئابوورییەوە، چین بەپێی پێشبینیی ئیکۆنۆمیستەکان و لێکۆڵیارە تایبەتەکانی بواری پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان، لە دە- بیست ساڵی داهاتوودا ئەگەر گەشەی ئابوورییەکەی بەمشێوەیە روو لەهەڵکشان بێ، بۆی هەیە ببێ بەگەورەترین هێزی ئابووریی و سیاسیی و سەربازیی لە جیهاندا.

بەهیچ شێوەیەک، سکریپتی لاتینی یارمەتییدەر نییە بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزیی، ئەمە لۆژیکێکی زۆر قۆڕە. ئەمە پێچەوانەی ئەو کۆنسێپتە فیلۆسۆفیانەیە کە پێیانوایە زمان رەنگدانەوەی بیروهۆشی مرۆییە. باشە ئەگەر وایە بۆچیی کوردانی باکوور لە ئەوروپاش فێری ئینگلیزیی و فەرەنسیی و ... ......تاد نەبوونە؟ ئەگەر وایە کوا رۆڵیان، با گوترەکارییەکی کوردیی بکەین، بۆیە وا دەڵێم چونکە هیچ ئامارێکی وردو زانستیی و ئەکادیمییمان لەبەردەستدا نییە، بەڵام بە ئەزموونی رۆژگار قسە دەکەم . من پێموایە، کوردی کوردستانی باشوور و رۆژهەڵات، کەهەردوولایان سکریپتی ئەو زمانە ستاندەردەمان هەیە کە پێی دەگوترێ زمانی ستاندەردی کوردیی، لە فێربوونی زمانە رۆژئاواییەکاندا لە پێش خەڵکی تورکیا و کوردەکانی ئەو وڵاتەوە دێین.

له چاو نەتەوەکانی تریشدا، کاتێ فێری زمانی ئینگلیزیی دەبین، فۆنەتیکی کورد بەگشتیی لە فۆنەتیکی عەرەبیی و تورکیی و فارسیی باشترە. کەواتە پێوەنانێکی بێرادەیەو حەشوەبەستنێکی زۆر گەورەیە، ئەوانەی دەڵێن سکریپتی لاتینیی یارمەتییدەرە بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزیی، بەهەڵەداچوون. ئەگەر یارمەتییدەریش بێ، تەنها بۆ ئەوانە یارمەتییدەرە کە لەرۆژئاوا گەورە دەبن، بەڵام زۆر زۆر سنووردارە. با ئەو دۆستانە خۆیان فێری کوردییە کرمانجییەکە بکەن، کە لەبنەڕەتدا نایزانن، ئەوکات نۆرەی ئەوە دێت، بەهۆی ئەو سکریپتەوە فێری زمانی بیانیی ببن.

زمانی کوردیی بەسکریپتی لاتینیی، لە هەنووکەدا لەخەونی شێت دەچێ. خەونێکی ئەوەندە نائاوەزییە، کە گوناهە مرۆڤ مێشکی خۆی پێوە خەریک بکات. ئەمە ورێنەی پانلاتینیی و کولتوور-کەمالیستەکانە. زمانی کوردیی یەک رێگەی لەبەردەمە، لە پێش هەموو شتێکدا، ئەو زمانە ستاندەردەی لە کوردستانی عێراقدا هەمانە بەفەرمیی لە رووی سیاسییەوە بیسەپێنین، ئەمەش چاوکراوەیی دەسەڵاتی کوردیی دەوێ، ئیرادەی سیاسیی دەوێ، لە قۆناغی دواتردا، کاتێ زمانی ستاندەردی کوردیی تەواو گەشەی کردو سەرجەم زاراوەکانی لەژێر چەتری خۆیدا کۆکردەوە( لەئاستی کوردستانی گەورەدا ئەمە نایاتە دی، لای کەم لەهەنووکەو داهاتوویەکی نزیکدا – قسەمان لەسەر کوردستانی باشوورە، کە حکومەت و دەسەڵاتێکی دیفاکتۆی هەیە) ، ستایلی نووسینمان کرد بەیەک، ئەوسا دەکرێ لە ئاستێکی بەربەبڵاوتردا ئەم بابەتە یەکلاییبکرێتەوە.

بەڵام ئەوە لەیاد نەکەین ئەو سکریپتەی جەلادەت بەدرخان بناغەکەی رۆناوە، بەچاولێکەریی کەمالیزم و تۆرانیزم بووە، هیچ پێویست ناکات کاتێ بنووسین چوار، بەلاتینییە کەمالیزمییەکە دەبێ çwar بنووسین ، بەڵام ئەگەر بە سکریپتی مۆدێرنی رۆژئاوایی بینووسین، دەبێ chwar بنووسین. یاخود هەشت، ئەگەر بە لاتینییەکی سەقەت و کەمالیستانە بینووسین، دەبێ heşt بنووسین، بەڵام بەسکریپتی مۆدێرن ، باشترە hesht بنووسین. بەسکریپتە لاتینییەکەی بەدرخان، خراپ دەبێ بە Xrap بنووسین، بەڵام بە سکریپتی رۆژئاوایی نوێ ، باشترە khrap بنووسین. بەکورتییەکەی ئەم چوکلەو سەروبۆرانە لە سکریپتەکەی بەدرخان دەبێ دەربکرێن، راستییشت دەوێ،

سکریپتەکەی جەلادەت بەدرخان، ئەگەر تاموچێژە تورکیی و کەمالیزمەکەی لێدەرکەیت، هیچی نامێنێتەوە. گەورەترین بەدبەختیی و نەزانیی کورد لەوەدایە، عەقڵی خۆی بداتە دەست ئەوانەی دوای جەلادەت بەدرخان کەوتوونە، لەکاتێکدا خودی جەلادەت، چاولێکەری کەمالیزم بووە، ئەو خۆی ئازاد نەبوو، بیروبۆچوونی کۆیلەی بیری کەمالیزم بووە، ئاوەزی کۆیلەی ئاوەزی نەتەوەی سەردەستی تورک و پانتۆرانیزم بووە، شێتییە گەلی کوردبچێ دوای بۆچوونێکی لەو چەشنە بکەوێ.

ئەوە جگە لەوەی ئەو سکریپتە بۆ زمانی ستاندەردی کوردیی دەست نادات ، چونکە فۆنەتیکی زمانی کوردیی لەگەڵ دایەلێکتی کرمانجییدا جودان. بەگشتیی ، کورد ناتوانێ رەگە هیندۆئەورووپاییەکەی، رەگەزە ئێرانییەکەی لەبیر بکات و بە نەزانیی و چاولێکەریی خۆی بکاتە رۆژئاوایی ( لەسەر ستایلی کەمالیزم و پانتۆرانیستەکانی تورکیا، هەروەک هۆزی جەلادەتی بەدرخان کردیان). پلانی گۆڕینی سکریپتی کوردیی ( فارسیی -ئارامیی- عەرەبیی چێکراو ) بۆ سکریپتی لاتینیی- تورکیی ( نەک لاتینیی – کوردیی ) نەزانییەکی زۆر کوێرانەیە، زۆر کەسی پاننەتەوەیی و پانکوردیستی سەرگەردان، هەوڵیان دا، هەموویان شکستیان هێناو هەرهەوڵێکی تریش بدرێ، هەر شکست دێنێ.

بەپێچەوانەوە کوردەکانی کوردستانی باکوور کارێکی باشیان دەکرد، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ رۆحی سکریپتی کوردیی، بگەڕێنەوە بۆ یەکێک لەتێکستە گەورەکانی کورد، ئەو سکریپتەی" مەم و زین" ی پێ نووسراوە. سەرئەنجام ئەگەر رۆژگارێ هاتە پێشەوە بۆ گۆڕینی سکریپتی کوردیی بۆ سکریپتی لاتینیی، دەبێ پێشوەخت، کورد زمانەکەی ستاندەردایز بووبێت لەڕووە سیاسییەکەیەوە ( چونکە لەڕووی کولتووریی و ئەدەبیی و زانستییەوە، تەواو کامڵ بووەو سەرلەبەر زمانێکی ستاندەردە ) ، ئەوسا لەرێگەی رێفەرێندەمێکەوە ( لەکوردستانی باشووردا ) ئەمە یەکلایی بکرێتەوە، من ئەوەش بەکارێکی راشناڵیی ( عەقڵانیی) نازانم، بەپێچەوانەوە باشترە بۆ کورد گەشە بەم سکریپتە رەسەنەی خۆی بدات.

کوردناسیی: چ وەڵامێکتان هەیە بۆ ئەو دەستە لە رۆشنبیر و زمانناسانەی وڵاتانی دەسەڵاتدار کە زمانی کوردیی بە زاراوە یان بەبەشێک لە زمانەکانی عەرەبیی،فارسیی و تورکیی دەزانن؟

کامیار سابیر: با هەموو شتێک هەر نەخەینە سەر دوژمن، بەردێ لەو ئاسمانەوە بێتە خوارێ و بڵێین دەستی نەتەوەی سەردەستی عەرەب و تورک و فارسی تێدایە. من دەڵێم خەتای ئەوان نییە، خەتای خومانە، ئێمە خۆمان تاوانبارین لەوەی زمانی ستاندەردی کوردییمان بەشێوە سیاسییەکەی نییە، دەسەلاتی گەندەڵی کوردیی تاوانبارە، کابرایەکی تورکی کەمالیست بۆ تاوانبارە؟ کاتێک دەسەلاتی سیاسیی کورد، تازە بەتازە دێت حەنەحەپەشێی زاراوەکان برەو پێدەدات و لە کوردستانی باشووردا دەیخاتە پرۆگرامی خوێندنەوە. فەرموو لەکوردستانی باشووردا، لە کۆی ٦-٧ زانکۆی کوردستانی باشوور، زانکۆی دهۆک ناوەکەی خۆی بە زاراوەیەکی کوردیی نووسیوە، کە دەبووایە بە زمانی کوردیی، نەک بە زاراوە بنووسرێ ، کەواتە لۆمەی کابرای تورک و عەرەب مەکە، کاتێ دەڵێن کورد زمانی نییە، تەنها هەندێ زاراوەی گەڕوگولی هەیە. ئەم بۆچوونەیان دیوێکی راستە، بەلام ئەوان بەچاویلکەیەکی شۆڤینییانە تێی دەڕوانن. من وەک کوردێک شەرم لەخۆم دەکەم ، کە دەسەلاتە سیاسیەکەی کورد، عەقڵی بەوە ناشکێ کە کورد وەک ئایدێنتیتی پێویستە زمانی ستاندەردی کوردیی هەر ئێستا نەک سبەینێ بیەژرێنێ. شەرم لەخۆم دەکەم، کەکوردم و ئەم دەسەلاتە گەندەڵەی کوردیی، وەک میرە کوردەکانی سەدەکانی رابردوو خەریکی ناوچەچییەتیی و دایەلیکتبازییە.

بەڵی خەتای تورک و عەرەب و فارس نییە، کە ئێمە زمانی ستاندەردی فەرمییمان لەرووی سیاسییەوە نییە. خەتای خۆمانە، خەتای دەسەلاتی کوردییە. خەتای ئەو زماننناس و زمانەوانە ترسنۆکانەن کە دنیا بەسەر ئەو دەسەلاتەدا قڵپ ناکەنەوە. کاتێ زاراوەیەک لەبەرامبەر لینگوا فرانکای ستاندەردی کوردییدا قیت دەکاتەوەو شەڕ دەخاتە نێو ماڵی زمانەوە. ئەم سەرکردایەتیی و دەسەلاتە سیاسییە، وەک ئەو پیاوە چەند ژنە دێتە بەرچاو کە بچووکترین کوڕی دەلالی ژنە بچووکەکەی، بۆ گیان هەموو منداڵەکانی تری راست دەکاتەوەو دەست لەپشتی دەدات و دنەی دەدات، بۆچیی؟ بۆ ئاژاوە نانەوەو خۆخۆریی، چونکە ژنە بچووکەکەی خزمی خۆیەتی، لە خوێنی خۆیەتی، لە عەشیرەتەکەی خۆیەتی، خەڵکی هەمان ناوچەو سەر بەهەمان هۆزو خێڵە، ژنە بچووکەکەی بۆ سەر هەمان تەریقەت و هەمان بەرەباب و هەمان کولتوور و هەمان زاراوە دەگەڕێتەوە.

کوردناسی: وەرگێڕانی دەقە زانستیی و ئەکادیمییەکان لە زمانەکانی تردوە بو سەر زمانی کوردیی، بە ڕای ئێوە دەتوانێ چ یارمەتییەک ببەخشێتە زمانی کوردیی؟ چالاکیی لەم چەشنە لە ناو وەرگێڕە کوردەکاندا لە چ ئاستێکدا دەبینن؟

کامیار سابیر: ئەم پرسیارە بۆیە بەگرنگ دەزانم و وەڵامی دەدەمەوە، چونکە بەسەر خۆمدا هاتووە. لەگەڵ دۆستێکی تردا لە بریتانیا ( کاک دڵشاد حەمە) ، خەریکی وەرگێڕانی کتێبێک بووین بەناوی ئایندەی عێراق- دیکتاتۆریی، دیموکراسیی یان دابەشبوون، کتێبەکە دوو سکۆلاری بریتانیایی نووسیویانە ( Liam Anderson and Gareth Stansfield )، بەڕاستیی گیانمان دەرچوو تا تەواومان کرد، دڵنیام هاوکارەکەشم هەمان دەردەسەریی بەسەردا هاتووە. زمانی کوردیی لەڕووی سینتاکس و میتافۆری زمانەوانییەوە، ئەوەندە بەهێز نییە، کە دەقێکی تیروپڕی ئینگلیزیی پێ وەربگێڕدرێ. ئەی چارەسەر چییە؟ بەڕای من چارە ئەوەیە، هەوڵبدرێ کوردانددن زۆر لەدەقەکەدا نەکرێ، ڕۆحی نووسینەکە نەگوشرێ و لەبەرامبەریشدا، خوێناوی کوردیی نەکرێ بەبەریدا و وەرگێڕ ئیدیەمەکانی ناو کۆنتێکستەکە لە ئامانج و پێکانی مەبەست دوورنەخاتەوە. ئەگەر وشەیەکمان نییە، لەبری ئەوەی لەفارسیی و عەرەبییەکەوە وەریبگرین، باشترە بچین لە ئینگلیزییەکەوە وەریبگرین.

بەڵام دەبێ وەستایانەو وردەکارییانە ئەم کارە بکرێ. هەندێ کەس هەیە، وشەی collapse ی ئینگلیزیی ، بە کۆلاپس دەنووسنەوە. من چاوم دەچێتە پشتی سەرم، کەشتێکی قوڕی لەم چەشنە دەبینم، فەرموو لەکوردییدا هەموو ئەم وشانەمان هەیە ( ڕووخان، ڕمان، داڕمان، داڕووخان، تەپین، داتەپین، نوشتانەوە، هەرەس، شکست، تلیسانەوە، کەوتنە خوارەوە، ............تاد ) دیارە بەپێی ڕستەکە واتای وشەکە دەگۆڕێ، دەکرێ وشەیەکی کوردیی گونجاو بەکاربهێنی، کەچیی هەندێ نووسەری کوردی هیچ نەدیتەی وڵاتانی ئەوروپا، دەچن کۆلاپس دەنووسن. لەو بێ عەقڵترم ئەگەر بەردەوام بم لە خوێندنەوەی نووسینەکەی، کاتێ دەمدا بەتاسەیەکدا لەچەشنی " کۆلاپس" و حەزی خوێندنەوەم دەکوژێ. بەڵام زۆر وشەی تر لەچەشنی "ریکۆرد، تیۆریی، گلۆبالیزەیشن، ئایدێنتیتیی، سیڤیل، فەنکشن، ............تاد" هەروەها ئەو وشە

کوردییانەی هەن، پربەپێستی وشە ئینگلیزییەکە نین، بەبڕوای من ئەگەر وەک خۆیان بنووسرێنەوە، گرفتێکی ئەوتۆ نییە.

کوردناسی: وەک پێداویستییەکی ژیانی مۆدێرن، پێویستە کوردەکانی ئەوروپا و وڵاتانی ئینگلیز زمان، فێری زمانی ئەو وڵاتانە ببن کە لێی دەژین، بەڵام زۆرینەی کوردەکان لەم بوارەدا کۆڵەوارن . هۆکارەکان چیین؟

کامیار سابیر: بەکورتیی و بەکوردیی، هۆکارو بەربەستی سەرەکیی بۆ کورد لە فێرنەبوونی زمانە ئەوروپاییەکاندا، بۆ کولتوورێکی خراپ، مێنتاڵێکی وێران، ڕووانینی چەوت لەژیان، بێسەرەوبەرەیی ئەو کۆڕەوەی بۆ ئەوروپا دەستیپێکرد دەگەڕێتەوە. با ئەوەمان لەبیرنەچێ، زۆرینەی کۆمیونیتی کوردیی لەئەوروپاو وڵاتانی تری ڕۆژئاوا، دوای ژیانێکی باشترو خۆشتر کەوتووینە. ئەمە مافی هەموو تاکێکە. بەڵام کاتێ ئەم تێکەوڵێکەیە، توخمە سەرەکییەکانی ئەم کۆمیونیتییە بێ، دەبێ چاوەڕوانییەکانیشمان سنووردار بن. بەهۆی سیاسەتی سەرکوتکەرانەی کۆماریی ئیسلامیی ، بەعسی رووخاو، رژێمی سووریاو تورکیاوە سەدان هەزار کورد پەڕیوەی هەندەران بوون. بەڵام ئەوەشمان لەبیر نەچێ بەسەدان هەزارکەسیش لەکوردستانی باشوور بەهۆی دۆزەخی شەڕی نێوخۆ و گەندەڵیی دەسەڵاتی کوردییەوە، کوردستانیان جێهێشت. کەواتە کۆچ بۆ ڕۆژئاوا، هەرەمەکیی بووە، لەناو ئەم ئاپۆڕایەدا زۆرترین خەڵکی نەخوێندەواری تێدایە. گۆچانی گاوانیی و شوانییەکەی فڕێداوەو بۆ هەندەران چوونە، چەکی جاشییەتییەکەی فڕێداوە هەڵهاتووە بۆ دەرەوەو بە تێکۆشەری دێرینیش خۆی دەناسێنێ.

بەشێکی زۆر لەمانە نەدیی و بدیین، پارەیان نەدیوە، چاوچنۆکن، لەئەوروپاو ڕۆژئاوا دەژین، خاوەنی پارەیەکی زۆریشن، کەچیی هێشتا دەڵێی لە ئەفگانستان و کوێرەدێیەکی کوردستاندا دەژین، هەر بەدوای پارەدا راکەڕاکیانە ، شەوورۆژیان خستووەتە سەریەک و زۆربەیان بەڕەش ئیش دەکەن و تێرناخۆن. لەڕووی دەروونییەوە هەر هەڵپەیانە، وەک سادەترین مرۆڤی ڕۆژئاوایی ناتوانن چێژ و خۆشیی لەژیان ببینن. لە دەمی خۆیان و ماڵ و منداڵیان دەگرنەوە و لەکوردستان بەڕیز خانوو دەکڕن. بەهەزاران خانووی کڕدراو لەلایەن کوردانی دایەسپۆراوە لە شارەکانی کوردستاندا هەن، یان چۆڵن یان نیمچە چۆڵ، لەکاتێکدا ئەو هەموو بێ جێگەو بێ خانەیە لەکوردستاندا

هەن. ئیتر تۆ چاوەڕوانی چیی لەم بابایەنە دەکەی فێری زمانی وڵاتەکەی خۆیان ببن و خێریکیان بۆ خۆیان و نەتەوەو وڵاتەکەیان هەبێ. ڕاستە بازرگانییکردن و پارە هێنانە ناو وڵاتەوە، گەشەی ئابووریی بۆ کوردستان زیاتر دەکات. بەڵام ئەو ڕەهەندە نامۆڕاڵییە، بەرهەمی گەندەڵی تاکی کورد و دەسەڵاتی کوردییە، کە کوردستانیان بەم ئاستە سامناکە لەگەندەڵیی گەیاندووە.

ئەوانە هەر خەریکی پارەکۆکردنەوەن ، نە خێریان بۆ خۆیان ، نە بۆ منداڵەکانیان و نە بۆ نەتەوەکەشیان هەیە ، زۆریان بە مانگیش پەڕەیەک ناخوێننەوە، بەتاک قسە بکەین، ناوی دوو ڕۆژنامەی شارو وڵاتەکەی نازانێ. ئاخر بەڕاستیی ئەمانە بوون و نەبوونیان چییە. ئەمانە تەنها مرۆڤن و بەدواکەوتووترین شێوەی ژیان دەژین، زیانیان بۆ خۆیان و منداڵ و خێزان و کۆمیونیتییەکەیان لە قازانجەکانیان زۆرترە. کەواتە فێری هیچ زمانێ نابن. بەکورتییەکەی کورد لە دایەسپۆرادا، کۆمیونیتییەکە هێشتا سیمای پەناهەندەیی پەنابەریی بە سەر ئەدگارو ئاکارو بیروهۆشییدا زاڵە و تازە لەسەرەتای تێکەڵبوونییدایە بە کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا.

ئەوەی پێشتر گوتم سەبارەت بە زمانە بیانییەکان، ئێ سەبارەت بە زمانی کوردییش، هەمان خەڕەکە، چونکە پێوەندیی بە نەبوونی تێگەیشتن و فرچککگرتن بەزمانی ستاندەردی کوردییەوە هەیە. زۆربەی خوێنەرو نووسەرانی ئێمە ، دەرکی بەگرنگوەرگرتنی زمانمان نییە. زۆربەمان بە شێواز و زاراوەی گوندەکەی خۆمان، شارەکەی خۆمان ، ناوچەکەی خۆمان بیر دەکەینەوە. لەکاتێکدا زمان دەبێ هەموو سنووورە نێوخۆییەکان ببڕێ و لە تانوپۆی نیشتمانیی و نەتەوەییدا خۆی ببینێتەوە.

کوردناسی: هەنووکە دەنگێک پەیدابووە، داوای ئەوە دەکەن، زمانی ئینگلیزیی بکرێ بەزمانی فەرمیی کوردستان، ئیتر گرفتی ستاندەردایزی زمانی کوردییش لەکۆڵ دەبێتەوە، ئایا ئەگەر ئینگلیزیی ئەم ڕۆڵە ببینێ، زمانی کوردیی چیی بەسەر دێ؟

کامیار سابیر: ئەوانەی داوای ئەوە دەکەن، کە ئەو لینگوا فرانکا کوردییەی هەیە کە ناوزەد بووە بە سۆرانیی، لەڕاستیشدا تەنها بناغەی زمانەکە سۆرانییە( بە کینەو بوغز و شۆڤینیزمی ناوچەییەوە پێی دەڵێن سۆرانیی) بەزمانی ستاندەرد نەکرێ، مەبەستیان ڕوونە. دەیانەوێ زمانی کوردیی هەنووکە

بچووکبکەنەوەو زاراوەی ناوچەکەو دەڤەرەکەی خۆیان بە دیفاکتو بکەن. تێکستی کوردیی زۆرینەی ڕەهای بەم زمانە نووسراوە، زۆرینەی سکۆلارو زاناو شاعیرو ئەدیبی کورد لەکۆن و نوێدا بەم زمانە ستاندەردە دەنووسن. بە تێرمە ئالمانییەکە لەسەر زمانی ئالمانیی وەک "زمانی بالا"، زمانی ستاندەردی کوردییش، لینگوا فرانکای کوردیی، خۆبەخۆ بووەتە زمانی بالای کورد. بەدەربڕینێکی تر، ئەگەر هەر لەسەر چەمکە هەڵە باوەکە بڕۆین و بەسۆرانیی ناوزەدی بکەین، هەنووکە سۆرانیی لەوەدا نەماوە پێی بگوترێ زاراوە، بەڵکو بەکردەوە، بەڕەنجی شانی خۆی بووە بە زمانی بالای کوردیی و زمانی پرێستیژی کوردیی و خۆی جێکەوت کردووە.

کەس داوای گۆڕینی زمانی نەکردووە، بەڵکو داوای سەپاندنی ئەم زمانە ستاندەردە دەکرێ کەبوونی هەیە. چۆن زمانی پاریس ( Parisian Language ) ، دوای شۆڕشی فڕانسە بەهۆی سەپاندنی سیاسییەوە بوو بەبناغەی زمانی ستاندەردی فڕانسیی، لەکاتێکدا زمانی بۆرژواکانی فڕانسەی پێ دەگوترا، تەنها زمانی نووسەران و سیاسییەکان و فیلۆسیفەکان( فەیلەسووفەکان) بوو، نەک زمانی گشتیی ناوچە جیاوازەکانی فڕانس، هەنووکەش لەجیهاندا زمانی فەرمیی و ئۆفیشەڵی ٣١ دەوڵەتە. چۆن زمانی پایەختی چین بەسەر سەدان و هەزاران زاراوەی تەتکەوپەتکەی چیندا سەپێنرا، چۆن زمانی ستاندەردی ئیتالیی لە زمانی فلۆرێنس Florence و دەوروبەرەکەیەوە دەقی گرت و سەپێنرا ، چۆن زمانی ئالمانیی بەمێژوویەکی دوورودرێژی زمانی فیلۆسۆفی و تێکستی قورسدا هاتووەو سەرئەنجام زمانی بالای ئالمانیی بووەتە بناغەی زمانی ستاندەردی ئالمانیی و دایەلێکتی نزمی ئالمانیی Low German بەرکەنار خرا، بەهەمان شێوەش با دەسەلاتی سیاسیی کورد خەمێکی جدیی لە زمانی ستاندەردی کوردیی بخوات.

با زمانی نووسینی شاری هەولێر، زمانی شاری کەرکوک ، سابڵاغ، سنە هەڵبژێرن و بڵێن ئەمە زمانی ستاندەردی کوردە. ئەم چاوەڕێکردن، چاوبەستیی و دڵدارییکردنە لەگەڵ زاراوەکان و دەستیی دەستییەی دەسەلاتی کوردیی بۆ بەفەرمییناساندنی زمانی ستاندەردی کوردیی لەرووی سیاسییەوە بەزیانێکی زۆر گەورە دەشکێتەوە. من زۆر بە وریاییەوە دەیڵێم ئەو زمانە ستاندەردەی هەنووکە لە کوردستانی ڕۆژهەلات و باشووردا هەمانە، کە نزیک بەتەواوی

تیکستی کوردیی پێ نووسراوەو پێی دەنووسرێ، لە گەڵ دایەلێکتی کرمانجییدا، دەقاودەق وەک دوو سەد ساڵ لەمەوبەری زمانی ئاڵمانیی دەچوێنم. لە ساڵانی ١٨٠٠ ەکاندا دوو زمان لە ئاڵمانیا فەنکشنیان دەکرد، زمانی جێرمانی باڵاو زمانی جێرمانی نزم ( German High, German Low ). بەلام سەرئەنجام جێرمانی نزم سەری بەرزی بۆ هێجەمۆنیی زمانی ستاندەردی ئاڵمانیی نەویی کرد. سەرئەنجام زمانی ستاندەردی ئاڵمانیی سەرجەم ئاڵمانیای تەنییەوەو ئەو شارەی کە ئێستا پێی دەگوترێ هانۆڤەر لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا، بەتەواویی زاراوە لۆکاڵیی و رەچەڵەکەکەی خۆی لەدەست دا.

ئاخر دنیا دەڕووخێ، ئەگەر دهۆک زمانی ستاندەردی کوردیی بپەژرێنێ و زاراوە لۆکاڵییەکەی خۆیشی نەفەوتێنێ. کوردستان وێران دەبێ ئەگەر ئامێدیی، زمانی کوردیی کوردستانی باشوور بکاتە زمانی پەروەردەو خوێندن و دامودەسگاکانی حکومەت، ئەمە کە ناکرێ، هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، دەسەلاتی سیاسیی و حیزبی زاڵی ئەو دەڤەرە، ئەوەندەی خۆیان بەکرمانجیی دەزانن ،ئەوەندە خۆیان بەکورد نازانن. بەواتایەکی تر ئەجێنداکانیان نیشتمانیی نین، زیاتر ئەجێندای دەڤەرگەرایی و دایەلێکتبازییە. دەسەلاتی کوردیی و حکومەتی هەرێمیش بەئاشکرا و بەدزییەوە دڵداریی لەگەڵ ئەم دڕدۆنگیی و شۆڤینیزمی دەڤەرپەرستییەدا دەکەن.

کوردناسی: ئێوە تێرمی لینگوا فرانکاتان لە نووسینێکدا" لینگوا فرانکای کوردیی: زمانی ستاندەردو فەرمیی" بەکارهێنا بوو، بەڕای ئێوە جیاوازییەکانی نێوان لینگوا فرانکا و زمانی ستاندەرد چییە، هۆی چییە هەموو تاکێکی کورد ئاشنایەتیی بە تێرمی زمانی ستاندەرد هەیە، بەلام بەپێچەوانە کەم کەس هەن ئاشنایەتییان بە لینگوا فرانکا هەبێ؟

کامیار سابیر: جیاوازییەکان تەکنیکیی و زمانەوانیی و کولتوورییە. لەڕووی چەمکیشەوە کەم تا زۆر فەنکشنەکانیان جیاوازە، بەلام لەزۆر جێگەشدا لەبری یەکتر دەتوانن فەنکشن بکەن. بەواتایەکی تر سەرەڕای جیاوازییەکانیان لەزۆر رووەوە، کەچیی زۆر تێکهەڵکێشیان بەسەر یەکەوە هەیە. تێرمی لینگوا فرانکا، بەپێی ئەدەبی ئیتالیی بەواتای زمانی فرانکیی Frankish دێت. لە بنەڕەتدا لینگوا فرانکا بە تێرمی"سابیر= Sabir " ناسراوە، بەنەتەوەکانی دەوروبەری دەریای ناوەڕاست واتە خەڵکی ناوچەکانی Mediterranean دەگوترێ ،

زیاتریش مەبەست لە ئیتاڵییەکان دەکات و وشەگەلێکی زۆری گریکیی، فارسیی ، فرانسیی و عەرەبیی تێکەڵ بووە. وەک زمانێکی دیپلۆماسیی کۆن بەکارهاتووە. دواتر بووەتە زمانی کۆمۆنی بازرگانیی ،ئەدەب ، هونەر و سیاسەت، فەلسەفە............تاد.

لەسەردەمی کۆندا، بەتایبەت ئیمپراتۆریای رۆمانییدا، زمانی کۆمۆن" هاوبەش" لینگوا فرانکای بەشی خۆرهەلات و رۆژهەلاتی ناوەراست زمانی گریک بووە، بەلام لەبەشەکانی تری ئەوروپادا، لاتین لینگوا فرانکا بووە. لینگوا فرانکا ئەو زمانەیە دەربڕی ئەو هەست و هۆشیارییەیە کە لەپشت گەل و نەتەوەیەکەوە فەنکشن دەکات، بەواتایەکی تر سنووری لۆکاڵیی دەبەزێنێ و بۆ ئەجێندای نیشتمانیی و سەرتاسەریی هەوڵدەدات. لە هەنووکەدا، کورد دەکرێ بڵێی یەک لینگوا فرانکای هەیە، ئەویش ئەو زمانە ستاندەردەی نووسینە کە تەواو دەقی گرتووەو فەنکشن دەکات. تەواوی زاراوەکانی تر نەک هەر خۆماڵیین Vernacular بەڵکو زاراوەگەلێکن توانای ئەوەیان نییە ئەو ئەرکە قورسە لە ئەستۆ بگرن و ببنە زمانی نووسینی نەتەوەی کورد. بەراستی خەمێکی قورسە و ئەرکێکی سەختە هیچ زاراوەیەک تازە بەتازە شان بداتە بەر ئەو ئەرکانەی کە لینگوا فرانکای کوردیی یاخود زمانی ستاندەردی کوردیی هەنووکە پێی هەڵدەستێ.

مەسەلە ئاشنایەتیی و شارەزایی بەزمانی ستاندەرد و لینگوا فرانکای کوردیی نییە. مەسەلە ئێمەی کورد بە شێوەیەکی گشتیی لەئاست زانستی زماندا کۆڵەوارین. بەراستیی مرۆڤ بێزار دەبێت کاتێ هەندێ کەس وشەی ستاندەرد ( ستاندارد- Standard ) بە ستاندەر دەنووسن، ئەمە نیشانەی ئەوەیە ئەو کەسانە ئەوەندە هەرەمەکیی لەسەر بابەتێک دەدوێن، تەنانەت نازانن سپێلی وشەکە بە رەچەڵەک چۆن دەنووسرێ. بەداخەوە زۆربەی کرمانجییەکان ئەم وشەیە بە هەڵە بە "ستاندەر" دەنووسن، هاوکات لە هەولێریش بڵاوکراوەیەک بە نێوی "ستاندەر" هەیە. کۆمیدیاکە لێرەدایە، چۆن فەنکشنی ستاندەرد تێدەگەین کە ناوەکەی بەهەڵە بنووسین.

بەسەدان نووسەریشمان هەیە، سەری زمان و بنی زمانیان ، وشەی ستاندەردە، کەچیی ئەو دنیایە بڕوخێ بەسەر زمانی ستاندەردی کوردییدا، توانای ئەوەیان نییە ستوونێکی کاراو باش لەسەر بەهاو گرنگیی زمانی

ستاندەرد بە شێوەیەکی زانستیی و ئەکادیمیی بنووسن. لەم دیدەوە ئەگەر ئێمە ئەمە ئاستی تێگەیشتنمان بێ لە زمانی ستاندەرد، ئەی دەبێ ئاستی تێگەیشتنمان لە تێرمی لینگوا فرانکا، کە کەمتر لەئاستی جیهانیی و لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکانیشدا بەکارهێنراوە، لە چ شوێنێکدا دەبێ؟ گومانی تێدا نییە، کەمشارەزایی و کەمبەڵەدییمان گەورەترین دوژمنە کە ناهێڵێت نەخۆمان و نەزمانەکەمان و نە نەتەوەکەمان هەنگاوی گەورە بچینە پێشەوە.

کوردناسی: دوا وتەت لەسەر گرنگیی لینگوا فرانکای ستاندەردی کوردیی چییە؟

کامیار سابیر: شتێک نییە لەسەر زمان پێی بگوترێ دوا وتە، چونکە باسێکە هەرگیز تەواو نابێ و هەمیشەش زمان لەگەشەدایە. بەڵام بەڕێزتان مەبەستتان لەم چاوپێکەوتنەیە، تەنها ئەوەندە دەڵێم، کورد تا گەیشتووە بەم جێگەیە، قوربانییەکی زۆری گیانیی و ماددیی داوە. کوردستانی باشوور لەهەموو بەشەکانی تر زەبری ئەم قوربانییانەی پێگەیشتووە. لە ئێستادا، هەلومەرجی سیاسیی و نێودەوڵەتیی تەنها بۆ کوردستانی باشوور رەخساوە بۆ ئەوەی لەرووی سیاسییەوە زمانی ستاندەردی کوردیی جێکەوت بکرێ و بسەپێنرێ ( بۆیە دەڵێم بسەپێنرێ، ئەمە مێژووی زانستی زمان سەلماندوویەتی، زمانی فرانسیی، ئاڵمانیی، ئیتاڵیی، چاینیی، ئینگلیزیی، تورکیی، عەرەبیی..........تاد ، یان سەپێنراون لەلایەن دەسەڵات و نێوەندێکی سیاسییەوە، یاخود خۆیان بەتواناو هێزی خۆیان سەپاندنی خۆیان مسۆگەر کردووەو دەسەڵاتیش ئۆفیشەڵی کردوونەتەوە).

ئەم سەپاندنە بە واتای مافخواردنی دایەلێکتە کوردییەکان نایات، ئەوەندەی دوور سەیرکردنی ئەجێندا نیشتمانییەکان دەگەیەنێت. ئەوانەی پێیانوایە، زمانی کوردیی ، زمانێکە جووتساندەردە یان چەند ستاندەردە، مۆتیڤی ئایدیۆلۆژیی زیاتر لەپشت بۆچوونەکانیانەوەیە. ئەوانەی پێیانوایە لەپاڵ زمانی ستاندەردی کوردییدا، گیاکەڵەی زاراوەکانیش بچێندرێن و بخوێندرێن، پێچەوانەی ئەو فۆرمە گشتگیر و کۆلێکتیڤەیە، کە زمان بناغەی ئایدێنتیتی نیشتمانییە. دەکرێ زاراوەی کرمانجیی و هەورامیی ( هەورامانیی) و ئەوانەی تر رەنگوڕوویەکی گەش بە زمانی ستاندەردی کوردیی بدەن، دەکرێ سەرجەم زاراوە جیاوازەکانی شوێنە جیاوازەکانی کوردستان بخرێنە خزمەتی لینگوا فرانکای

ستانده‌ردی کوردییه‌وه. به‌لام درێژه‌دان به دوو جۆر پرۆگرامی خوێندن، کورد به‌ره‌و له‌تبوون و دابه‌شبوونی زیاتر ده‌بات. له‌کوردستانی عێراقدا، زمانی کوردیی هه‌رگیز ناکرێ جووتستانده‌رد بێ، جاری کرمانجیی ، له‌باشترین دۆخدا، ده‌کرێ بڵێین دایه‌لێکتێکی ستانده‌ردە، نه‌ک زمانی ستانده‌رد، به‌هه‌مه‌حاڵ ، ئه‌م دوو فلیقانه‌یه له‌زمانی کوردییدا درێژه بکێشێ، کورد به‌ته‌واویی دابه‌ش ده‌بێ و لێکتێگه‌یشتن له‌یه‌کدی که‌مده‌بێته‌وه‌و کرمانجیی ورده ورده به‌ره‌و زمانێکی سه‌ربه‌خۆ هه‌نگاو ده‌نێ و به‌ته‌واویی له‌زمانی ستانده‌ردی کوردیی دوور ده‌که‌وێته‌وه.

کورد گه‌لێکه جینۆساید کراوه، سه‌ره‌ڕای هه‌ڵه‌ی ستراتیژیی ناسیۆنالیزمی کورد و ماڵوێرانییه‌کانی شه‌ڕی چه‌کداریی، گه‌لێکه له‌پێناوی ئازادیی به‌ده‌ستخستندا به چه‌کی کیمیایی ژارباران کراوه، ناسیۆنالیزمی عه‌ره‌بیی و تورکیی و تا راده‌یه‌کیش پانئێرانیزم هه‌میشه کوردیان به‌هۆکاری نائارامیی له‌ناوچه‌که‌دا چوواندوه. به‌لام ئه‌گه‌ر پانعه‌ره‌بیزم و پانتۆرانیزم تراژیدیایان به‌سه‌ر کورددا هێنابێ، پانکوردیزم په‌یامێکی باشتری پێ نییه. پانکوردیسته‌کان، به‌بیانووی دڵراگرتنی هه‌موو تاکێکی کورد له‌به‌رچاوگرتنی هه‌موو پارچه‌کانی کوردستان به‌یه‌ک ئاست، دیواری چین له رشته‌ی زمانه‌وانییدا دروست ده‌کات و زمانی کوردیی دابه‌ش ده‌کات.

ستانده‌ردایزی زمانی کوردیی پێویستیی به‌به‌رنامه‌ی زمانیی هه‌یه، نه‌ک تێکه‌ڵکردنی ئایدیۆلۆژیا و نیۆعه‌شیره‌چییه‌تیی به‌ناوی سکۆلاریزم و زمانناسییه‌وه. دنیا گۆڕاوه، هه‌رکه‌سێ له‌قورسایی و کاریگه‌ریی پێوه‌ندییه نێوده‌وله‌تییه‌کان تێنه‌گات، له مێژووی کورد و خه‌باتی کورد تێناگات، له به‌های زمانی نیشتمانیی و فه‌رمیی و ستانده‌رد تێناگات. مه‌رج نییه ده‌وڵه‌تی سه‌ربه‌خۆی کوردیی تاکه زامنی پاراستنی ئایدێنتیتیی نیشتمانیی و که‌رامه‌تی مرۆیی تاکی کورد بێ. به‌لام له ئێستادا هه‌لێکی زێڕین بۆ کورد هه‌ڵکه‌وتووه، کورد له کوردستانی باشووردا ( کوردستانی عێراق)، نیمچه ده‌وڵه‌تێکه، ده‌وڵه‌تێکی بچووکه‌و له ناو ده‌وڵه‌تێکی گه‌وره‌تردا ( عێراق)، پانکوردیزم ، له‌مه‌ڕ هه‌ڵسوکه‌وتکردن له‌گه‌ڵ هه‌لومه‌رجی سیاسیی عێراق و ناوچه‌که، زیانی له قازانج زۆرتره.

ناکرێ کێشەی کوردی کوردستانی باشوور، ١٠٠% گرێ بدەینەوە بە کوردەکانی باکوورەوە. ئەوانەی بیر لەکوردستانی گەورە دەکەنەوە و بە میتۆدی پانکوردیزم بیردەکەنەوە، بەئەندازەی دوژمنانی کورد زیان بەکێشەی سیاسیی کورد دەگەیەنن. بمانەوێ و نەمانەوێ کورد لەیەکتر جیاکراوەتەوە، وەک خۆم پێموایە، زۆر ئەستەمە کوردستانی گەورە لای کەم لە داهاتوویەکی نزیکدا بێتە دی، چەند دەوڵەتانی عەرەب یەکدەگرن و یەک وڵاتی عەرەبیی دروست دەکەن، هەر ئەوەندەش چوار پارچەی کوردستان یەکدەگرێتەوە! کەواتە ئەو لینک دروستکردنە لەنێوان زمانی ستاندەردو زاراوەی کرمانجییدا، وەک ئەجێندایەکی پانکوردیستیی زیان بەزمانی کوردیی و داهاتووی سیاسیی و ئایدێنتیتیی نیشتمانیی کورد دەگەیەنێت. دەسەڵاتی سیاسیی کورد، ئەوەندە کاریزمایی تێدا نەبێ لە کوردستانی باشووردا، زمانی ستاندەردی کوردیی ساغ بکاتەوە، ئەوە سەرکردە خۆخۆرەکانی کورد، چۆن ئیرادە دەکەن، کورد ببێ بەیەک نەتەوەو یەک وڵات؟ بەڕاستیی گێلییەکی خۆشە، مرۆڤ خەونی لەم چەشنە ببینێ.

پارچەکانی کوردستان لە دوور مەودادا بۆی هەیە بەجیا سەربەخۆیی بەدەست بهێنن، بەڵام ئەستەمە یەکبگرنەوە. بەدڵنیاییشەوە، زمانی ستاندەردی کوردیی هەنووکە دەکرێ بەیارمەتیی زاراوەکانی تر بەهێزبکرێ و بگشتێندرێ. بەڵام هەرگیز زمانی ستاندەردو هیچ زاراوەیەک ناکرێ پێکەوە لەیەک هەرێمدا کاروباری کولتووریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی بەڕێوە بەرن. هەرگیزاوهەرگیزیش ناکرێ ئەم دووانە تاسەر بەم گەڕەلاوژەیە درێژە بدەن. لەدوور مەودادا، ئەگەر ئەم خەڕەکە هەر بەردەوام بێ، دوو زمانی جیاواز دروست دەبێ، ئەمەش سەرەتای شەقبوونی یەکجاریی نەتەوەی کوردە، کورد ئەگەر دوو زمانی نووسینی هەبێ، هەرگیزاو هەرگیز وەک یەک نەتەوە سەیر ناکرێ، ئەوسا دەبین بە کورد و کرمانجیی. خاوەنی دوو زمانیش دەبین، زمانی ستاندەردی کوردیی و زمانی ستاندەردی کرمانجیی ( ئەگەر کرمانجیی بشتوانێ ببێ بەزمانی تێکستی کرمانجییەکان، کە دیارە لە دوور مەودادا ئەمە ساغ دەبێتەوە ) .

- ٨ -

## کوردستانی باشوور یان باشووری کوردستان؛

## هەڵەیەکی سیاسیی گوێڕانە

ئەم نووسینە، تەنها بۆ ئەوە لەگەڵ ئەم کتێبەدا دادەنێمەوە، چونکە لە کۆی باسەکانی ئەم کتێبەدا چەمکی کوردستانی باشوور بەکارهاتووە. ئەم وتارە باسی ئەوە دەکات کە کوردستانی باشوور بۆچیی لەباشووری کوردستان دروستترە.

گرنگیی نووسین زۆرتر لەوەدایە، مرۆڤ هەموو ئاوەزو هۆش و ئاگایی بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی بیروبۆچوونی بخاتە سەر کاغەز و بە نووسین دەریانبڕێت. لەم بوارەشدا نووسەر هەوڵدەدات، وشەکان ، رستەکان، پارەگرافەکان و تەواوی کۆنتێکستەکەی بە باشترین فۆرم و ستایل بنووسێ. یەکێ لەو تێرمانەی زۆر بەبەردەوامیی دووبارە دەبێتەوە، چۆنییەتی میکانیزمی دابەشبوونە سیاسیی وجیۆگرافییەکانی پارچەکانی کوردستانە. ئەوەی جێگەی سەرنجە، هەندێ جار باشترین و ناسراوترین نووسەرانی کورد، باشترین

میدیای کوردیی و بەربلاوترین رۆژنامە، هەفتەنامە و گۆڤارەکانی کوردستانیش ئەم هەڵە زەقانەیان بەسەردا تێدەپەڕێ.

کوردستانی باشوور( South Kurdistan )، دەچن بە باشووری کوردستان Southern Kurdistan دەینووسن. ئەمە نەک هەر هەڵەیەکی زمانەوانییە، بەڵکو هەڵەیەکی سیاسیی، جیۆگرافیی و جیۆسیاسییشە. کاتێ باشووری کوردستان دروستە، ئەگەر تەواوی خاکی کوردستان وەک یەک قەوارەی سیاسیی و جیۆگرافیی فەنکشن بکات. لەوەش گرنگتر، ئەوەیە تێرمی کوردستانی باشوور تێرمێکی سیاسییە، بەڵام باشووری کوردستان تێرمێکی جیۆگرافییە. باشووری کوردستان، دەکرێ بەشێکی کوردستانی رۆهەڵات و کوردستانی باکوور و کوردستانی سووریاش بگرێتەوە. چونکە ئەم تێرمۆنۆلۆجییە بۆ ناوچەی جیۆگرافیی بەکاردەهێنرێت، نەک بۆ مەبەستی سیاسیی و سنووری قەوارە سیاسییەکان. بەڵام کاتێ بەکردەوە، لەرووی سیاسیی و جیۆگرافیی و پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان و بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، کوردستانەکان دابەشکراون بەسەر چوار وڵاتدا، ئەوکاتە نەدانیی و نەزانییەکی کوشندەیە، بە فانتەسیی(فەنتازیا) بڵێین، باشووری کوردستان، یان رۆژهەڵاتی کوردستان و باکووری کوردستان.

لەباری سیاسیی و نێودەوڵەتییەوە، راستییەکەی کوردستانی عێراق، کوردستانی ئێران، کوردستانی تورکیا و کوردستانی سوریا دروستترن. بەڵام چەمکی کوردستانی باشوور ، کوردستانی رۆژهەڵات و کوردستانی باکوور خەریکە وردە وردە جێکەوت دەبێت، ئەوە جگە لەوەی لەسەرەتای کۆلۆنیالیزمی ئینگلیزیی و پێشتریش لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانییدا، سکۆلارو رۆژهەلاتناس و کوردناسەکانی رۆژئاوا، کەم تازۆر ئەم چەمکانەیان(بەتایبەت کوردستانی باشوور)بەکارهێناوە. تا هەنووکەش لە بەرزترین ئاستی ئەکادیمییدا بەکاردەهێنرێن. بەڵام کاتێ باشووری کوردستان بەکاردەهێنرێت، ئاماژە بە رۆژگارێکی سیاسیی و هەرێمێکی جیۆگرافیی دەکرێ ، کە بەشی هەرە زۆری لەژێر قەڵەمڕەویی عوسمانییەکاندا بووە.

بۆ نموونە لە نوێترین توێژینەوەی Michael Eppel دا لەسەر فەوتانی میرنشینە کوردییەکانی سەدەی نۆزدەیەم لە ژۆرنالی Middle Eastern Studies دا ( خولی ٤٤ ، ژمارە ٢ ی مارسی ٢٠٠٨ ) دا، دەربڕینی

Southern Kurdistan بەکاردەهێنێت. بەڵام خوێنەر هەست دەکات بۆ رابردوویەک بەکاری دەهێنێت لە "باشووری کوردستان" ناوچەیەکی بەرفراوانتری مەبەست بووە وەک لەو سنوورە سیاسییەی لە کوردستانی باشووردا هەیە. بەدیدێکی سیاسییەوە، کوردستانی باشوور، ئەو قەوارە سیاسییە دیفاکتۆیەیە کە لەحکومەتی هەرێمی کوردستاندا خۆی دەبینێتەوە، بەداخەوە کەرکوک و ناوچە تەعریبکراوەکانی تریش هێشتا لەرووی سیاسییەوە بەشێک نین لە کوردستانی باشوور، خۆشییمان بوێ یان ترشیی ئەمە راستییەکی سیاسییە.

لەڕووی سیاسییەوە، نەک جیۆگرافییەوە، چەند نموونەیەکی جیهانیی وەربگرین، ناگوترێ و نانووسرێ باشووری کۆریا، یان باکووری کۆریا، لەکاتێکدا ئەم وڵاتە( کۆریا) لەپەنجاکانی سەدەی رابردوودا لەنێوان بەرژەوەندییەکانی ئۆردووی سۆڤێت و ئەمێریکادا دابەشبووە، بەڵکو دەگوترێ کۆریای باشوور و کوریای باکوور ( South Korea and North Korea )، جاران نەدەگوترا، رۆژهەڵاتی ئاڵمانیاو رۆژئاوای ئاڵمانیا، بەڵکو دەگوترا و دەنووسرا ئاڵمانیای رۆژهەڵات و ئاڵمانیای رۆژئاوا ( East Germany and West Germany ). بە وڵاتی ئافریکای باشوور ( South Africa ) ناگوترێ باشووری ئافریکا، چونکە کاتێ دەنووسرێ باشووری ئافریکا، واتای، بەشی باشووری سەرجەم کیشوەری ( Continent) ئافریکا دەگەیەنێت، ئەمەش دەیکات بەدەستەواژەیەکی جیۆگرافیی و تایبەتمەندییە سیاسییەکەی دەدۆڕێنێت.

ئەم کۆنسێپتی باشوور و باکوورە ، ، زۆرتر ئاڵۆز دەبێ، کاتێ نموونەی بەشێک لە خودی وڵاتەکە وەردەگیردرێ، بۆ نموونە، لە ئوستراڵیا، یەکێک لەستەیتەکانی ناسراوە بە South Australia ، لێرەدا دەکرێ کاتێ بۆ زمانی کوردیی وەریبگێڕین، بڵێین باشووری ئوستراڵیا( تەنێ لەڕووی جیۆگرافییەوە)، چونکە بەشێکە لەوڵاتێکی گەورەتر، کەناوی ئوستراڵیایە. بەڵام، بەبەڵامێکی زۆر وریایانەوە، لەڕووی سیاسییەوە دەبێ بگوترێ ئوستراڵیای باشوور، چونکە پارلەمان وحکومەت و یاساو سنووری دیاریکراوی خۆی هەیە. یاخود کاتێ دەنووسرێ South America، مەبەست لە کیشوەری ئەمێریکای باشوورە، کەواتە باشووری ئەمێریکا، زۆر ناقۆڵایە. تەنانەت ئاماژەیە بۆ پارچە

جیوگرافیایەکی تر کە دەکەویتە بەشی باشووری خودی ولاتی ئەمێریکاوە نەک کیشوەری ئەمێریکای باکوورەوە کە بڕیارە بە ئەمێریکای باشوور کاتوگەرایز بکرێ.

پانکوردسیتەکانی کورد، خەریکە مالی کورد لەناو زمانەکەیەوە ویران دەکەن. ئەم کۆنسێپتە ناسیۆنالیستییە منداڵانەو هەرزەکارانەیە( باشووری کوردستان)، کۆنسێپتی ئەوانە، بەلام بەداخەوە زۆر نووسەری دانسقەو توێژەری کوردیش بەسەریاندا تێدەپەڕێت. ئەم پانکوردیستانە، دروست وەک ئاوەزی پانعەرەبیستەکان، ناسرییەکان و بەعسییەکانی پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی رابردوو لەسەر مەسەلەی نەتەوەییبوون بیر دەکەنەوە. بەعسیزم و ناسریزم و پانعەرەبیزم چەند خزمەتیان بە ئەجێندای سیاسیی نەتەوەی عەرەب کرد ئەمانیش هەر ئەوەندەی بۆ کورد لێ هەڵدەکرێن. بەواتایەکی تر، ئەو ماڵوێرانییەی بەعسیزم و ناسریزم و پانعەرەبیزم بەسەر نەتەوەی عەرەبدا هێنایان، هەمان چارەنووسیش بەسەر کورددا دێت، ئەگەر جلەو بکەوێتە دەست پانکوردیستە نەدانەکانی کورد.

ئێستا بەهۆی ئاوەزو بیرکردنەوەی هەندێ پانکوردیست و عاشق بە سکریپتی لاتینیی تورانیزم، خەریکە کۆمەڵێ تیپی ( پیت) کوردیی بکەونە مەترسییەوە، قۆناغ دەکەن بە قۆناخ ، قەدەغە بە قەدەخە ، بەغداد بە بەخداد، ساباڵاغ بەسابڵاخ ، عوسمانییەکانیش دەکەن بە ئۆسمانییەکان، یان هەندێجار بەبۆن و بەرامەی پانتورانیزمەوە دەیکەن بە ئۆسمانلییەکان، گەلۆ ئەم ماڵوێرانانە ئەردۆغان ( ئەردۆگان ) یش دەکەن بە ئەردۆخان، چونکە لە سکریپتە سەقەتەکەی جەلادەت بەدرخاندا، دەنگەکانی غ و ع و ح ...تاد نییە. لەکاتێکدا زمانی کوردیی، رەگێکی هیندۆئەورووپایی و ئێرانیی هەیەو هەرگیزاو هەرگیز ناکرێ بەسکریپتی لاتینیی-کەمالیزم بەتەواویی و پڕبەپێستی دەنگەکانی بنووسرێتەوە ( ئەگەر بکرێ لەداهاتوودا بەدرێژیی لەسەر خۆرەی ئەو سکریپتە لاتینییە تورکییە دەنووسم). ئەم سکریپتە کوردیی-فارسییەی( سکریپتی ئارامیی نەک عەرەبیی ) ی هەنووکە زمانی کوردیی پێ دەنووسرێتەوە هەزار جار گونجاوترو دروستترە تا بە سکریپتە بێماناکەی لاتینیی -کەمالیزم دەگات.

سەرئەنجام، کوردستانی باشوور ، کوردستانی رۆژهەلات، کوردستانی باکوور، دەستەواژەگەلێکی دروستترن لەرووی سیاسیی، جیۆسیاسیی و زانستی پێوەندییە نێودەڵەتییەکانەوە، نەک بەپێچەوانەوە. کوردستان بەهەموو پێوەرە سیاسییەکان کەوتووەتە، نێو جیۆگرافیای چوار دەوڵەتی داگیرکارەوە، یان لای کەم چوار دەوڵەتی چێکراوەوە، تەنها ئێرانی لێ دەرچێ، لەسەر لاشەی سەفەوییەکان وەک میراتگر ماوەتەوە، ئەگینا تورکیاو سوریاو عێراق، بەرهەمی راستەوخۆی پۆست جەنگی جیهانیی یەکەم و داغانبوونی عوسمانییەکانن.

بەلام لە ئاستی جیهانییدا تا ئەم ساتەش بەپێی پێوەرە نێودەوڵەتییەکان، هەر پارچەیەکی کوردستان بەشێکە لەو ولاتانە. کەواتە تێرمی کوردستانی باشوور ، یان لەخراپترین دۆخدا، کوردستانی عێراق بەهەموو لۆژیکێک لە ئاوەزی پانکوردیستەکان و باشووری کوردستان دروستتر و ساغلەمترە. بەدەیان ئارگیومێنتی سیاسیی تر دەسەلمێنرێ، کوردستانی باشوور ١٠٠% چەمکێکی سیاسیی، کاتەگۆرییەکی سیاسیی و جیۆسیاسیی خشتەو بۆ هەلومەرجی کوردستانی عێراق، پڕ بەپێستی خۆیەتی، لەکاتێکدا باشووری کوردستان، تێنەگەیشتنە لە چەمکە سیاسیی و هەلومەرجە نێودەولەتییەکان، نغرۆبوونە لە نەزانیی و نەدانییدا، کورد گوتەنی ˙گاڕانێکە لەو گۆڕەی˙.

( ٩ )

## (( ئیستێتیكی زمانی كوردیی، ئاسۆی بەكارهێنانەكانی ))

" **تا ئێستا كەس لە گرامشی( Gramsci ) باشتر نەوتووە................ لەسەرێكەوە تووشی ڕەشبینی دەبیت لە بەتوانایی و زیرەكیی ئەو، لە سەرێكی تریشەوە، لەهەوڵەكانیەوە تووشی گەشبینی دەبیت** "

[1] ( Chomsky, 1992b,p.354 )

---

[1] چۆمسكی لەسەناكردنی زمانی گرامشیدا

Chomsky, N (1992b) Explaining Language Use, Philosophical topics

لە دوو توێی كتێبی ( Chomsky , ideas and Ideals ) لە نووسینی پرۆفیسەر ( Neil Smith )، سەرپەرشتیاری بەشی زمانەوانیی لە زانكۆی ( College London ).

ئەم نووسینە، توێژینەوەیەکی کورتە لەمەڕ بەکارهێنانی زمانی کوردیی و کۆنسێپتە جێگیر و ناجێگیر و داتا( Data ) کانیدا، سەرکۆنەکردن و رەخنەگرتنە لە کۆنسێپتی مینەمەڵیزمی ( Minimalism )١ کوردەواریی و ئاڵ و وێڵی زمانەوانیی لەسەردەمی گڵۆبالیزەیشندا. لە روانگەی چۆمسکییەوە هەمیشە "دیزاینی ( design ) زمان خوازیاری رێسایەکە کە وردەکاریی و چارەسەرییەکەی بێ - هاوتا( unique ) بێت"٢. جوانناسیی ( ئێستێتیک یان ئێستەتیک– Aesthetic - Esthetic ) زمان بەبێ چارەسەرییەکی ریشەیی و رێسایەکی کۆنکریت لەبەکارهێنانییدا، دەبێتە یاریی منداڵانەو هەموو کەس گێچەڵی پێدەکات. بەپشت بەستن بە تێڕوانینی چۆمسکی ، ئەم بابەتە پێیوایە زۆربەی نووسین و دەستڕەنگینی نووسەرانی کورد دەچێتە خانەی گومانێکی قووڵ و کاری دانسقەییش دەکەوێتە ژێر پرسیارگەلێکی بێبەزەییەوە.

نووسین لە راستییدا، ئەندازیارییەکی ورد و پێوانەگەلێکی زۆر دانسقەی دەوێت. بەپێچەوانەی ئەوەی لە نێو نووسەرانی کورددا باوە، هەرچی هەڵدەستێ، دەبێ بەنووسەر. ئەستەمە ئەگەر خوێنەرێک وریا و نوێخواز و ئاشنا بێت بە ئەدەبی گەلانی تر و گەلانی رۆژئاوا بەتایبەتیی، بتوانێ و پشوودرێژیی ئەوەی هەبێ نووسینی هەندێ لە نووسەرانی ئێستای کورد بخوێنێتەوە. دیارە ئێمە وەک کورد ژمارەیەکی کەم بیریار ( بیرمەند) مان هەیە ، بەڵام ژمارەیەکی زۆر رۆشنبیرمان هەیە. جیاوازیی سەرەکیی بیریار و رۆشنبیریش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، رۆشنبیر وێڕای ئەوەی مەعریفەکەی هی دەستی دوو یان سێیە، هەمیشەش حەزدەکات لەهەموو مەنجەڵێکدا ئەسکوێ بێت و لەسەر هەموو شتێ بنووسێ و بەرهەمی زۆری هەبێ و بەردەوام ناوی بهێنن و پێیدا هەڵبدەن. هەرچی بیریارە، گۆشەگیرو دابڕاو و کڕە، حەز بەتێکەڵیی ناکات و زۆرتر خەریکی خوێندنەوەیەو کەمتر دەنووسێت. ئەوەی کورد هەیەتی تا ئێستا دەکرێ بڵێین دەریایەک رۆشنبیرو نووسەری هەمەجۆری هەیە، بەڵام بەژمارەی پەنجەکانی یەک دەست، بیریارمان نییە.

وێڕای ئەم دوو کاتەگۆرییە جیاوازە، لە کێڵگەو پراکتیکی نووسیندا، ئەگەر نووسینێک بەزمانێکی جوان و بەرز و ئەدەبیی نەنووسرابێ ، چوون بەلایدا

---

[1] پەرگیریی و کۆنپاریزیی لە ئەدەب و کاری هونەرییدا

[2] Chomsky,1995,p.132

لەسەریەشە بەولاوە شتێکیتر بەخوێنەری باش و وریا ناگەیەنێ. دەکرێ لەم تێڕوانینە گشتییەدا هەندێ نووسەری خاوەن بەهرەو بەرچاوڕوشن و ڕۆشنبیری خاوەن خەزێنەیەکی باش لە زانین ( knowledge ) و شارەزا بە ژانری نوێ جودابکرێنەوەو نەکەونە بەر ئەم کاتەگۆرییانەوە. بەواتایەکی تر ئەگەر خوێنەر ئازارێکیشی پێبگات لە ئەنجامی خراپیی زمانی نووسینەکانیانەوە، ئەوا خۆشیی ئەوەی پێ دەگات کە کۆمەڵی شتی نوێ فێر دەبێت . هەر هیچ نەبێ خوێنەر هەست بەوە دەکات نووسەر لەگێرفان و "عیرفان" ی خۆیەوە شتی هەڵنەهێنجاوە، بەڵکو لەئەنجامی ماندووبوون و گەڕان و خوێندنەوەی فراواندا شتێکی نووسیوە.

لەدوای راپەرین و بەتایبەت لە دوای رووخانی رژێمی بەعسەوە ، شەپۆلێکی گەورەو بەرفراوان لە وشەی بیانیی روویان کردووەتە ناو زمانی کوردییەوە، بە ئارەزووش هەرکەسەو بەپێی ویست و خولیاو حەزی خۆی سپێڵی وشەکان و ناوەکان دەکات. زمانی کوردیی، لاوازیی زۆری پێوەدیارە، بەتایبەت کاتێ دەقێکی کوردیی ، بۆ زمانێکی بیانیی وەردەگێڕدرێ، یان بەپێچەوانەوە. کەموکوڕییەکانیش لە دوو بەشی سەرەکییدا پۆلێن دەکرێن. یەکەمیان، دەستکورتییمان لە چەندییەتیی و چۆنییەتیی وشەدا ( Vocabulary ) ، دووەمیشیان، دەستکورتییمان لە دەربڕینی دەستەواژەی تێروپڕ لە شوێن و کاتی جیاوازدا. ئەم نووسینە پێیوایە،کارێکی باشە هێنانی وشەی بیانیی ( نەک عەرەبیی و فارسیی و تورکیی )، بەڵام بە شێواز و ستاندەردێک کە نە زمانی کوردیی تێکبدات و نە گیانی ئەو تێکەڵکردنەش بکوژێ. مەبەستیش لە زمانی بیانیی بە پلەی یەکەم، زمانی ئینگلیزییە.

ژۆسێ مەدینا( Jos Medina ) دەڵێ: " زمان هێزێکی دوو جەمسەریی هەیە، دەتوانێ یەکمان بخات و دەشتوانێ پەرتمان بکات"[1]. یەکبوون لە بەکارهێنانی کۆمەڵێ چەمک و پرەنسیپی زمان و داتاکانی زماندا، پەرتبوونیش بە خوێندنی هەرکەس لە ئاوازێک و پاشاگەردانیی و بێسەرەوبەرەیی لەبەکارهێنانی زماندا. ئەم کورتە باسە لێرەدا لەسەر بۆچوونی ئایدیۆلۆژیی و فەلسەفیی، کۆنسێپتە فەلسەفییە جیاوازەکان راناوەستێت، ئەوەندەی لەسەر داتا

[1] - ( Medina, 2005,p.115)

و کۆنسێپتە بنچینەییەکانی خودی ئیستێتیکی زمان و فیاسکۆی( Fiasco )[1] بەکارهێنانەکانی دەوەستێت.

وشەی ئەتککراوی بیانیی لە فیاسکۆی زمانی کوردییدا، خەریکە ببێتە مۆدێلێک، زۆر نووسەر بۆ دەربڕینی ناخی خۆی پەنای بۆ دەبات و هەندێ جاریش ئەوەندە خراپ رێنووسەکەی دەنووسێتەوە، وەک مەتەڵی لێ دێت. زۆر ئەستەم دەبێت ئەم جۆرە وشەو ناوە هەڵشەپێنراوانە، بدۆزرێنەوە و خوێنەر بچێتەوە سەر رەچەڵەکی ئەو زمانەی کە لێوەیان وەرگیراوە. زۆر گرنگە کاتێ ناوێکی بیانیی ، بەتایبەت ناوی نووسەری بیانیی کە دەخرێتە دەقی کوردییەوە، پێویستە وێڕای ئەوەی بە کوردیی بنووسرێت، بە ئینگلیزیی یان بە شێوەیەکی گشتیی بە لاتینیی بنووسرێ.

بەختیار عەلی لە یەکێک لە وتارەکانیدا بە سەردێڕی "لەستایشی ئازادییدا"[2] ، ناوی سێ کەسی بیانیی دەهێنێ و کووتەیشنی ( دەستەواژە وەرگرتن _ Quotation ) لێوەرگرتوون. مردم و سووتاوم یەکێکیانم نەدۆزییەوە، کریشنامۆرتی( Uppaluri Gopala Krishnamurti ) و رۆبێرت موزیل ( Robert Musil ) نەبێت. ئەمەی دوایین لەرێی سەردێڕی رۆمانەکەیەوە( Man without Qualities ) زانیتم کێیە. هاوکات بەختیار نازناوی کریشنامۆرتی بە دوو ناوی دابڕاو نووسیوەو دەبووایە بەیەک ناو بینووسێت. لەلایەکی ترەوە خوێنەر سەری لێ تێک دەچێ ئاخۆ ئەم کریشنامۆرتییە کام( کریشنامۆرتی) ە. چونکە Krishnamurti, T. N. (Tiruvalam Natarajan) هەیە و Krishnamurthy, Goteti Bala. یش هەیە. جودا لە دەیان کریشنامۆرتی تر،

ئەم ناونووسینە لە نێو کەوانەیەکدا یارمەتی خوێنەر دەدات، تا سەرنجی بچێتەوە سەر نووسینەکانی نووسەری کۆوتەیشن لێوەرگیراو، ئەگەر ئاشنایەتییەکی پێی هەبێ، یان ئەگەریش نەیبێ ، بۆ گەڕان بەدوایدا کارئاسانیی

---

[1] - فیاسکۆ بە واتای هەرەسی تەواو، دۆڕانی تەواو دێت.

[2] - بەختیار ئەم وتارەی لە "هاوڵاتی" دا نووسیوە، بەڵام بەداخەوە لەبەر ئەوەی وێبسایتی هاوڵاتی ، ئارکایفەکەی تەواو ریکۆرد نەکراوە، ئەمدۆزییەوە لە چ ژمارەیەکدا، بەڵام هەمان وتار لە دەنگەکاندا بڵاوبووەتەوە، کە ئەوانیش لەهاوڵاتییەوە وەریانگرتووە.
http://www.dengekan.com/doc/2007/5/bakhtyarAli3.pdf

بۆ دەکات. لە نێو نووسەرانی کورددا، فاروق رەفیق لە کەنەدا و د. محەمەد کەمال لە ئوستراليا، پیرۆی ئەم ستاندەردە دەکەن و زۆربەی کات ناوی کەسە بیانییەکان یان زاراوەکان لە کتێب و نووسینەکانیاندا بە ئینگلیزیی دەنووسنەوە، کە گومانی تێدا نییە کاریکی زۆرباشە. لەلایەک چێژ دەدات بەخوێنەر و گومانی لە هەڵپێچان و سەرچاوە و دروستیی ناوەکە نامێنێ و لەلایەکی تریشەوە سەری خوێنەر نایەشێنێ و کاتێکی زۆر بۆ خوێنەر دەگێڕێتەوە.

چەند ساڵێ لەمەوبەر ویستم لە رێی نێتەوە هەندێ زانیاریی لەسەر بێرنارد شۆو ( Bernard Show ) بەدەست بهێنم، لەراستییدا نەمدەزانی سپێلی ناوی ئەم کابرایە بەئینگلیزیی چۆن دەکرێ؟ ئاخر لۆمەی کوێی خۆمان بکەین؟ کولتوورو رۆشنبیریی عەرەب، سەری لەهەمووومان تێکداوە. عەرەب دەنووسێ "برنادشو" ، لە باشترین دۆخدا دەمانکردە بەرنادشۆ، مەگەر هەر جنۆکە بزانێ ئەگەر لێکچوونێک لەنێوان بەرنادشۆ و (بێرنارد شۆو - Bernard Show ) دا پەیدا بکات. ئەمە زۆر ئازاریدام، هەستام لەچەندین کەسی تریشم پرسی هەر نەیانزانی.

ئەم دەردی نەزانییە، پێوەندیی راستەوخۆی بەو پردە ئەفسووناوییەوە هەیە کە رۆشنبیریی کوردیی بەستووەتەوە بە رۆشنبیریی عەرەبییەوە. سەیری ئەو گاڵتەجارییە! نووسەرێکی دەسترەنگینی وەک رەئوف ( رەووف) بێگەرد رۆمانێکی بیانیی ( زۆربا—ZORBA )[1] لە وەرگێڕدراوە فارسییەکەوە دەکاتە کوردیی، کەچیی کاکی نووسەری کورد دێت رەخنەی لێدەگرێت و دەڵێت، ( الاستاذ الكبير والمؤرخ العظيم جورج طرابيشي ) بەشێوەیەکی تر وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیی. واتە دەقە عەرەبییەکە لە فارسییەکە، رەسەنیی زۆرتری پێوە دیارە . بۆ نا، مەگەر عەرەبیی، زمانی قورئان نییە! زمانی خواوەند و ئەنفال نییە! ئای " دنیایەکی سەیرە گوڵم"، باکگراوندی رۆشنبیرییەکەمان چەند فشۆڵە، ئەم بابەتە پێویایە، ئەستەمە پەنجا عەرەب لە وڵاتانی عەرەبییدا پەیدا ببن و بتوانن سادەترین وشە، لەچەشنی (

---

[1] هاوڵاتی ژمارە ٣٢٩، لا ١٤٧ ، ٦-٦-٢٠٠٧

For ) فۆ، وەک خۆی بخوێننەوەو نەڵێن فۆڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕ! چ جای ئەوەی نووسەرانی عەرەب شاکار وەربگێڕن بۆ عەرەبیی و ئێمەش بە سەرچاوەی باوەڕپێکراو ئەژماردی بکەین.

ئێستا ئەوەندە بیریارو سکۆلار(Scholar) و رووناکبیرو رۆمانووس و شاکارنووس پەیدابوونە، کە هیچ کەس ناتوانێ فریای خوێندنەوەی یەک لەسەدی ئەو هەموو ئەدەبیاتە جۆراوجۆرانە بکەوێ. کەم کەسیش ئەو توانایەی هەیە لە زۆر رشتەی جیاوازدا بتوانی گێرمە بکات و بواری جیاواز جیاواز ئەمدیوەودیو بکات. ئەم کارە دانسقانە بۆ کەسێکی وەک چۆمسکی دەشێ، لەیەک کاتدا ئایکۆنێکی دیار بێت لەنێو سکۆلارەکاندا و هاوکات بیریار و فیگەیەکی(فیگەر) گەورەی مۆدێرن بێت و لەولاشەوە زۆر لێهاتووانە ئەسپی خۆی لەهەریەک لەبوارەکانی فەلسەفە، ئەنسرۆپۆلۆجی، ماتماتیک، پەروەردە، رەخنەی ئەدەبیی و زمانەوانیی و سایکۆلۆژییدا تاو بدات و بەرجەستەی بکاتەوە.

بەلام کاتێک نووسەرێکی ئێمە کە دیارە باکگراوندی تیۆریی و رۆشنبیرییمان چەند سنووردارە، بە حونجەی کوردیی، ناوێکی بیانیی دەنووسێ، زۆر ئەستەمە بتوانرێ فۆنەتیکی ئەو ناوە وەک خۆی دەربکرێتەوە و بکرێت بە سکریپتی عەرەبیی. ئەگەر ئەم کارە بە لاتینیی یان دروستتر بە ئینگلیزیی بنووسرێ، هەموو کەس دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ سەر پرۆفایلی ( profile ) ئەو کەسەو بەدوای سەرچاوەو تێکست و دەستەواژەکەیدا بگەڕێت.

سەبارەت بە کۆوتەیشن وەرگرتن، هەندێ کەس بەبێ هیچ بۆنەیەک بۆ بەبەهێزکردنی بابەتەکانیان، تێکستی کەسانی بیانیی دەئاخننە نێو دەقی نووسینەکەیانەوەو هیچ ئاماژەش بەسەرچاوەی لێوەرگرتنەکە ناکەن. ئەوە لەبەرچاو دەگیردرێ لە دووتوێی وتاری رۆژنامەیەکدا ناکرێ ئاماژە بەسەرچاوەکان بدرێ. جا ئەگەر لەبەر ئەوە بێت رۆژنامەکە ئەمە بە زیدەڕۆیی بزانێ ، یان ئەوەی جێگەی زۆرتر دەگرێ و پێویستیی نییە بخرێتە دوای بابەتەکەوە. بەلام گرفتەکە هەر رۆژنامە نییە، لە ژۆرنالەکانیشماندا، کتێبەکانیشماندا ئەم بێدەربەستییە هەیە. خۆ هەر هیچ نەبێ دەکرێ لەچوارچێوەی ئەو وتارانەدا بنووسرێ کە لە سایتەکاندا بلاو دەکرێنەوە. بەڕاستیی نەک هەر شەرمە، کۆوتەیشن لە خەڵک وەرگری و خوێنەر نەبەیتەوە

سەر سەرچاوە سەرەکییەکە، بەڵکو ئەمە گەندەڵییەکی دنیای نووسینە و نووسەری کورد، کەم هەست بەزیانەکانی دەکات.

هەر لەپێوەند بە کۆوتەیشن وەرگرتنەوە، هەندێ کەس شارەزاییان لە گەڕانی( سێرچ - Search ) ئیلیکترۆنیی وەرگرتووەو کۆوتەیشنی کەسە ناودارەکان وەردەگرن و بەزۆرداریی دەیخزێننە نێو پارەگرافەکانیانەوە، بێئاگا لەوەی کە خوێنەری وریا دەزانێ ئێستا لە ئینتەرنێتدا هەزاران سایتی پرۆفێشناڵ هەیەو وتە بەنرخ و پڕبەهاکانی هەندێ زانا و نووسەر و بیریاریان داناوە. کاک یان خاتوونی نووسەری کوردیش دەچێ خۆی پێدا دەکات و یەک دووانێکی هەڵدەبژێرێ و دەیکاتە پەیین بۆ نووسینەکەی. ئاخر ئەمە فڕوفێڵ و کڵاولەسەرکردنێکی رووتوقووتە! لەکاتێکدا ئەو کۆوتەیشنسازییە هیچ پێوەندیی بە ناوەڕۆکی بابەتەکەوە نەبێ.

پێش هەموو شتێ، لاوازترین سەرچاوە، سەرچاوەی نێتە، هیچ وتار و لێکۆڵینەوەو کتێبێک لەسەر تۆڕی نێت ئەو بایەخەی نییە، ئەگەر لەلایەن دەزگایەکی چاپ و پەخشەوە بڵاونەکرابێتەوە. گریمانی ئەوەش وەربگرین و بڵێین لەسایتێکی پرۆفێشناڵدا بوونی هەیە، هێشتا لە ستاندەردی سکۆلاریی و ئەکادیمییدا ئەو کرێدتەی نییە. کەواتە کۆوتەیشنکردنەکە ئەگەر دزیی نییە دەبێ ئاماژە بە سەرچاوە سەرەکییەکە بدرێ. ژمارەی لاپەڕەکەو ناوی دەزگای پەخشەکەو ناوی تەواوی نووسەرو ساڵی بڵابوونەوەی و تایتڵی بابەتەکەو.... تاد وەک خۆی بنووسرێتەوە، ئەوسا چوار کەسیش ئامێن ( Amen )ی پێ دەڵێن. بێدەرەتانییەکی تر ئەوەیە، لەهەندێ نووسینی باشیشدا، نووسەر بەوەندە دەوەستێ و دڵی ئاو دەخواتەوە کە لینکی سەرچاوەکە تەنها بە شێوەی ( URL ) دەنووسێ، نایات کەمێک خۆی ماندوو بکات و بەشێوازێکی هاوچەرخ، وردەکاریی لینکەکە شیبکاتەوە لەپەراوێزی نووسینەکەیدا.

زۆرجار هەندێ کەس رەخنەی ئەوە دەگرن و دەڵێن ئەمە زۆروبۆرییە کە ناوە بیانییەکان بە زمانە ئەوروپاییەکان دەنووسرێن و هەندێک زۆرتریش دەڕۆن و دەڵێن ئەمە پیشەسازیی فشەو فشەکارییە. بەڵام لە راستییدا، زۆر زۆرگرنگە سکریپتی ناوەکان ، بەتایبەت ئەو ناوانەی کەمبیستراون، یان ئەو وشانەی کە تازە دێنە نێو زمانی کوردییەوە بە سکریپتەکەی خۆیان بنووسرێن.

پیشەسازیی راستەقینەی فشەبازییش ئەوەیە، کە شتێک لەتوانای خۆمان بەدەر بێت و شەڕیش بفرۆشین و فشەش بەنەزانییەوە بکەین.

سەیری وشەی "رۆشنبیر" بکە، کێ هەیە لە نێو کورددا، ئەگەر خوێندنی شەشی سەرەتایی تەواو کردبێ و بەخۆی نەڵێ رۆشنبیر، جا ئەوەی ئامادەیی و رشتەی خوێندنەکانی تری لەچەشنی پەیمانگا و زانکۆکان تەواو کردبێ، خۆ زمانت بەبڕین دەچێ ئەگەر پێی نەڵێی رۆشنبیرە! تەنانەت ئەگەر بەکابرایەکی نەخوێندەوار کە هارەی لەبڕەی نەکاتەوە، بڵێی تۆ پیاوێکی تێگەیشتوو ، رۆشنبیر و دنیادیدەی، نالێ ناماقوولییت فەرموو! بەڵکو بسکەی سمێڵی دێت. وەلێ ئەگەر بڵێی تۆ پێویستە باشتر گوێ بگری و کەمێک وردبەو بیربکەرەوە ، ئەوسا بڕیار بدە، بێئەملاو ئەولا دەیکێشی بە دەمتا. ئەمە هەستێکی خۆهەڵنان و لەخۆباییبوونێکی بێ بناغەیە کە هەموو تاکێکی ئێمەی گرتووەتەوە، ئەمەش پێوەندیی بە کولتوورێکی دووردرێژی داگیرکاریی و ژێرچەپۆکیی و نەزانیی و ئیفلیجیی بیروبۆچوونمانەوە هەیە.

نموونەیەکی زۆر بەرچاو بهێنینەوە سەبارەت بە وشەی "شەرەف" بەشێوە کۆمەلایەتیی و ریچوەڵە( ریتواڵ- Ritual ) ئایینییەکەی، نەک بە شێوە مۆراڵییەکەی لە نێو گەلی کورددا. شەرەفی زۆربەی هەرە زۆری کورد لەژێر کەڵەگایی رژێمی بەعسدا بوو، بەلام ئەگەر کچێک پێی خوار دابنایە، ئەوە شەرەفکوژ دەکرا لەلایەن کەسوکارییەوە. بە پانتاییەکی بەرینتر، بێشەرەفییمان لەژێر سایەی بەعس و کولتووری بەعسیزمدا قبووڵ بوو بەهەموو وردەکارییەکانییەوە، کەچیی بۆ شۆردنەوەی شەرەفی کوردایەتیی و ئیسلامیی و عەرەبیی و خێڵەکییمان، هەزاران کچ وخوشک و ژنی خۆمان، شەرەفکوژ و ئەنفال کردووەو بەناوی شەرەفەوە( Honour Killing ) بەردەوامیشین لەسەر ئەم شەرەفبەرزیی و کوشتارکارییە .

کەڵلەرەقیی کورد هەر لەسیاسییەکان و پیاوە دەستڕۆیشتووەکان و پلەوپایەدارەکانماندا نییە، لە توێژی رووناکبیران و نووسەرانیشماندا هەیە. نووسەری کورد، ئەگەر سەد لەسەد شتێک بەهەڵە بزانێ لە رێنووسێکدا، لە تێکستێکدا، لە دەستەواژەیەکدا، ئامادەنییە راستی بکاتەوە. گرفتەکە هەر لە تاک تاکی وشەدا نییە، بەڵکو ئەم دەردە گەیشتووەتە سەر تیپەکانیش (پیتەکانیش Letters ) ، لەوە گەڕێ کاکی نووسەر باش دەزانێ کە "عارەب" هەڵەیە و

دروستەکەی "عەرەب"ە، کەچیی هەر بەردەوامە لەسەر نووسینی عارەب و مارەب. ٣٥٠ ملیۆن عەرەب هەیە، بەئەندازەی ژمارەی تووکی هەرچی گیانلەبەر هەیە وشەی عەرەب نووسراوە لەمێژوودا، بە عەرەبییش دەنووسرێ "العرب"، ئیتر ئەم عارەبە! کە لۆکالییەو ستاندەرد نییە ، لەچییەوە هات؟. جا ئەمە مشتێ لەخەروارێکە، ئەگینا بە سەدان گرفتی لەم چەشنەمان هەیە.

دیارە ئەم نووسینە پێیوایە کە ئەو جۆرە بۆچوونانەی لەمەڕ زمانی یەکگرتووی کوردیی هەیە، سەبارەت بەوەی کرمانجیی سەروو یان زاراوەی( هەورامیی)ش گەشە پێبدرێن و بخرێنە بواری نووسین و پەروەردەوە لەسەر حیسابی کرمانجیی ناوەڕاست و خواروو، جگە لە بەرچاوتەنگیی و جۆرێک لەراسیستبوون و شانازییکردن بەلۆکالیزم و ناوچەگەرییەوە نەبێ شتێکی ئەوتۆی لێ هەڵناکرێنرێ. سەرەڕای زۆروبۆریی کرمانجی سەروو ( لەرووی دانیشتوانەوە لە بەشەکانی کوردستاندا)، کرمانجیی ناوەڕاست ( ئەوەی ناسراوە بەسۆرانیی) خاوەنی هێجەمۆنییەکی بەرچاوەو ئەدەبیاتی کوردییش لە چەندین دەیەی رابردوودا گەواهییدەری ئەم راستییەن، دەکرێ ئەم بالادەستیی و ستاندەردە جێگیرە بەهێزبکرێ و زاراوە هەمە جۆرەکانی هەورامیی ، کرمانجیی سەروو، لوڕیی، بادینیی، زازایی و گۆرانیی ....تاد بکرێنە پاڵپشتی نووسین و ستاندەردی کرمانجیی ناوەڕاست و خواروو. دیارە ئەم بڕیارە هەروا ئاسان نییەو ئازایەتیی و بەرچاوڕۆشنییەکی زۆریی دەوێت. مێژووش پێمان دەڵێ، بڕیاری لەم چەشنە ئەستەمە لەکوردی کەللەڕەق بووەشێتەوە.

بەداخەوە ئەو گەرەلاوژەیەی لەناو هەندێ زماندۆست و زمانزان و زمانەوانی کوردییدا هەیە لەسەر گرنگییدان بە کرمانجیی و هەورامیی ....تاد، رێک وەک ئەو دەردەسەریی و بەدبەختیی و چارەڕەشییەی دەیان و سەدان ساڵ لەمەوبەرە، کە میرنشینە کوردییە جۆراوجۆرەکان، هەرکەسەو بەبیانووی بالادەستیی خۆی و ناوچەکەی خۆی و هۆزەکانی خۆیەوە، یان دەبوون بە پیاوی سەفەوییەکان و دژی عوسمانییەکان دەجەنگان، یان بە پێچەوانەوە. ئەمەش یەکێکە لەو فاکتەرە کوشندە مێژووییانەی کە کورد نەیتوانیوە ناسنامەیەکی نەتەوەیی( National Identity ) بۆ خۆی دەستەبەربکات.

سەبارەت بە گرفتی وشەو تیپەکان، زۆر وشە هەیە بەچەندین سپێلی جیاواز دەینووسین. ماوەیەک لە ناوچەکانی کوردستان، بە تایبەتیی ئەو

ناوچانەی کە قەڵەمڕەویی "پدک"ی کەمتر تێدا بوو، هەندێک کەس بە خۆشیی بارزانیی و کرمانجی سەرووەوە، منداڵەکانیان بەو ناوانە ناو دەنا کە "ڤ"ی تێدا بووایە. وای لێهاتبوو هەر بە ڤڤەڤڤی ناوەکانتا بۆت دەردەکەوت ئەم خووی ناو لێنانە لەچییەوە هاتووە.

ئێستا کێشەی تیپەکانی "خ" و "غ" هەمان بالۆرەی ڤڤەڤڤەکەی پیتی "ڤ"ی بۆ لێدەدرێ. هەموو بیانووەکەش ئەوەیە کە زمانی کوردیی لەرەچەڵەکدا پیتی "غ" تێدا نییە. ئەم ئەفەندییانە، ئەم خاتوون و پیاوانەی دەسەڵات، نایەن لەوە بگەن کە لەسەردەمی گڵۆباڵیزەیشندا، ریسواییە ئەمجۆرە بیروبۆچوونانە. دوورە لە راشناڵیزم ( العقلانیە - Rationalism ) و بنەما سەرەکییەکانی دنیای هاوچەرخی زمان. ئینگلیز بەو زمانە بەهێزەیانەوە، هەمیشەو بەردەوام وشە لەزمانەکانی ترەوە وەردەگرن و رۆژانە چەندین وشەی نوێ دەچێتە ئینسۆکلۆپیدیاکانیانەوە.

بۆ نموونە وشەی " ئەلقاعیدە" لەسەرەتادا ویستیان ئەلبەیز " Al-base " بەکاربهێنن، بەلام هەر زوو ئەلکاییدە" Al-Qaeda " جێکەوت بوو، تازە ناشچن دەری بکەن و بڵێن لە عەرەبەوە وەرمانگرتووە. لەم ئاقارەوە، زۆر نووسەری عەرەبی ناسیۆنالیست، زۆر بەمەبەستەوە هەندێ زاراوە لەنووسینەکانیاندا بە زمانی ئینگلیزیی، هەروەک خۆی بە فۆنەتیکی عەرەبیی دەنووسن. بۆ نموونە لەو وشە عەرەبییانەی لە ئینگلیزییدا جێکەوت بوونە، ( Fatwa, Arsenal ,Caliph, Fakir, Sahara, Tariff, Emir, Coffee, Mafia_. Algebra, Giraffe, ) تاد.

ئاخر "ئاغا" و "مەغاویر" و چەندین وشەی تری تورکیی و عەرەبیی و فارسیی هەیە هاتوونەتە نێو زمانی کوردییەوە، ئایا دەکرێ بنووسین ئاخا، یان مەخاویر. ئاخۆ چۆن دەکرێ " غاردان" بکرێ بە خاردان، بناغە بکرێ بە بناخە. بەڕاستیی کەللەپووتیی هەندێ وشکە ناسیۆنالیست و کوردپەروەری نەدان و نەزان و هەندێ نووسەری بێ بەهرەی سەر بەدەسەڵات، زۆر بێتامیان کردووە. تووشی نەخۆشیی لاتینیی بوونەو دەڵێن لالۆ ، کوردەکانی باکوور و کرمانجیی سەروو "غ"یان نییە. خۆشییەکەی لەوەدایە، بەشێک لەم خڕە پیاوە زۆرزانانەی بواری زمانەوانیی خەریکی سازدانی کۆنفرانسن بۆ زمانی کوردیی! دوای ئەوە، خۆ رێنووسی لاتینیی، هێزێکی ئەوەندە ماجیکیی نییە کە بتوانێ هەموو

چەوتیی و چێلییەکی زمانی کوردیی ساغبکاتەوە. یەکێک لە گرفتە سەرەکییەکانی لاتینیی، نەگونجاندنییەتی لەگەڵ فۆنەتیکدا. بۆ نموونە کاتێ دەڵێین "بەرژەوەندیی" لاتینیی گرفتی ئەم دوو "ی"ە چارەسەر ناکات، بەو شێوە کلاسیکییەی کە ئێستا هەیە.

## وشەی پڕ بەپێست و دالاگالی.

ئێمە هەریەکە لە "ئەرشیف" و "دۆسییە" بەکاردەهێنین بۆ "Archive" و "Dossier". باشە! گرنگتر و جوانتر نییە کاتێ وشەی ئارکایڤ (Archive) بەکاردەهێنین وەک خۆی نزیک لە فۆنەتیکە ئینگلیزییەکەوە بەکاری بهێنین. یان چ پێویست دەکات بگەڕێینەوە بۆ وشەی عەرەبیی لە چەشنی مەلەف، بەڵام دۆسییە، مەبەست لە (اضبارة) ی عەرەبییەو، کەمتر بەلای واتای ئارکایڤدا دەچێت. گرفتەکە لەوەدایە زۆرکەس پێیانوایە خوێندنەوەی دروستی ئارکایڤی ئینگلیزیی ئەرشیفە، سەدجار ئەرشیف بڵێی کەسێکی ئینگلیز تێناگات ئەگەر لە ئەکسێنتی زمانێکی ئەورووپاییدا نەیبیستبێ. جا ئەوە فشەیە کە ئارکایڤ بەکاربهێنرێ، یان ئەوەی واتای ئارکایڤ نەزانین و هەمیشەش ئەرشیفمان لەسەر زمان بێت و ئینگلیزیش بەهەزار شەڕەشەق لەکاتی ئاخافتندا لیمان تێ بگات.

لەکاتی بەکارهێنانی وشەی بیانیی لەزمانی کوردییدا، زۆر زۆر پێویستە فۆنەتیکی وشەکە ئەوەندەی دەکرێ وەک خۆی بنووسرێتەوە. هەر وشەیەک بەفۆنەتیکێکی سەقەت بپەسترێتە نێو زمانی کوردییەوە، زیانەکانی لە سوودەکانی زۆرتر دەبێ. ئەگەر هەندێ نموونە وەربگرین. ئۆڵتێرنەتیڤ (ئۆڵتێنەتیڤ Alternative) بە هەڵە بە ئاڵتەرناتیڤ دەینووسین. ئەمە وەک ئەوە وایە بە ئۆڵسۆ (Also) بڵێی ئالسۆ. سێکیولاریزم (Secularism) بەهەڵەیەکی

شاخدار بە سکۆلاریزم دەینووسین ، هیچ شتێک نییە ناوی سکۆلاریزم بێت، بەڵکو سکۆلاریتیی هەیە. دوای ئەوە وشەی سکۆلار ( Scholar ) لە کوێ و سێکیولەر یان سێکیولار( Secular ) لەکوێ.

پێشتر لەشوێنی تردا نووسیومە، هەندێ وشە جێکەوت بوونە لەزمانی کوردیداو رەگی ئەو جێکەوتبوونەش دەگەڕێتەوە بۆ پێوەندیی نێوان زمانی فارسیی و فڕانسیی. لەو وشانەی بەم کەناڵەدا هاتوونەتە نێو زمانی کوردییەوە، ئۆپۆزیسیۆن و ناسیۆنالیزم و کولتوور( لە بنەچەی لاتینییەوە- Cultura) .... تاد. ئەستەمە تازە بەتازە بنووسرێ ئۆپۆزیشن و ناشنالیزم، یان کەلچەر . بەلام تێناگەم، وشەی ترادیسیۆنی فڕانسیی ( tradicion ) یان (tradizione ) ئیتالیی بۆچیی لەبری ترادیشن (Tradition ) بەکاردەبرێ؟. یان بۆ لەبری سەتایەر یان ساتایەر، وشەی ساتیری لاتینیی بەکاربهێنرێ؟. بەلام ئەگەر مەسەلە ئیستیتیکی زمانی فڕانسیی بێت، ئەوە شتێکی ترە.

گرووپی رەهەند و ئەو نووسەرانەی سەر بەو رەوتە تیۆرییە بوون، کۆمەڵێ وشەی بیانییان لەرێی ئەدەبیاتی فارسییەوە هێنایە نێو زمانی کوردییەوە کە خەریکە تەواو جێگیر دەبن. بەلام زۆرم پێ سەیرە، کاتێ وشەی ستراکتۆریان هێناوە، بۆچیی هاوتاکەی کە فەنکشنە ( Function ) ە بە عەرەبیی دایانناوە. یان دروستتر بڵێین لە فارسییەکی تەعریبکراوەوە "وەزیفە"یان داناوە . لەراستییدا، هەردوو وشەی ستراکتۆرو فەنکشن دووانەیەکن و لە زمان و داتاکاندا پێکەوە بەکاردەهێنرێن. باشە حیکمەت لەمەدا چییە ؟ یەکێکیان بەفڕانسیی بهێنرێتە ناو کوردییەوەو، ئەویتریشیان بەفارسییەکی تەعریبکراوەوە!

لەنێو وردەکاریی ستراکتۆری زماندا، هەمیشە نووسەر دەرگیری تێکهەڵکێشانی وشەو رستە بە جوانترین فۆرم، دەبێت. بەخشینی واتایەکی وردو سەرنجڕاکێش کە خوێنەری ورد و دانسقە ئارەزووی درێژەدان بە تێگەیشتن و خوێندنەوەی لێ هەڵبکڕێنێ. ( واتاکانی رستەو وشە لەزماندا ئەو پارچە کوودانەیە " Code " کە رستەکان لەگەڵ خۆیاندا هەڵیدەگرن و خوێنەر لە خوێندنەوەدا هەڵیاندێنێت)١. ناشێت کۆنتێکست و زاراوەکان جۆرێک بن لە

Downes, 1998, p. 323 )[1] (

سەر زار ، بەڵام بە تۆبزیی جۆرێکیتر چەوتنووس بکرێن. بەواتایەکی تر ، ئەرکی نووسەرە هارمۆنییەکی تەواو گشتگیر بدات بەنووسینەکەی تا ئارەزووی خوێنەری وریا نەکوژێ.

ئەم نووسینە لەو بڕوایەدایە جگە لەو وشانەی جێگیر بوونەو قورسایی خۆیان سەپاندووە، هەر وشەیەکی تری بیانیی، کاتێ دەهێنرێتە نێو زمانی کوردییەوە، هەوڵبدرێت راستەوخۆ لە فۆنەتیکە ئینگلیزییەکەوە نزیک بێت و تەواوی زمانەکانی تر فەرامۆش بکرێن و زمانەکەمان بەدەردی چێشتی مجێور نەچێت. لەم رێگەیەوە هەرچیی زۆرترە لە هێجەمۆنی زمانی عەرەبیی بەسەر زمانی کوردییدا دووردەکەوینەوەو لە داهاتووشدا، زمانەکەمان لە زمانە ئەوروپاییەکانەوە نزیکتر دەبێتەوەو راستەوخۆ دەکەوینە ژێر کولتوور و ئەدەبیاتی ئەوانەوە. هاوکات ئەگەر نووسینی سکریپتی کوردیی هەرکاتێک بۆ لاتینی گۆڕدرا ، ئەوە بەڕاستیی بۆ زمانی کوردیی و نەوەی داهاتوو، هەروەها بۆ فێربوونی زمانە رۆژئاواییەکان بەکەمترین کات و بە سانایی، قازانجێکی زۆری دەبێت.

گۆڕینی سکریپتی کوردیی لە ئارامییەوە بۆ تورکیی-لاتینیی، لەهەنووکەدا زیانی زۆرتر دەبێ، تا زمانی ستاندەردی کوردیی لەکوردستانی باشوورەوە ساغنەکرێتەوە، ناکرێ سکریپت گۆڕین لەئارادا بێ. لەهەموویشی گرنگتر، ئەم سکریپتە ئارامییە-عەرەبییەی هەمانە، زۆر جوانتر و گونجاوترە بۆ زمانی کوردیی تا بە سکریپتی لاتینیی-تورکیی دەگات. سکریپت گۆڕین دەبێ کاری پسپۆرانی پەروەردە و کولتووریی بێ، هەڵەیەکی کوشندەیە، لاسایی ئەوانە بکرێتەوە کە گیان و ئاوەزی زمانی کوردییان دەرهێنا، کاتێک بەلاساییکردنەوە، سکریپتی تورکیی-لاتینییان بەسەر بەشێکی نەتەوەی کورددا ساغکردەوە.

هاوکات کولتوور و رۆشنبیریی عەرەب زۆر زیانی پێگەیاندووین، زۆر بەدڵنیاییەوە دەڵێم ئەو نووسەرو رۆشنبیرە کوردانەی لە رۆشنبیریی فارسییەوە دەرگای خوێندنەوەیان لەسەر خۆیان کردووەتەوە، لەرووی چەندییەتیی و چۆنییەتییەوە زۆر شارەزاترن لەو نووسەرو رۆشنبیرانەی کە لەرێی زمانی عەرەبییەوە دەخوێننەوە. ئەمەش ئەو راستییەمان بۆ دەردەخات، رۆشنبیریی فارسیی و ئەدەبی ئێرانیی زۆر زۆر لە ئەدەب و رۆشنبیریی عەرەبیی گەشەکردووترن . ئەم تێکهەڵکێشە کولتوورییەی کوردستانی باشوور

لەگەڵ دنیای عەرەبیی و کولتووری عەرەبییدا زۆر تراژیدیای بەدیاریی بۆهێناوین. ئەنفال یەکێکە لەو تراژیدیایانەی کە سەدان ساڵە کولتووری عەرەب و فەندەمێنتالیزمی ئیسلامیی لەئاست کورددا پێوەی ئاوسە.

فەرموون ئەو هەموو فەندەمێنتالیستە ئایینیی و ڕۆشنبیرە فەناتیک ( Fanatic ) و پیاوە خێڵەکییانەی کوردستانی باشوور ببینن. کۆکتێلی کولتووری عەرەبیی و ئایینیی وای لە عەلمانیی و کۆمۆنیست و بێباوەڕ ( ئەیسیەست – atheist )ەکانیش کردووە کە دەیان ساڵە لەرۆژئاوا دەژین، کەم و زۆر لەژێر کارتێکردنی کولتووری ئایینییدا بن. نموونەیەکی سادەی ژیانی رۆژانە، هێشتا بەشێک لەم پێرە، نەخۆیان گۆشتی بەراز دەخۆن، نە منداڵەکانیشیان، بە بیانووی ئەوەی بۆنی دێت. بۆچیی نا؟ یەعە، قخەیە!!. لەکاتێکدا گۆشتی بەراز یەکێکە لەنایابترین و بەچێژترین گۆشتی ئاژەڵەکان. تەنانەت لە کۆمۆنیستی زۆر رادیکاڵ و توندرۆیان بیستووە بەمنداڵەکەی گوتووە حەرامە!!! گۆشتی بەراز نابێ بخۆی!، ئەمە جگە لە دەبڵستاندەردی رۆژهەڵاتییەک ، تێکەڵە لیقاوێکی کولتووری خێڵەکیی عەرەب و ئایینییە لەنێو خوێن و گۆشت و هەست و بیرماندا چەکەرەی کردووە.

ئەوە نییە کە چەپ و عەلمانییەکانمان وەردەگەڕێن، دەبنە دێو و درنج و سەرۆکی کەتیبەکانی ئەلقاعیدە لەکوردستاندا!. تەنانەت ئەم دابڕان و تێکهەڵکێشییە لەگەڵ نەتەوەو کولتوورە جیاوازەکاندا بەئاشکراییی لەپارچەکانی کوردستاندا دەردەکەوێ. سەرەڕای هەموو دواکەوتوویییەک لە کوردستانی رۆژهەڵات، بەڵام لەرووی کولتووری تۆڵە ئەستاندنەوەو بەخشین و گیانی یارمەتیی و ئازادیی ژن و یەکترقبووڵکردن و هاوسەرگیریی و ..... تاد زۆر زۆر لە کوردستانی باشوور پێشکەوتووترن. بۆچیی، چونکە لە رووی مێژووییەوە کەمتر لەئێمە وابەستەی کولتووری عەرەبیی و خێڵەکیی و توندڕۆیی مەزهەبیی بوونە.

وشەی کولتوور، بە زۆر شێوەی سەیروسەمەرە لە نووسینی نووسەرانی کورددا دەنووسرێ. بۆ نموونە بە ( کەلتوور، کەلتور،کولتور،کلتور، کلتوور.....تاد ) دەنووسرێ. ئەمە پاشاگاردانیی و سەرەرۆییە. کەرکوک ( Kirkuk ) زۆرکەس بە ( کەرکووک ) واتە بەدوو "و" دەینووسن. کەمێک وردبەرەوە! ئەوانەی بە دوو "و" کەرکوک دەنووسن، زۆربەیان ئەوانەن کە بە چەپە دێرینەکان ناسراون و ئێستا دەستیان داوەتە پیشەسازیی نووسینی کوردیی لە عەرشی دەسەلاتدا. دیارە لەم نێوەندەدا زۆر نووسەری تریش کەوتوونەتە داوی ئەم تاکتیک و فێلەی پیاوانی دەسەلاتەوە. نووسینی کەرکوک بە کەرکووک، وەک ئەوە وایە کوردستان بە کووردستان بنووسرێ. لەکاتێکدا تا نێوەراستی سەدەی بیستەمیش کوردستان لە زمانی ئینگلیزییدا لەبری ( کێردستان یان کیدستان Kurdistan ) بە کووردستان ( Koordistan ) دەنووسرا. بەلام دواتر، وردە وردە وشەی (Kurdistan ) بەیەکجاریی جێگەی (Koordistan ) ی گرتەوە، هۆیە سەرەکییەکەیشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، رێنووسوەرگرتن لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی تر دەبێت پێڕۆی فۆنەتیکی زمانە لێوەرگیراوەکە بکات. یەکێ لەو کتێبە گرنگانەی لەسەر بەشێک لە مێژووی کوردستان نووسراوە کتێبەکەی (Claudius James Rich )[1] کە لە سەردێڕەکەیەوە کوردستانی ( Koordistan ) بەکارهێناوە. نووسینی کەرکوک بە دوو "و" بۆچیی! لەکاتێکدا فۆنەتیکی دوو "و"ی ناکەوێتە سەر زمان و دەنگەژێی قوڕگ، مەگەر بە ئارەزوو ئەم دەنگە درێژ بکرێتەوە.

کەرکوکی بێناز، لە نووسینیشدا بازرگانیی سیاسیی پێوە دەکرێ. سەیری میدیای پدک و هەموو میدیاکانی ژێر قەڵەمڕەوییەکەی بکەن، بە چەپە دێرینە

[1]- Narrative of a Residence in Koordistan, and on the Site of Ancient Nineveh: With journal of a voyage down the Tigris to Bagdad and an account of a visit ... Persepolis. Edited by his widow. Volume 1

کاریکتەر١ ( نەک کاراکتەر) شکاوەکانی پەنای دەسەلاتیشەوە، هەموویان کەرکووک دەنووسن، بەپێچەوانەشەوە لە عەرشی دەسەلاتی هەرێمی سەوزو لانکەی سۆشیال دیموکراتییدا! ، کەرکوک دەنووسن. خوێنەر ئەگەر کەمێک وردەوە بێت، هەر لە بەکارهێنانی هەندێ وشەدا بۆی دەردەکەوێ ، کابرای نووسەر، یان خاتوونی نووسەر سەر بە پارتیی و لەژێر کارتێکردنی فەلسەفەی بارزانییدایە یان موریدی هەرێمی سەوزە، یاخود بێلایەنە. ئیتر ئەم دەبڵ کوردایەتییە هەر لە ناوی کەرکوکدا نییە ، ئەوە نییە حکومەت کە وشەیەکی عەرەبییە، دەیکەن بە حکوومەت، سەدام بە سەددام ، مەسعود بە مەسعوود ( مسعودی عەرەبیی دەکەن بە مەسعوودی کوردیی ) ،تەبەریی بەتتەبەریی و هەروەها..... دیارە ئەمانە پێیانوایە ئەگەر کەرکوک بە گێروگەواریی بە کەرکووک بنووسرێ، برگەی ١٤٠ی دەستوری عێراق لەکاتی بەسەرچووی خۆیدا جێبەجێ دەکرێ؟

زۆر خۆشە مرۆڤ هەڵە بکات و ددان بەهەڵەکەی خۆیدا بنێ، نووسەرێ، رۆشنبیرێ ئامادە نەبێت رێنووسێکی چەوتی خۆی راست بکاتەوە و چاوقایمیی بکات و سەری بەکەرتە شاخدا بدات و سووربێت لەسەر هەڵەکانی، ئومێدی ئەوەی چۆن لێدەکرێ کە گفتوگۆیەکی لەشساغت لەگەڵدا بکات. لای خۆمەوە هەر کەزانیتم ریفراندۆم هەڵەیە، یەکسەر پەنجەی خۆم گەزی و گوتم مەرج بێت لەمەودوا وەک خۆی رێفەرێندەم ( Referendum ) بنووسم. لەراستییدا ، جێنۆسایدیش هەڵەیە، دەبێ بنووسرێ جەنەساید، یان جێنەساید. بەلام لەبەر ئەوەی کولتوورێکی دووردوودرێژی لای کەم هەژدەساڵەمان لەگەڵیدا هەیەو ئەوەندەشمان بەکارهێناوە، دەکرێ بڵێین ، جینۆساید وەک سیمبۆلێک بۆ ئەنفال، دەستکاریی نەکرێ، بەتایبەت لە سکریپتی ئینگلیزییەکەوە ( Genocide) نزیکە. ئێمە ناوی هەڵەی ئەمریکامان لە عەرەبییەوە وەرگرتووە، نەک لە ئینگلیزییەکەوە. ئایا رەوایە، میسرییەک، عەرەبێکی نیمچە دوورگەی عەرەب باشتر فۆنەتیکی ئەمێریکا ( یان ئەمەریکا) دەربکات لە ئەمێریکییەک؟ . ئەوەتا ئێستا هەندێ نووسەری عەرەب خۆیان ( امیریکا) دەنووسن لە بری (

---

1) Character ( کارێکتەر

امریکا)، کەچیی نووسەری کورد هەر بەکۆپییە هەڵەکە، لەجیاتی ئەمیریکا بنووسی ، ئەمریکا دەنووسێ .

هەرگیز تێناگەم، پاش حەڤدە هەژدە ساڵ دوورکەوتنەوە لە ئەدەبیاتی عەرەبیی، بۆچیی هیچ نووسەرێ هەوڵنادات هەندێ وشەی چەوتی وەرگیراو لەزمانی عەرەبییەوە راست بکاتەوە. ڤایتەمن یان "ڤایتەمین" ( Vitamin ) لە گەڵ ڤیتامیندا کەی نزیکایەتییان هەیە؟ بەڵام چونکە ئێمە لەعەرەب و زانستی عەرەبەوە وەرمانگرتووە، ئیتر ئاسمان دەڕووخێت ئەگەر راستی بکەینەوە.

ئۆنری ( Henry ) هێرشبەری کۆنی یانەی ئارسەناڵی ئینگلیزیی و هەڵبژاردەی نیشتمانیی فرانس ، هەموو دنیا بە "ئۆنری" ناوەکەی دەخوێنێتەوەو بانگ دەکرێ. بەڵام تا ئێستاش میدیای کوردیی، بە هێنری دەینووسێت و دەیخوێنێتەوە. بەداخەوە رۆشنبیر و نووسەری کوردی موتوربەکراو بە کولتوور و رۆشنبیریی عەرەب، لەژێر ئەم کارتێکە نێگەتیڤانەدا نەهاتووەتە دەر. بەراوردێکی سەرپێی لەنێوان دوو ئایکۆنی جیاوازو دوو کێڵگەی جیاوازدا ( وەرزشی فووتبۆڵ و سیاسەت ). ئەگەر هەر خوێندەوارێکی ئەورووپایی ئەم دوو ناوەی بدەیتێ بەسەریەکەوە، بەم شێوەیە دەیان خوێنێتەوە:

١- هێنری کیسینجەر ( Henry Kissinger )، بە فۆنەتیکی ئیگلیزیی دەیخوێنێتەوە

٢-تیێری ئۆنری ( Thierry Henry )، بە فۆنەتیکی فرانسیی دەیخوێنێتەوە( بەتایبەت" ئۆنری"یەکە).

لەکاتێکدا هەردوو ( Henry ) بە یەکجۆر رێنووس دەنووسرێن.

سەرەڕای ئەوەی زۆر وشەی عەرەبیی جێگەی خۆیان بەتەواوەتیی کردووەتەوە لە زمانەکانی جیهاندا ، بەتایبەتییش لەزمانە دراوسێکانی نەتەوەی عەرەبدا. بەڵام هەرئێستا نەوەیەکی تەواومان هەیە، بەهەموو پێوەرێک لە رۆشنبیریی و کولتوورو ئەدەبیاتی عەرەبیی دوورکەوتووەتەوە، چ پێویست دەکات لەئێستادا و لەمەودوا وشەی عەرەبیی بەکاربهێنرێ، بەراستیی زۆر سەیرە! هەندێ نووسەر ئێستاش بە پێوەر و هەوای حەفتاکانی سەدەی رابردوو دەنووسن. لەکاتێکدا وێڕای ئەوەی زۆربەی ئەو وشانە لەکوردییدا

هەن، ئەگەر هەر بۆ بەهێزکردنی رووبەری تێگەیشتن و شیکردنەوەی باشتری مەبەستە! بۆ وشەی ئینگلیزیی بەکار ناهێنری؟.

ئێستا ئیتر زمانی ئینگلیزیی بووەتە سەرچاوەی زۆربەی زانیارییەکان و لەسەر تاکی کوردیش پێویستە ئەم زمانە فێربێت وەک پێداویستییەکی سەرەکیی و ژیاریی بۆ گونجاندن و هەڵکردن لەگەڵ سەردەمدا. گرنگ نییە لە دەربەندیخان ، بۆکان ، ماردین و زاخۆ دەژیت، یان لە وڵاتێکی رۆژئاوایی دەژیت،گرنگە و پێویستە زمانی ئینگلیزیی فێربیت. بەکارهێنانی وشەی ئینگلیزیی لە زمانی کوردییدا لەبری عەرەبیی و فارسیی و تورکیی، هەنگاوێکی زۆر پێویستەو لە داهاتوویەکی نزیکیشدا کاردەکاتە سەر ئاسانکاریی فێربوونی زمانە ئەوروپاییەکان بەگشتیی و ئینگلیزیی بەتایبەتیی بۆ هەر تاکێک خولیای فێربوونی زمانە بیانییەکانی هەبێت.

## ئەنجامگیری :

یەکێک لەو بیریارە پڕ بەهرانەی مێژوو شانازیی بەشاکارەکانییەوە دەکات، ئەنتۆنیۆ گرامشی( Antonio Gramsci ) یە. ئەم نووسەرە، سەرەڕای بیری سیاسیی و ئایدیۆلۆژیی تایبەت بەخۆی لەروانگەی مارکسیزمەوە، دەکرێ بەیەکێک لەو کەسە دەگمەنانە دابنرێ کە زمانی نووسینەکانی تایبەتمەندییەکی زۆر بلندو جوانی پێوەدیارە لە نێوان سیاسەت و کولتووردا، دەزگایەکی گەورەی تیۆرییش ( International Gramsci Society ) بەناوییە نراوە. گرامشی کە بیردۆزی گۆڕینی ژیانی کۆمەڵایەتی دارشتەوە، نەهات دووبارە، چینەی نووسینی مارکسیستەکانی پێش خۆی بکات، بەڵکو بە تێڕوانینێکی وردەوە هێجەمۆنی فاشیزمی شیتاڵ شیتاڵ دەکرد لەلایەک و لەلایەکی تریشەوە، هەر لەناو زیندانە دوورو درێژەکەیدا، گرنگی بە زمانی پرسیار ( Language question )[1] دەدا و لەرێی زمانەوە شەڕی هێجەمۆنی دەسەڵات و کولتووری زاڵی چینە باڵادەستەکانی دەکرد. کارەکانی ئەو و زمانی نووسینەکانی بەئەندازەیەک لە روانگەی فەلسەفییەوە قووڵ و پڕلەڕامان بوو، چۆمسکی تا رادەیەکی زۆر پێی سەرسامەو پێیوایە کەس بەئەندازەی گرامشی ئێستێتیکانە زمانی لەنووسینی سیاسەت و کولتووردا بەکار نەهێناوە. جوانووسییەکی بەکارهێنا کە ئێستا لەکێلگەی نووسیندا، بە زانستە بنچینەییەکانی وانە وتنەوەو پەروەردە (پێدەگۆجی - Pedagogy ) ئەژمارد دەکرێ . بەکورتیی، ئەگەر لەسەر سەرەکییترین کۆنسێپتی گرامشی کە

---

[1] Gramsci, 1985, pp. 164-95

هێجەمۆنییە هەڵویستە بکرێ، بەبێ زانیاریی و تێگەیشتن لە زمانی کەڵەگەتی نووسینەکانی گرامشی، ستەمێکی گەورەی بەرامبەر دەکرێ.

زمان کۆمەڵێ کەرەستەی جۆراوجۆرە و بۆ مەبەستی هەمەجۆرو تایپۆلۆجی "Typology" جیاواز جیاواز بەکاردێت کاتێ نووسەرێک دەیەوێ دەقێکی نەمەیی لە بیر و بۆچوونییەوە بکاتە نووسین، یەکەمین کەرەسەیەک پێویستی بێت لەم پیشەسازییەداو بەکاری بهێنێ، پیشەسازیی رستەو وشە و دروستکردنی کۆمەڵی داتا و واتای جیاواز جیاوازە. نووسین ئەندازیارییە، ئەگەر هەر نووسەرێک نەتوانێ ستایڵ و دیزاینی نووسینەکەی جوانپۆش بکات و بەقشتیی و رێکوپێکیی بەرهەمی نەهێنێ، گومانی تێدا نییە هەرچەند بنووسێ لەخۆماندووکردن و کات بەفیرۆدانی خۆی بەولاوە شتێک نە بەخۆی نەبەخوێنەریش دەگەیەنێ. نووسەری باش دەبێ بزانێ کەرەسەکانی زمان بە چ وردەکارییەکەوە بەکاردەهێنێ؟ هاوکات بشزانێ ستراکتۆر و فەنکشنەکان و داتاکانی زمانی نووسینەکەی لە چ کێڵگەیەکدا هەڵدەسوڕێنێ و رووی لەکوێیە؟

وەک گردکردنەوەی ( Gathering ) کۆمەڵی چەمکی بنەڕەتیی لەم کورتە باسەدا، دەکرێ هەندێ شێوازی فۆنەتیک بە قورسیی وەرنەگیردرێ. بۆ نموونە، کورد لەنووسیندا هەریەکە لە پارلەمان و پەرلەمان ، ئاکادیمسیت و ئەکادیمست، ساتایەر و سەتایەر ( دروستتر سەتایە...چونکە "ر"ەکە زمان نایگرێ ) .... تاد بەکار دەبات. ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە جیاوازییەکی زۆر لەنێوان ئەم دوو دەنگەدا " ا" و "ە" لەزمانی کوردییدا، نییە. بەڵام ئەم ریسە بۆ عارەبەکە نابێ. دەربڕین و نووسینی عارەب باکگراوندێکی شۆڤینیستیانەی لەپشتەوەیە. کە بەدڵنیاییەوە بۆ ئازادیی بەگشتیی و دۆکترینی سەربەخۆیی گەلی کورد زیانی لە سوود زۆرترە. ئەمە بۆچۆنی پانعەرەبیی میدیاکانی بەعس دەهێنێتەوە یاد کە بە فارسەکانیان دەگوت "الفرس المجوس" ، یان کولتووری کۆنی نیمچە دوورگەی عەرەبە کە گەلانی "ناعەرەب"ی بە عەجەم ناوزەد دەکرد. وێڕای ئەمانە، زۆر بناغەیەکی تۆکمەیە، کاتێ وشەی ئینگلیزیی دەهێنرێتە نێو کوردییەوە، هەوڵبدرێت، لای کەم لە فۆنەتیک و نووسیندا وەک خۆی دەربهێندرێتەوە. ئەمە قازانجی بۆ زمانەکەشمان و بۆ نەوەکانی داهاتووش دەبێ.

لە پێوەند بە ئالوودەبوونی لاتینییەوە، ئەو سەردەمە تێپەڕی کرد تازە بەتازە بچین بگەڕێینەوە بۆ تێرمۆنۆلۆجییە کۆنەکانی گریک و رۆمانی کۆن. جاریَ پێش هەر شتیَ زمانی لاتینیی کاری پێناکریَ ، راستە زۆربەی زۆری زمانەکان لە لاتینییەوە بناغەیان رۆنراوە، بەلاّم کات و سات بۆ دانانی ئەم بناغەیە بەسەرچووە. بە شێوەیەکی رۆشنتر، دەکریَ ئێمە لەیەک زمانی مۆدێرن و هاوچەرخەوە کە ئەویش زمانی ئینگلیزییە هەوڵی ئاوێتەکردنی تێرمۆنۆلۆجییەکان ( Terminologies ) بدەین.

بۆ نموونە هیچ پێویست ناکات تازە بەتازە بچین بگەڕێینەوە بۆ لاتینیبوونی ( ئێستێتیک یان ئێستەتیک – Aesthetic - Esthetic )١ و بچینەوە سەر بنجوبناوانی لاتینیی نویَ ( aesth_ticus ) یان بنجوبناوانی گریکییەکەی ( aisth_tikos ). ئەم زۆر ئاوڕ لەخۆدانەوەیەو زۆر لقوپۆپ دروستکردنە، وامان لێدەکات تووشی هەڵەی زۆرتر ببین، هەروەک هەندیَ نووسەری کورد بەئارەزووی خۆیان " ستاتیکا" و ستاتیک " و "ئیستاتیکا" ......تاد دەنووسن. بەدەر لەوەی ستاتیک لەزمانی ئینگلیزییدا بەواتای خشەخش یاخود بەواتای نەگۆڕ و راوەستاو دێت. هەندێک ستاتیستیک دەنووسن کە بەواتای ئامار دێت. بەدڵنیاییەوە زۆرێک بە لاساییکردنەوەی هەندیَ نووسەرەوە دەینووسیَ و ئەوەندەی تر سەقەتی دەکەن. هەرچەند ئێمە دەنگی (th)مان نییە و "س" دانراوە لەبری، کە ئەمەش بۆخۆی لە گیانی فۆنەتیکەکەی دەکوژیَ. کەواتە زمانی ئینگلیزیی ، وەک پانوپۆڕترین و پڕخەزێنەترین زمانی دنیا، بکەین بە سەرچاوەی سەرەکیی وشە بیانییەکان و سەریەشەی زمانەکانی تر لەکوڵ خۆمان بکەینەوە.

سەبارەت بە فۆنەتیکی وشەو ناوە ئینگلیزییەکان لەم نووسینەدا، هەوڵدراوە پشتئەستوور بە دوو فەرهەنگی ناودار لەئاستی نێودەوڵەتییدا، فۆنتەکان دابڕێژرێنەوەو بە کوردیی بنووسرێنەوە. ئەو دوو فەرهەنگەش ئۆکسفۆرد (ئۆکسفۆرد) و ماکوارییە " Oxford and Macquarie dictionaries ". ئەوەش لەبەرچاو بگیردریَ کە ئێستا هێجەمۆنیی ئەکسێنت و ئینگلیزیی

---

[1] تەنانەت ( ئێسێتیک)یش هەر دروستە دەکریَ بشنووسریَ ئێستەتیک، یان ئێستەتیک

ئەمیریکایی بەسەر هەموو دنیادا زالەو تەنانەت گرفتی بۆ نێوەندە ئەکادیمییەکانیش دروستکردووە.

بۆ نموونە هەندی وشە وەربگیردرێن، ( advertisement ) بە بریتانیی و ئینگلیزیی ولاتانی کۆمۆنوێلس ( commonwealth ) ، بە ˚ ئەدڤێتسمێنت - ئەدڤیسمێنت ˚ دەخوێنرێتەوە. کەچیی بە ئەمیریکایی بە˚ ئەدڤەتایزمێنت˚ دەخوێنرێتەوە. وشەی ( issue ) ، بەئەمیریکایی زۆرتر بە ˚ئیشیو˚ دەخوێنردێتەوە، کەچیی لە بریتانیا و ولاتانی کۆمۆنوێلسدا، ˚ئیسیو˚ و ˚ئیشیو˚ هەردووکیان بەکاردەهێنرێن. ئەوە جگە لە رێنووس جیاوازبوونی دەیان وشەی وەک ˚ globalization- gloablisation , favor- favour, center- centre ˚، کار گەیشتووە بەشوێنێک خەریکە لەژێر گوشاری بالادەستیی ئەکسێنتی ئەمێریکاییدا ئەکسێنتەکانی تر کاڵ ببنەوەو رێنووسی ئینگلیزیی ئەمیریکایی تەواو زاڵ ببێت .

لەکۆتاییدا، پێویستە ئەوە بگوترێ، ئەم باسەش لەهەڵەی زمانەوانیی بەدەر نییە. هۆکاری سەرەکییش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی سەرەڕای ئەوەی زمانی کوردیی ، ئەکسێنتی زاڵ تێیدا کرمانجیی ناوەڕاست و خوارووە، بەلام ستاندەردێکی باوەڕپێکراوی سەد لەسەدی نییە. ئینستیتیوتێکی زمانەوانیی سەربەخۆ و خاوەن کرێدتمان نییە، کە رێساکانی زمانەوانیمان بۆ دەستنیشان بکات. بەلام لەگەڵ ئەوانەشدا، دەتوانرێ بگوترێ بەپێی پێویست هەوڵدراوە کەمترین هەڵەی دارشتنی تێدا بمێنێ.

# References:

1. Chomsky, N ( 1995) *The Minimalist Program.* Cambridge: MIT Press.

2. DOWNES, W. (1998) *Language and Society,* Cambridge, Cambridge University Press.

3. Gramsci, A (1985) Selections from Cultural Writings, eds D Forgacs and G Nowell-Smith. London: Lawrence and Wishart

4. MEDINA, J. (2005) *Language KEY CONCEPTS IN PHILOSOPHY* LONDON, NEW YORK, Continuum.

5. SMITH, N. (2004) *Chomsky Ideas and Ideals,* United Kingdom, Cambridge University Press.